خەڵکیان هەڵڕشت.. ئەو کاتەی قافڵەی سەیارەکانی ئێمەیش بەڕێ کەوت و لە تۆبزاوا هێنامانیانە دەرەوە لەدەرەوەی تۆبزاوایش دنیایەك سەیارە ئەتووت مێگلەلەمەڕە وەستابوون و گشتی پڕی خەڵك بوو چاوەڕێیان بوو بچنە ناو مەعەسکەرەکەی تۆبزاواوە.. نازانم ئەم هەموو خەڵکەی لەکوێوە ئەهاوردو ئەم هەموو سەیارەیشیان لەکوێ بوو..

کەوتینە ڕێ گەرچی ڕۆژ بوو سەیارەکانیش جامەکانی تاریك ئەبوو ئەوانەی کەئێمەیان گواستەوە، هەر ڕۆیی و ئێمەیش نەمانئەزانی بۆ کوێ ئەچین.. شارەزای ئەو ناوە نەبووین و هەرگیز نەمان بینی بوو.. بەلأم ئەو موجەمەع و شارانەی کەئەمان دایە لاتەنیشتی‌دا هەمووی هەر عەرەب بوون و خاکەکەیش هەتا زیاتر ئەچووین زۆرتر بەرەو بیابان ئەچووین ناوچەکە وشکتر بوو.. دڵمان زیاتر تەنگ ئەبوو.. بەرەو گەرماکەی نیوەڕۆیش ئەچوو هەر تاساین لەناو سەیارەدا پیشاین لەگەرما خنکاین لەتینووا..

ناو سەیارەکەیش ئەو دوو عەسکەرەی بەدیارمانەوە بوون زۆر زاڵم بوون لەتینووا هاوارمان ئەکردو لێیان ئەپاڕاینەوە بۆقومێ ئاو، خۆیان لێمان تووڕە ئەکردو جنوێیان پێمان ئەدا..

من لەسەعاتم نازانی و نەم ئەزانی چەند سەعاتە بەڕێوەین.. تەنها ئەوەندەم هەست پێ‌دەکرد تالە تۆبزاوا لای ناموسەکانمان زیاتر دوور دەکەوتینەوە زیاتر دڵم تەنگ دەبوو، هەستم ئەکرد دڵم بەستراوەتە تۆبزاواوەو تازیاتر سەیارەکان ڕێگە بڕن شریتی نێوان جەرگی من و تۆبزاوا توندتر دەبێت و زیاتر ئازارم ئەدات و رام ئەکێشێ.. تازۆرتر لەناو سەیارەکاندا بووین زۆرتر تینووم ئەبوو قوڕگم وشکترو هەناسەم سوار تر.. لەناو سەیارەکەدا هەبوو سەعاتی دەستی پێبوو کەگەیشتینە شوێنێ لەناو بیابانێکداو تەنها قەلأیەکی گەورەی لێبوو لەوێ وتیان هەشت سەعاتە بەبێ وەستان لە تۆبزاواوە بەڕێوەین.. ئەو قەلأیەی ئێمەی لێبووین هەشت سەعاتە ڕێ بەسەیارە لە تۆبزاواوە دور بوو بەرەو ناو عارەبستان.. کەگەیانمانیانە بەر دەمی ئەو قەلأیە سەیارەکان راوەستان.. قەلأکە دووقات

بوو دیوارەکەی زۆر بەرز بوو هەمووی بەبەردی سپی دروست کرابوو.. ئیتر لەو قەڵایە زیاتر تاچاو بڕکات هیچ دیارنەبوو هەمووی هەر سەحرابوو، لم بوو قەدەرێ زۆر لەبەردەم دەرگای قەڵاکە هێشتمانیانەوە..

کەبردمانیانە ناو قەڵاکەوە کەسی تری تیا دیار نەبوو چۆڵ بوو.. قەدەرێ لەحەوشەکەیدا رامانیان گرد تاهەموو ئەو خەڵکەیان کردە حەوشەکەوە گەلێ زۆر بووین.. دوای بەش بەشمانیان کردو بەژمارە خستمانیانە ناو غو رفەکانییەوە.. غورفەی چی غورفە هەریەکی ئەوەندەی هۆڵە مەڕێك دەبوو کەچووینە غورفەکانەوە لەوە ئەچوو پێش ئێمە خەڵکی تری تیا بوو بێ پاشماوەی خواردن لەژوورەکاندا کەوتبوو ئیتر نازانم هی حەرەسەکان قەڵاکە خۆی بوو لەغورفەکان یان سجن بووە.. بەڵام مەتارەی ئاوی لێبوو گونێی تێگیرابوو.. بەوەدا دیار بوو کەشوێنی سجنی تیا بووبوو.. چونکە حەرەسەکان مەتارەیان بۆچی بوو ئەوان کارەباو تفاقیان هەبوو.. بەڵام ئیتر نازانم ئەگەر سجنیش بووبن ئەوانیان چی لێکردبوو..!؟

قەڵاکە چۆن لەدەرەوە بەرز بوو لەدیوی ناوەوەیش دوو قات لەبان یەك هەمووی ئەتووت شقارتەیە لەسەر یەك دانراوە ئەوەنە رێك دروست کرابوو غورفە لەبان غورفە بەدەوری یەکتریداو بەم بەرو بەو بەرەوە بەو شێوەیە بوو لەناوەڕاستەوە ئەمسەرو ئەو سەری قەڵاکەیش دایەرەی خۆیان بوو بەدەستە چەپدا دایرەی (شورتە)و ئەوبەری دەستەڕاستیش دایەرەی (ئەمن)بوو.. غورفەکان ئێمەیش نازانم چەنێکیان تێکرد بەڵام هەمووی لەشی لەبان لەشی کەوتبووینە سەریەکدا.. ئێمە ئەو قافڵەیەی کەپێکەوە بردمانیان لایەکی قەڵاکەیشمان پڕنەکردبووەوە، غورفەکان زۆربەی چۆڵ بوون ئیتر نازانم بۆئێمەیان بەزۆر ترجاند بووە چەند غورفەیەکەوە هەر روحمان دەرچوو لەتاوا.. بەڵام ئەوان خۆیان ئەیانزانی بۆچی بەو شێوەو بەقەرەباڵغی کرد بوومانیانە نێوو غورفەکانەوە چونکە ئیتر هەر بەدوای ئێمەدا خێرا خێرا وەجبەی تر ئەهاتو دیاربوو بەوانیان ووتووە کەخەڵکی ترتان بۆدەنێرین.. هەر وەجبەیەکی تریش ئەهات وەك ئێمە هەڵیان ئەدایە

غورفەکانەوەو قاتی خوارو دوای سەرەوەشیان پڕکـردو کۆمـەڵێکیش هـەر لـەناو حەوشـەکە بـوون چونکـە لەغورفـەکاندا جێگـا نـەمابوو.. ئیـتر ڕۆڵــە ڕەزالاتمـان بینـی لـەو قەلاّیـە.. یاڕەبی ئەوەی ئیسـمی موسـوڵمانە ڕەزالـەتی وانەبینێ یاخوا گاوریش نەیبینێ..!

ئاوێکیان ئەداپێمان وەك زەهر وابـوو ڕەنگـە هـەر زەهریشیان تـێ کردبێ چونکە نـاوزگ ئـەو خەڵکـەی گشـت هـاوردە خـوارەوە بـەخوا ڕۆژی وابـوو بەپەنجە ژماردوومە لەهەموو غورفەکانەوە (پەنجاو دە) کەس عـەمری خـوای کردووەو لاشەکەیان ئەبردە دەشتەوە.. ئەوەنـدە بێزار بوو بووین خۆزگـەمان بەمــەرگ دەخواســت ئــەمانووت خۆزگــە کەئــەمردین بــەمردویش بێــت ئەمانبەنـەوە بۆکوردستان.. وامـان ئەزانی ئێمـەیش وەك عەسـکەری عـێراق کەلە شەڕی ئێران و عێراقدا ئـەکوژران ئەیانووت ڕۆژ بـووە سـەد جـەنازەیان هاوردۆتەوە.. بەهەموو ئەقڵمانەوە ئـەمانووت کـەمردین مەیتەکـەی ئێمـەیش ئەبەنەوە.. چوزانین ئەم زاڵمانە بەمردویش وازمان لێ ناهێنن و تەرمـەکانمان ئەخەنە بەردەم سەگ.. ئەوانەی‌کە جەنازەکانیان ئەبردە دەشتەوە ئـەیانووت کۆمەڵێ سەگی زۆر گەورە گەورەی لێیە هەر مردوەکان دائەگرین لەسـەر ئـەو عارەبانـە دەستی‌یەی کەپێیان ئـەبردە دەرەوەی قەلاّکە، یەکسـەر سـەگەکان پەلاماری ئەدەن و هەڵی ئەدڕن و ئەیخۆن.. ئیتر بەجارێ وەزعمـان خـراپ بوو گـەلێ زەحمـەت بـوو گـەلێ، دڵـی خۆمـان بـەچی بدەینـەوە بڵێـین ئاسـایی‌یە باتەرمەکانمان بدەنە سـەگ.. ئاخر لەوڵاتی ئێمـەدا بـێ حورمـەتی بەرامبـەر بەمردوو نەکرابوو ئەم زاڵمانە بەمردوەکانیشیان ئەکرد.. بۆیە ئیتر بـەردەوام ئەپاڕامـەوە خوایـە لـەم غـەریبی و بـەم ڕەزالەتـەوە نـەمانکوژی.. زۆری ئـەو خەڵکە هەر لەتینواو لەبرسا مردن..

ڕۆژی یـەك سەمونێ ڕەق ڕەقیـان ئـەداپێمان ئـەتووت بـەردە ئـەوەندە ڕەق بوو ئەبوو بیکوتین و وەك ئارد بیخۆین ناچاری نـەبوایا ناخورا.. بـەلاّم ئێمـە ڕەزیل بووین.. کەخەڵکمان لێ‌مرد ئەمانووت باشترە تۆزێ کەم بینـەوە بەڵکو سەمونی مردوەکانمان بدەنێ و بەشەکەی ئەوان بخۆین تالەبرسا نـەمرین..!

خوا ئاگادارە ئەوەندە زاڵم بوون دیار بوو ئەو سەمونانەیان بەژمارە ئەهێنا یەك دانەیەك چیـیە زیـادی نـەبوو هـەر کـەس بمردایـا هـەرلای خۆیانـەوە ناوەکەیان ئەکوژانەوەو سەمونەکەیان ئەبڕی.. هەر نەفەری لەیەك سەمون زیاتریان نادایێمان ڕۆژێك دوای ئەوەی سەمونەکەیان هێناو بەشە سەمونی غورفەکەی ئێمەیان دابەمەسئولی غورفەکەمان، هەر غورفەی لەناو خۆماندا یەکێکیان کردبوو بەسەر پەرشتیاری غورفەکەیو ئیتر حەرەسەکان ئەوەندە خۆیـان هیلاك نەدەکرد بەدابەش کردنی سەمونەکەوەو هەر یەکەو خۆیـان سەمونەکەی بدەنێ.. هەر ئەیانهێنایە ژورەکەوە بەش ژورەکەیان ئەدا بەو کەسەی سەرپەرشتی غورفەکەی دەکردو خۆیان دەچوونە ژورێکی تر..

ڕۆژێك زەلامێك لەغورفەکەی ئێمە دوای ئەوەی بەش ژورەکەی خۆمانیان داناو ڕۆیشتن لەدواوە دەستی برد یەك سەمونی لەکۆڵەکە دەرکرد ئەوەی بەکۆڵی پۆلیسەکەوە بوو کەزانیان خوا ئاگادارە یەك چەپۆکیان دایە لای دەمیدا تاسیێ چوار ڕۆژ دوای ئەوەیش پێوەی ئەتلایەوە، ئەوەندە زاڵم بوون هـەر بـەو لێدانـەیش وازیـان نـەهێنا، بەشـە سـەمونەکەی خۆیشـیان لێی وەرگرتەوە.. زۆر گوناهبوو ئەگەر زۆر برسی نەبوایا پەلاماری ئەو سەمونە ڕەقەی نەئەدا.. کەچی بەشەکەی ئەو ڕۆژەیشیان نەداپێی..!

ئیـتر بەهـەموو شـێوەیەك تـەعزیبیان ئـەداین، ئـەمانیان چەوسـاندەوە.. یەکەم جار پڕی هەموو غورفەکانو ناو حەوشەکەیش خەڵك بوو بەڵام ڕۆژانە ئەوەندەی لێئەمرد نـەك هـەر حەوشـەکە چـۆڵ بـوو غورفـەکانیش کـەم بـوو بووینـەوە.. سـەرەتا کەخـەڵك دەمـردو تەرمەکـەیان دەرئـەکرد لەوانـەی ناوحەوشـەکەیان ئەهێنایـە ژورەکـان تـاوای لێهـات کـەس نـەما، کێمـا..!؟ زۆربەی زۆری مرد..

بەخوا گەیشتبووینە تەموز ئەتووت لەناو کورەی ئاگرداین زۆر گـەرم بوو لێیان ئەپاڕاینەوە خێرتان ئەگات بەشەو بمانکەنە حەوشەکەوە تۆزێ فێنك ترە هەرچۆنێك بوایا لەغورفەکان زۆر باشتر بوو.. ئەوەندە زاڵم بوون بەو قرچەی گـەرمای نیوەڕۆیـە ئەمانیان کردە ناو حەوشەکەوەو لەبەر ئەو

خۆرە هەڵئەقرچاین و شەوانیش ئەمانیان خستەوە غورفەکان ئاوسانیش بوو هەر گەرما کوشتمانی..

ئەوان بەهەموو شێوەیەك ئازارمانیان ئەدا تابەعەزابەوە بمرین خوا ئاگادارە کەنۆرەمان ئەگرد بۆئاو ئەهاتن کارێکیان پێمان ئەکرد مەگەر هەر خوا بزانێ بەلیس و بەقامچی ئەکەوتنە ناو ئەو خەڵکە من ئێستایش ئەوەدەستم شوێنی لێدانی ئەو کاتەیە هەر گرێیەکەو لەسەر دەستم دروست بووە.. خۆی تەنکەرێك ئاو بوو ئەیانهێنا ئەوەندە پاڵیان پێمانەوە ئەناو لێمانیان ئەدا لەکاتی ئاو وەرگرتنەکەدا نیوەی هەر ئەڕژا.. لەوە ئەچوو هەر بۆئەوەیش وایان بکردایا تائاوەکە برژێت و ئێمە زۆرتر تینوبکەن.. ئیتر ڕۆژ وابوو زۆرکەس ئاوی بەرنەدەکەوت و تاسەی ئاوی تریان ئەهێنا ئەو لەتینوا هەر دەمی ئەدا بەیەك داو ئەپاڕاینەوە لێیان سودی نەبوو.. بەبەرچاوی خۆیشمانەوە ئەوان ئاویان بۆئەهات و بەفریان بۆئەهات و میوەو خواردنیان بۆئەهات.. بۆنی ئەو میوەو خواردنە وەك ئاگر وابوو ئەچووە هەناومانەوە.. بەخوا گشتی بۆئەوە بوو خەم و خەفەت و مەراقی زیاتر بدەنە ئێمە.. ئەگینا بۆناچوون لەژورەکانی خۆیان زەهرەکەیان بخۆن.. ئەهاتنە ناو حەوشەکەوە کاڵەك و شوتیان ئەگردە دەستەوە لەناو حەوشەکە ئەوەستان و وەك ئەوەی (کامی کامی) بەئێمە بکەن.. هەر هارو شێتمانیان کرد، هەواڵەی خوابن..!

دوو غورفەیان هەبوو جیاواز بوون و کەس بۆی نەبوو بچێتە نزیکیانەوە ئەگەر یەکێ هارو هاج بوایاو ناڕەحەتی زۆر بکردایا ئەمنەکان لێی بێزار بوایان ئەیانبردو دەرگای ئەو ژورەیان ئەکردەوە، ئەمبینی هەڵوێستە ئەکات و تەکان ئەدات نەیبەنە ژورەوە بەوەیا ئەمزانی ئەو ژوورانە شتێکی لێیە مرۆڤ سڵی لێئەکاتەوە.. بوو بووە مەراقم ڕۆژی دەجار لەبەر خۆمەوە ئەمووت ئەبێ چی بێ چی تیابێ ئەی بۆناهێڵن کەس بچێتە نزیکی ئەی بۆخۆیان جاری وایە بەزۆر یەکێك ئەبەنە سەری ئیتر خوا خوام بوو بزانم چی تیایە..! منیش تۆزێ بەهەڵپەو هارو هاج بووم کەنیوەڕوان ئەمانیان

کــردە حەوشــەکە بــەتاق تــەنیا ئــەچووم بۆنزیکــی ئــەو دوو غورفەیــەی کەلەئێمــەوە دور بــوون خواکردی رۆژێــك ئــەمنێك کــردی بەپــەلمداو بردمــی بۆلای غورفەکان کەدەرگاکەی کردەوە، هـەر زراوە تۆق بووم چیم دی رۆڵـە زەلامم بینی هەڵواسرابووە بنمیچی ژوورەکەوە بەرمیل لەو ناوە دانرابوو دیار بوو بەرمیلەکەیان خستبووە ژێر پـیّ دوای لایـان دابـوو.. زەلامەکـە بـەو ئاسمانــەوە وشـك بـوو بـووەوە.. بـەو خوایـە سـەری زەلامـم بینــی لــەقوڕ قوڕاگەیەوە بەبنمیچەکەوە بوو ئەوە کەی هـەر ئێسکەکە بـوو هـەڵوەری بـوو لەســەر زەوی یەکــە کــەوتبوو سەرەکەیشــی بەحــەبل بەســترابووە ژێــر دیوارەکەوە.. موچوڕکەیـەك سەراپای لەشـی داگـرتم ئێستایش جاری وایـە شەو نیوەشەو ئەو دیمەنە دێتەوە بەرچاوم لەتاوا هاوار ئەکەم..

زمانم وشك بوو قاچم زەوی ناگرد هەناسەم کورت بوو.. خوایە گیان ئەمە چی گـاور سـانێتی یەکـە.. ئـاخر چیمـان کردبـوو وائـەم زاڵمـە وامـان پـیّ ئەکات..

دوای ئەوەی ئەو ژوورەم بینیو بردمیەوە ناو خەڵکەکە تادە رۆژ لەترسا چاوم چوو بووە قوڵ داو قسەم بۆناکرا حەپەسا بووم.. نەخۆش کەوتم وەك ئەوەی (فێم لێبێت) ئاوا بوو..

دوای هەر خوا رەحمی پێم کردو شێت نەبووم چاك بوومـەوە، بـەڵام هـەر ئـەو دیمەنـە ئەهاتـەوە بەرچاوم.. رۆژ هـەتا ئێـوارە لەتاوا هـەر ئەپاڕامـەوەو نوێـژم ئـەکرد.. ئـاو نـەبوو بۆدەسـت نوێـژ بـەڵام مـەلامان لەگـەڵ بـوو ئـەویش سـجن بـوو وابزانم خـەڵك ئـەو مەنتیقـەی سـەنگاوە بـوو ئـەیووت هـەر نیـەت بهێنن‌و بەدەسـت دەسـت نوێـژ هـەڵگرن بـەبیّ ئاویش بێـت هـەر ئەبیّ.. ئیتر بەردەوام نوێژم ئەکرد.. هەندێکمان لەگەڵ بوو حاجی بوون کاتی خۆی چوو بـوون بۆحـەج یـەکێکیان تـۆزیّ وتووریـاتر بـوو لـەوەکان ئـەیووت (مەکـەو مەدینـە) لێرەوە نزیکن‌و ئەم خاکەی وائەم قەڵایـەی لەسـەر دروسـت کـراوە رەنگـە هـەزار جار (پێغەمبـەر) بەسـەری‌دا ڕیّی کردبـیّ.. ئـەم خاکـە پـیرۆزە نوێژ بکەن‌و لەخوا بپاڕێنەوە بەڵکو خوا رەحم بەئیمانمان بکات.. ئاخر ئێمە

لەژیانماندا کردەوەیەکی خراپمان نەبوو بێ ئەمری خوامان نەکرد بوو ئێستایش وارەزیل کەوتووین ئەبێ ئیمانمان چی بێت.. خوا چۆن دڵی دێت ئەم هەموو پیرەژن و پیرەمێردە رەزیل کەوتووە کەوا هەر بۆقومێ ئاو شێت ئەبووین گوناهمان چییەو چۆن لەو دونیا محاسەبەمان ئەکەن.. ئێمە سەرباری ئەو هەموو رەزالەت و عەزابە هەر پەنامان قاپی خوابوو گوێت لەیەکێك نابوو ناشوکرییەك بکات، ئیتر ئیمانمان بۆ بەهێز نەبوو.. تابڵێن خوا رەحم بەئیمانمان بکات.. بەڵام بەقسەی مەلاکەو حاجی یەکانیشمان ئەکردو نوێژمان ئەکردو ئەپاڕاینەوە تاخوا بەفریامان بکەوێت، بەڵام بەخوا رۆڵە کەس بەفریامان نەکەوت..

بەخوا من وەك شێتم لێهاتبوو لەتاوا، نەمئەوێرا باسی ئەو ژورەی کەبینیم بۆکەس بکەم بەڵام کەدەرمانیان ئەکردە حەوشەکە لەتاوا تاك ئەبوومەوەو ئەچوومە دوری خەڵکەکەو هەر ئەملاوانەوە.. رۆژی خۆم و ژنێکی‌تر دورکەوتبووینەوە هەردوکمان ئەگریاین.. ئەو دەنگی خۆش بوو ئەیلاوانەوەو منیش ئەگریام لەپڕلە بەردەممان.. شتێ وەك سەر قەباغ وابوو لاچوو هەڵدرایەوە.. زۆر ترساین، لەبەردەممان پارچەیەك ئاسن لاچوو ناوی کون بوو لەپڕشتێ سەری هێنایە دەرەوە.. هەر تۆقین هەموو لەشی هەر موو بوو لەناو ئەو هەموو قژوپڕیشەدا دەم و چاوێکی باریك رووی لێمان کرد من قیژەیەکم کرد وتم ئەمە (ئیزارائیلە) لێمان پاڕایەوە وتی مەیکەنە هەرا منیش کوردم (بارزانیم).. ئێمە تاقەدەرێ هەر واقمان ورمابوو قسەمان بۆناکرا هەر ئەو قسەی ئەکرد.. لێمان پاڕایەوە ووتی قسەنەکەن بڵێن بینوومانە دوای عیدامتان ئەکەن.. ووتی کەئەچنە سەر ئاو هەرچی ئەو (گەن و گووە) هەیە دێتە خوارەوەو ئێمە لەناو ئەو پیسی و بۆگەنی‌یە ئەژین، ئیتر ئێمەیش کەوتینە قسەکردن وتمان کەی گیراون و لەکەیەوە لێرەن؟ ووتی واشەش ساڵە گیراوین و لەشوێنەکەی ئێوە لەم قەڵایە سجن بووین ئێستا ئێمەیان هێناوەتە خوارەوە جێگاکەمانیان بۆئێوە چۆڵ کردوە ئێمە ئەو ماوەیە هەر لەشوێنەکەی ئێوە سجن بووین.. پرسیارم لێی کرد ئەی ژن و

منداڵتان لەگەڵ نییە.. ووتی نەخێر ژنمان نەگیراوە.. بەڵام منداڵ هەشت ساڵەمان لەگەڵ بوو گیراوە ئێستا هەموو سەری چەرموو بوو..!

جارێکیتر پێمانی ووت نەڵێن بینیومە دوای عیدامتان ئەکەن.. منیش سوێندم بۆخوارد نەیگێڕمەوە تارۆژی خۆی دێت..

ئیتر لەوەو دوا سەرباری ئەو ژیانو بەخت رەشییەی خۆمان شەوو رۆژ خەفەتم بۆئەوانەی قاتی ژێرەوە ئەخوارد.. ئیتر نازانم چۆن ئەژیان نانو ئاویان لەکوێوە بۆئەچوو.. هەر تازە هاتبووین کەپێمان دا ئەنازرمەی ئەهات ئەیانووت بەخوا رەنگە ژێرەوەی ژێر زەوی بێت.. کەلەرێوەش هێنامانیان ژوورەکان لەوە ئەچوو سجنی تری تیابووبێ ئیتر ئەمووت رەنگە ئەم کابرایە راست بکات لەشوێنەکەی ئێمە بوو بێتن بۆئێمە چۆڵیان کردبێ ئەوانیان کردبێتە قاتی خوارەوە.. چونکە کەلەرێگەوە هێنامانیان لەبەردەرگای قەڵاکە زۆر وەستانمانیان، کێ ئەڵێ بۆئەوە نەمانیان وەستاند بوو تائەم فەقیرانە بگوازنە خوارەوە..

زۆر ئەترسام لەوەی کەئەگەر وەجبەی تریش بهێنن ئێمە بکەنە قاتی خوارەوە بۆلای ئەو بارزانییانەو شوێنەکەمان بۆخەڵکیتر چۆڵ بکەن..

ئیتر هەر ئەو جارە بوو نەیانمان بینییەوە.. چونکە دەرگای چوونە خوارەوەیش وابزانم لەناو دایرەی ئەمنەکانەوە بوو.. ئەیانووت شەوانی درەنگ شت دەبەنە خوارەوە بەڵام لەئێمەوە دیار نەبوو.. من دوای ئەوەی کەبەردراینو گەڕابووینەوە ئەم قسەیەم بۆکچەکانم گێڕایەوە دوای وتیان (مامە عەزە) ئەویش هەر خەڵکی زینانەبوو ناوی (عەزیز کەریم شەریف) بوو پێمان ئەووت (مامە عەزە) ئەویش گێڕاوێتییەوە وتویەتی یەك جارێکی ئەویش شەوێکی درەنگ بەرەو بەیان ئەچوو هێشتا فەجری نەدابوو کابرایەکی بینیووە بەو شێوەیە هەموو گیانی بەموو داپۆشراوەو بینیبووی هاتبوو لەغورفەی پۆلیسەکانەوە کۆڵێ شتیان دابووە کۆڵی داو مامە عەزە چاوی پێوە بوو بوو کەبردوێتییە خوارەوە بۆژێر زەوییەکە.. ئەویش لەقەڵاکە نەیوێراوە بۆکەسی بگێڕێتەوە دوای کەگەڕاینەوە لێرە

گیڕابوویەوە.. ئیتر نەبینیمیان مردویەکیان دەرکەن نەهیچیتر، لەوە ئەچوو دەرگای هەبووبێ لەژێر قەڵاکەوە بۆدەرەوەی قەڵاکەو مردوەکانیان لەوێوە دەرکردبێ.. کێ ئەڵێ لەدەرەوە هەر دەرگای بەتاکی نەبووە خۆ قەڵاکە دەرگایشی نەبوایاو حەرەسیشی نەبوایا کێ ئەیتوانی رابکات کێ هێزی ئەوەی تیامابوو دەدەقیقە رێگە ببڕێت.. ئەویش هەتا چاو بڕکات هەر سەحرابوو هیچی تر دیار نەبوو بۆکوێ بچی.. وەلاَ دەرگاکە بۆئەوەنە باش بوو سەگەڕەشەکان ناهاتنە ناو قەڵاکەوە دەرگای پێوە نەبوایا هەر ئەهاتن لەغورفەکاندا مردوەکانمانیان ئەخوارد.. ئیتر ئێمە حەوت مانگو پانزە رۆژ بەو شێوەیە ماینەوە.. رەزالەتمان بینی تینوو بووین، برسی بووین عەزابمانیاندا جهەنمێك بوو بۆخۆی..

دوای ئەو حەوت مانگو نیوە رۆژێ حەوت سەیارەیان هاوردو بەئارەزووی خۆیان لەناو ئەو هەموو سجنە بای ئەو حەوت سەیارەیە خەڵکیان جیاکردەوەو هاوردمانیانە ناو حەوشەکەت.. خوایە ئەبێ چیمان لێبکەن منیش بەر ئەوانە کەوتم کەجیاکراینەوە.. سواری سەیارەکانمانیان کردو خستمانیانە رێ مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ بۆکوێمان ئەبەن، بردمانیانە شوێنێ قەڵانەبوو هەر خانوو بوو بەڵام پڕی عەسکەری بوو چەند رۆژێك لەوێ هێشتمانیانەوە، دیار بوو پێش ئێمە خەڵکی تیا سجن بووە چونکە کراسو شەڕواڵی ژنانەمان ئەبینی لەو ناوەکەوتبوون.. پێ ئەچوو خۆیان مردبێتنو لاشەکەیان فڕێ درابێو لەبەر ئەو گەرمایەی ئەوێ بەدوو رۆژ ئەتوایتەوە.. رۆڵە خوا ئاگادارە هەندێ سەگی بچوك بچوکیان هێنا سەگەکان رەنگیان سور بوو دوانزە دانە بوو خۆم ژماردم وەك (توڵە)ی خۆمان وابوو بەڵام (توڵە) نەبوون.. جۆرێك بوو ئێمە قەت نەمان بینی بوو سویر سویر بەنەعلەت بن ئەوەنە جوانیش بوون دڵت نەدەهات تەماشایان بکەی.. یەك دوانێکمان لێمرد هەر لەناو حەوشەکەو بەبەرچاوی خۆمانەوە کەوتنە خواردنی لاشەکەی.. کورە هەر زۆر نزیك بوون خوا ئاگادارە خرمەی ددانەکانیان ئەهات..

باش بوو خوا رەحمی کرد زوو لەوێش گواستمانیانەوە.. ئیتر نەمان زانی کوێبوو..؟ بۆچی ئێمەیان بردە ئەوێ.. ئەی بۆچی ئێمەیان لەهاورێکانمان جیاکردەوە..

بردمانیان بۆ(سەماوە) ئەه رەحمەت لەدایكو باوك ئەوانەی (سەماوە) سێ رۆژ هێشتمانیانەوە ئای چەند باش بوون لەگەڵمان لەعەسکەری ئەم عێراقە ناچوون.. ئیتر نازانم بۆچی ئەمان لەگەڵمان باش بوون (کولیان بۆمان کرد) خواردنیان داپێمان.. رۆڵە ئێمە تامو بۆی خواردنمان بیرچوو بووەوە..

دوای ئەو سێ رۆژە جارێکیتر خستمانیانە سەیارەوە.. زۆرمان پێ ناخۆش بوو لەوێ بمانگوازنەوە.. چونکە ئەوەنە رەزالەتمان دی بوو ئەوەنە زاڵم بوون لەگەڵماندا.. هەرچەندە (سەماوە)یش هەرسجن بوو بەڵام لەچاو پێشترمانەوە وەك ئەوە وابوو شایمان بێت..

سێرۆژ هێشتمانیانەوە، دوای خستمانیانەوە ناو سەیارەو وتیان بەرتان ئەدەین.. تائەو کاتە پێمانیان نەوتبوو بۆکوێتان ئەبەین.. ئەگەر نەیانوتایا بەرتان ئەدەین، حەزمان ئەکرد هەر لە(سەماوە)بین چونکە ئەو (٣) رۆژە زۆر باش بوون لەگەڵمان.. بەڵام کەووتیان بەرتان ئەدەین خەریك بوو لەخۆشیدا لەپێستی خۆمان بێینە دەرەوە.. ئەبێ راستمان لەگەڵ بکەن.. ئەی ئەگەر بەرمان ئەدەن ئەو خەڵکەی تریان بۆبەرنەداو بۆچی بەتەنها ئێمەیان جیاکردەوە.. نابەخوا ئینشائەڵا قسمەتو نسیبی ئێمەی تیابووەو راستمان لەگەڵ دەکەن.. ئەبێ کەبەرمان بدەن بمان بەن بۆکوێ ئەوان هەموو دێیەکانیان سوتانو روخانو هەرچیماڵو موڵکمان بوو تاڵانیان کردو چی کەسو کارمان بوو گشتی گیرابوو.. ئەمانبەنەوە بۆلای کێ..؟ ئەی کێ ئەبێ بمانگرێتە خۆیو بەخێومان بکات..!؟ هەزارو یەك داڵغەی وام ئەکردو ئەمووت خوائەکا راست ئەکەنو بەرمان ئەدەنو ئەچینەوە وڵاتو وەتەنی خۆمان بەخوا ئەگەر لەبرسا ماڵەو ماڵ سواڵم کردوە، وائەزانم مەلیکم..!

ئیتر بەدەم رێگاوە خەیاڵم ئەکردو بۆنی وەتەنم ئەکرد.. رێگای گەڕانەوەی ئەمجارەمان وەك ئەوجارە ناخۆش نەبوو کەبردمانیان.. رەنگە

بەهەمان ڕێگادا چووبین کەپێیدا هاتینەوە.. بەڵام ئەوجار بۆناوعارەبسان بوو بۆسجن و ئەمجارە بەرەو کوردستان دێینەوەو ئازادمان ئەکەن.. فەرقی زۆرە..!! هیچ هەستم نەئەکرد کەلەناوسەیارە هیلاك بووبم یان بێتاقەت.. ئاگام لەڕۆیشتنی سەیارەکەو کات نەمابوو تالە شوێنێك لای‌دا.. (تۆبزاوا)بوو هەمان ئەو مەعەسکەرەی کەحەوت مانگ و پێش ئێستا بەخۆمان و کەنیشکە جوان و کوڕە جاهێڵەکانمانەوە هاوردمانیانە ناوێوە.. هەر لەدەرگای سەربازگەکەی بردمانیانە ژورەوە هەموو ئەو خەیاڵە خۆشانەی ڕێگەم لەبیر چووەوە، هەمان ئەوڕۆژە ڕەشەم بیرکەوتەوە کەتازە گیرابووین.. گەرچی لەناو ئەو مەعەسکەرە گەورەیەدا جگە لەچەند سەربازێکی کەم هیچ کەسێك دیارنەبوو.. بەڵام وام ئەزانی ئەو حەوشە گەورەیە جمەی دێت لەژن و منداڵ و گەنجەکانمان.. وام ئەزانی ئەو ڕۆژەیە کەهێنامانیانە ئێرە.. ئەترسام و وام ئەزانی جارێکی‌تر لێرەوە لەگەڵ ئەم پیرەمێردو پیرەژنانەی کەئازار کردبووینی بەهاوڕێ و جگەلە ژان و پەت پەتی‌یەکی وەك یەك، هیچ شتێکی ترمان پێکەوە نەبوو.. تەنها ئەوەی کەپێکەوە کۆی کردبووینەوە ئەوەبوو گشتمان کورد بووین و لادێیش بووین و وەك یەك بێ گوناهوو بێ‌تاوان بووین.. ئەترسام لەگەڵ ئەمانیشدا جارێکی‌تر لەیەکتر جیامان بکەنەوەو هەریەکەو بۆقەلایەکی ترمان بنێرن.. کاکە ئەم حکومەتە زاڵم بوو لەوە خراپتری لێئەوە شایەوە..شەوو ڕۆژێك لە تۆبزاوا هێشتمانیانەوەو ئێمە هەموومان لەنیوەی ئەو هۆڵەدا جێمان ئەبووەوە کەشەو کردمانیانە ناوێوە.. بەڵام ئەوەندە دڵم سەغڵەت بوو وام ئەزانی لەناو جهەنم دام.. ئەمزانی هەموو ئەوانەی تریش وەك من دڵیان سەغڵەتەو هەریەکەو بەجۆرێك کەس و کارەکانی خۆمان و ئەو خەڵکە زۆرەمان دەهاتە بەرچاو کەلێرە لەیەکتر جیاکراینەوە ئەو شەوە تابەیانی خەونەچووە چاوم و تابەیانی گریاوم.. نازانم بڵێم ئەوشەوەم چۆن لێ‌ڕۆیی.. شەوێکی تاریك و نوتەك بوو.. گەرچی گوێت لەدەنگی هیچ نابوو، جگە لەتاریکی هیچی تر دیار نەبوو بەڵام من هەمان ئەو چراخانەی لایتی

سەیارەکانی حەوت مانگو نیوەکەی پێشووم دەهاتەوە بەرچاو.. لەپەنجەرەی قاعەکەوە چاوم بەناو تاریکی‌یەکەدا ئەگێڕاو وەك ئەوەی کەچۆن یەکەمجار ئاوا چاوم بەناو خەڵکەکەدا گێڕئەدا بۆئەوەی بۆدواجاریش بێت چاوم بەئازیزانم بکەوێتەوە..

لەگەڵ بەری بەیاندا هاتنەوەو دەرگایان لێمان کردەوەو سواری سەیارەکانیان کردینو تۆبزاوامان بەجێ‌هێشت..

کەبەووردی چاوێکم بەناو سەربازگەکەدا گێڕا لەقاعەکانی ژوورەوە خەڵکی تیابوو لەپەنجەرەکانەوە تەماشای ئێمەیان دەکرد..

ئیتر لە تۆبزاواوە تاگەڕاینەوە بەدەم رێگاوە هەر لەگەڵ کەسو کارەکەمدا ئەژیام.. یەکەیەکە دیمەنەکانیان دەهاتەوە پێش چاوەو ئەمووت بەڵکو ئەمە خوایە ئێستا کەگەڕاینەوە ئەوانیش بەر بوو بێتن و پێش ئێمە گەڕابێتنەوەو چووبێتنەوە ئاوایی و خانوو مەڵانەکەیان دروستکرد بێتەوە.. ئەبێ ئەوەندە ئەقڵیان بووبێ لەژێر خانووەکانو لەژێر پشتیری مەڕو مانگاکاندا ئەمجارە (ژێر زەوی) گەورەیان دروست کردبێ..! بۆئەوەی جارێکی‌تر ئەگەر کۆپتەر هاتەسەر ئاوایی و جەیشو جاش هاتنە سەرمان نەمان دۆزنەوە.. سەدان داڵغەی وام لێ‌ئەدا..

تاگەیشتینە سلێمانی لەوێ ناومانیان نوسی و هەریەکی وەرەقەیەکیان بۆمان کردو هەر کەسەو بۆناو چەکەی خۆی بۆئەو ئۆردوگایەی کەپاشماوەی کەس‌وکاری ئەو ناوچەیەی لێ دەژیان ناردمانیانەوە.. هاوردمانیانەوە بۆ (صمود) لێرە کەفیلیان لێمان سەندو بەرەڵامانیان کرد..

کەهاتینەوە تەماشام کرد ئێرەیش هەر وەك سجن وابوو بەڵام تۆزێ باشتر بوو.. ئەوەی کەهەرچۆنێك بوو نەگیرابوو لەم ئۆردوگایەدا خڕیان کردبوونەوەو وەك زیندانێکی گەورە وابوو.. رێگای دەشتو دەریان نادانو حەرەسی هەبوو کۆمەڵێ رەبایە بەچواردەوری ئۆردوگاکەوە بوونو نەیان هێشتبوو بچنەوە ئاواییەکانو ئاوەدانی بکەنەوە.. نەیان ئەهێشت مەڕداری و زراعەتو گەنمو جۆ بکەن..

تاراپەڕینەکە هەروەك زیندان وابوو.. ئیتر لەو کاتەشەوە تائێستا هەر لێرە ئەژیم‌و تازە نەکەسم ماوە تائاوایم بۆئاوەدان بکاتەوەو نەخۆیشم ئەتوانم بچمەوەو لەوێ بژیم.. واڵیرەم‌و بەردەوام چاوەڕێی هەواڵی کەس‌و کارەکەمم بەتایبەت کەنیشکە جوان‌و جاهێلەکان‌و گەنجەکان‌و چاوەڕێی مردنیشم بەلام خوا بکات خوائەو ڕەحمەم پێبکات هەواڵی ئەنفال کراوەکان بخاتە پێش مردنەکەمەوە..



کابرایەك هەبوو لەدێیەکەمان ناوی (حامید مولود)بوو گۆجیش بوو شێتیش بوو پێیان ئەود (حامیدە گۆج) ئەویش گیراو دوای کەبردمانیانە (نوگرە) حەوت رۆژمانی لەخواردن گردو لەبرسا مرد..

# خورشید رەفیق حەمە ئەمین

لەدایك بووی ١٩٣٢- گوندی جەلەمۆرد ناوچەی شێخ بزێنی..

مێژووی دێیەکەمان کۆنەو باوباپیری ئێمە هەرلێرە ژیاونو بەمەڕداریو کشتوکاڵ کردن ژیانیان بردۆتە سەرو ئێمەیش هەربەو شێوەیە ژیاوینو خراپەمان بۆکەس نەبووە.. ویستوومانە لەسەر ئەم خاکەی کەخوا پێی بەخشیوین بژینو ئیحتیاجی دەستی کەس نەبین، بەرەنجی شانی خۆمان شوانکارەیو دەغڵو دانمان کردووەو هەموو ژیانمان بۆئەوە تەرخان کردووە..



من ژیانی گەنجێتی خۆمم لەبیرە، بەخوا شەو رۆژ بەو دەشتو دەرەوە بووم.. ئەوکاتە هیچ نەبوو داسو درەوو گاجووتو هەمووی هەر ئەبوو بەهیلاکەتیو هێزی بازووت بێت..

لەساڵی ١٩٥٥دا ژنم هێناوەو ئیتر ئەرکم قورستر بووەو ئەرکی خێزان‌و دروست کردنی ماڵ‌و ماڵداری کەوتۆتە ئەستۆم.. بەهەزار هیلاکەت‌و دەردەسەری شتێ ماڵم نابووە یەکەوە، نازانم بەڵای خوا بوو نازانم چی نەگبەتی یەك بوو ئەم وڵاتەی گرتەوە، عارەب هات‌و دایانە سەر دێیەکانداو تاڵانیان کرد.. (ساڵ بەعسیەکە ئەڵێم)لە ٦٣.. ئەم دێیەی ئێمەیش کەوتە بەرتاڵانی‌و هەرچیمان هەبوو بردیان‌و ئاواییان سوتان.. بەخوا بەخوا ئەنفالەکە ئەو کارەساتەی ساڵ بەعسی‌یەکەی لەبیرمان بردەوە.. ئەگینا بەردەوام لەبیرمان بوو چۆن هاتن‌و گورایان لەگوێی ژنیش دائەکەن.. کەل‌و پەلی بەرمانیان برد.. کارەساتێکیان بەسەر ئەم میللەتەیا هاورد ئەگەر ئەو ساڵەی ئەنفال نەبوایا.. بەتاریخی کورد وای‌بەسەر نەهاتبوو..

رانە مەڕ، مانگاو گوێلك، بەخوا گوێ درێژەکانیشمانیان برد.. گشتی عارەب پاپەتی ئەتووت بەحەیاتی ماڵ دونیایان نەبینی‌وە.. هەرچاویان چووبوو پەلاماری هیزە رۆن‌و مەنجەڵە ماستیشیان ئەدا.. کارەساتێکیان بەسەرمان هاورد، وەك ئەوەی هەق باوکیان لەسەرمان بێت لەپێشەوە هەڵمانیان کێشا.. وەك لافاو وابوو هەرناو چەیەکی بگر تایەتەوە رای داماڵی.. بەڵام ئەوەنەی پێنەچوو.. خوا ئەونەهەقی‌یەی قبوڵ نەکردو دای بەناو دەمیاندا لەسەر تەخت لاچوون‌و حکومەتەکەیان روخا.. بەخوا ئەگەر زۆری بخایانایاو لانەچونایا لەسەر حوکم هەر ئەوکاتە روح لەبەری لەم کوردستانە نەئەهێشت.. بەڵام خوا بەفریامان کەوت..

ئیتر ئەوەبوو دوایی شۆڕش پەیابوو، پێشمەرگە زۆر بوو بوون لەسایەی ئەواندا ئێمەیش حەساینەوە.. هەرچەندە (حەرەس قەومی) هەبوو حکومەت ئەیانی ناردە سەردێیەکان‌و شەوکوتیان ئەکردو ئەوانیش هەر تاڵانیان ئەکرد.. بەڵام لەترسی شۆڕش ئەوەندە نەیان ئەوێرا بێنە سەرمان..

ماڵمان دروست کردەوەو کەوتینەوە سەر خۆمان تائەو کاتەی شۆڕشەکە تاوایەوە.. بەڵام دوای ئەوە ژیانمان کەوتەوە مەترسی‌یەوە.. جاش پەیدا بوو بوو ئەهاتنە سەرمان، پێشمەرگە نەمابوو ئیتر حکومەت ترسی نەبوو..

ئـەهاتن دێـیـەکان ئەگـەڕان و ئـەیانووت ئـەبێ ببنـە چـەکداری حکومـەت و هـەرماڵی زەلامێك چەك هـەڵگرن.. هـانی خەڵکەکەیشیان ئەدا باربکـەین بـۆ شارەکان و ئەیانووت لەدایرەی (غابات) داتان ئەمەزرێنین..!

هـەواڵی ئـەوەشمان بیستبوو حکومـەت کەوتۆتـە روخـاندنی دێهاتـەکانی ناوچە سنوریەکان و ئەیانووت ئەیانبەن لەشارەکان موجەمەعیان بۆئەکەن.. ئیتر وەزع بەرەو خراپی ئەڕۆیشت ئـەمانزانی کەئـەم حکومەتـە زاڵمـە نیـازی لەگەڵماندا خراپە.. ئەوەشمان بیستبوو هەرئەو جەماعەتەی ساڵی شەست و سێن و هاتنەتـەوە سـەرحوکم، ئیـتر هەربەیـەکجاری تۆقـین.. خـوا کـردی یەکەیەکە پێشمەرگە پەیابووەوەو چەکدار دایەوە بەشاخدا، ئەوە بۆئێمە زۆر باش بوو لەترسی ئەوان نەیان ئەوێرا ئەوەندە بێنە سەر دێهاتەکان و تالاَن و بڕۆی بکەن..

دوای وتیـان ئـەوە حکومـەت لەگـەڵ ئـێراندا بووەتـە شـەڕی و ئیـتر هـەر ناپەرژێتـە سەر ئـەوەی ئێمـەی لـەبیر بێت.. زۆرمـان پـێخـۆش بـوو کەشـەڕ هەڵگیرسا.. ئەشمانووت باهەر دوولایان بەربنە گیانی یەکتری چیان بەکورد نەکرد لەئاشبەتاڵەکەیا.. بەخوا خـوای کـورد بـوو وایـان بەسـەر هـات و بووە شەڕیان بـەهۆی شـەڕەوە پێشـمەرگە زۆر بـوو عەسـکەری فـیرار زۆر بـوو.. خـەڵکی لەشـارەوە بـاری ئـەکرد بۆلادێکـان.. ماوەیـەك بـاش بوژاینـەوە.. هەرچـەندە حکومـەت زوو زوو پـەلاماری دێهاتـەکانی ئـەداو کۆپتـەر رەمـی ئـەکرد.. بـەلاَم دێیەکـەی ئێمـە پشـتی بەخاڵخالاَنـەوەبوو.. شـوێنەکەی کەوتبووە نێـوان کۆیـەو چەمچەماڵـەوەو لەهـەردوو لاوە دوور بـوو.. ئەگـەر جەیش بهاتایە ئەبوو بەسەر کۆمەڵێ دێ و ناوچەی تردا بێت.. لەبەر ئـەوەی دێیـەکانی تریـش هـەمووی لەناوچـەی ئـازاد دابـوون.. بەئاسـانی دەسـتی حکومـەت نەئەگەیشـتە دێیەکـەی ئێمـەو بۆخۆمـان حکومـەت بوویـن و لەهیچمان کەم نەبوو..

دوای ئەوەی مفاوەزاتی نێوان شۆڕش و حکومەتی عێراق تێکچوو، وردە وردە وەزعەکـە تێکچـوو.. حکومـەت ئابڵوقـەی ئـابووری خسـتبووە سـەر

دێهاتەکان.. نەیئەهێشت کەل‌و پەلی خواردەمەنیمان لەشارەکانەوە بۆبێت.. ڕێگای هات‌وچۆی شارمان سەخت بوون.. لەسەر ڕێگاوبانی شارەکان خەڵکیان ئەگرت‌و سجنیان ئەکرد، یان کۆپتەر لەسەر ڕێگاوباندا ڕەمی لەسەیارە ئەکرد‌و زۆرجار ناچار بووین ئەبوو بەشەو هاتوچۆ بکەین.. بەم دوا دوایە بەشەویش ئاگری سەیارەیان بەدی بکردایا تۆپ بارانی ناوچەکەیان ئەکرد.. چەندجار ئاوا تۆپ بارانی دێهاتەکانمان کراوە.. ئیتر ژیانمان لێ‌شێوا وەك ئەوە وابوو لەناو مەیدانی شەڕ دابین.. بەو شێوەیەو بەهەر حاڵێك بوو ئیدارەمان ئەکرد.. ماوەیەکی پێ‌چوو وتیان حکومەت قواتێکی زۆری بردوە بۆسەر سەرکردایەتی شۆڕش.. ئەیانووت هێزەکەی لەکێشانی‌یە.. دێیەکەی ئێمە لەبەر ئەوەی شوێنێکی دورە دەست بوو ماڵی زۆربەی بەرپرسەکانی پێشمەرگە لەدێیەکەی ئێمە بوون.. ئەوان ئاگایان لەهەموو شتێك بوو.. لەوانەوە ئەمان بیست کەحکومەت پەلاماری سەرکردایەتی یەکێتی ئەدات‌و هێزی بردۆتە سەریان هەرچی پێشمەرگەی ناوچەکەی ئێمەشە، ئەوانیشیان برد بۆ بەرگری لەسەرکردایەتی.. ماوەی چەند مانگێکیان پێ‌چوو کەگەڕانەوە دیاربوو زۆر ماندوو بوون‌و شکستیان خواردبوو.. کەهاتنەوە لەڕێی ئەوانەوە زانیمان کەحکومەت کیمیایی تەقاندوەتە سەر دێهاتەکانداو هەرچی لادێ هەیە سوتاندویانەو ئەمجارە خەڵکەکەیشیان گرتووە.. خەڵکی زۆریان کوشتووە.. هیچ ڕێگا چارەیەکیش نەماوە.. کوڕ ئەو کوڕەیە بەهەر شێوەیەك بێت خۆی ڕزگار بکات.. هەندێ لەبەرپرس‌و پێشمەرگەکان ماڵەکانی خۆیان گواستەوەو ڕۆیشتن.. بۆئێمە حاڵەتێکی ناخۆش بوو ڕوولەکوێ بکەین.. خۆماڵێك‌و دووماڵ نین، دێیەکی واگەورە زیاتر لە ١٥٠ ماڵ بووین لەکوێ خۆمان حەشار دەین.. ئەی دێیەکانی‌تر.. توشی وەزعێکی زۆر خراپ بووین.. نەمان ئەزانی چی بکەین.. بەخوا ئینسان لەلێقەوماندا ئەقڵیشی نامێنێ..

هەروا ماوەیەکی کەمی پێچوو هەواڵمان زانی کەوا قەرەداغ‌و گەرمیانیش بەودەردە براون‌و هەموو دێهاتەکانیان تەخت کردوە..

ئێمەو هەموو دێیەکانی تری کوردستانیش زوو زوو دێهاتەکانمان ئەسوتێنران و تەخت ئەکران.. لەگەڵ ئەوەدا راهاتبووین و دوای ئەوەی ماڵکانمانیان ئەسوتان، سەر لەنوێ دروستمان ئەکردەوە.. بۆیە ئەگەر تەنها بەروخاندنی دێهاتەکان وازیان بهێنایا پێی رازی بووین بەڵام ئەیانووت هەرچی خەڵکیش هەیە گرتویەتی.. زووتر هەرکاتێ جێش وجاش بۆهەر ناوچەیەك دەربچوایا ئەوەی ترسی لەخۆی هەبوو یان موالیدی سەربازی بوو خۆی ئەشاردەوە تاجەیش و جاشەکە ئەگەڕانەوە.. بەڵام ئەمجارە ئەیانووت دەستی لەکەس نەپاراستوەو فەرق و جیاوازی لەنێوان ژن و منالّ و زەلامیشدا نەکردووە..

کۆمەڵێ پێشمەرگە بەخێزانەوەو کۆمەڵێ سەربازی فیرارو بەشێك لەو خەڵکەی کەتوانی بووی خۆی رزگار بکات و بەر پەلامارەکە نەکەوتبوو لەگەرمیانەوە خۆیان گەیاندە ناوچەکەی ئێمەو بەخوا هەرماڵەی بەلای کەمەوە پێنج شەش کەس کەوتەلامانەوە.. ئەم ناوچەیەی ئێمە دوای کەلافاوەکە گرتی یەوەو قوڕکرا بەسەرماندا چەندێ خەڵکی ناوچەکە گیرا ئەوەندەیش خەڵکی ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداخ لێرە وەك ئێمەیان بەسەر هات.. کەئەوان باسی وەزعی ناوچەکانی خۆیان کرد ئیتر هەربەجارێ هێز لەئەژنۆمان نەما هەر تۆقین.. خوا گیان چی بکەین نازانی لەدێیەکە بمێنیتەوە.. رووبکەیتە شارەکان.. نازانی سەری خۆت بۆکوێ هەڵگری..

ئەشیانووت ئەوەی بەرەو شارەکانیش رۆیشتووە هەمووی لەرێ و بانەکاندا گیراون و کەس نازانێ چیان لێیان کردووە.. هەموویان براون.. رۆژە رەشێ بوو هەرمەپرسە..

ناچار لەترسا دێیەکەمان چۆڵکردو چووینە ناو ئەو چەمو کەلوەزو هەردانە لەوێ خۆمان ئەشاردەوە چونکە رۆژانە لەناکاو تۆپیان ئەگردە دێیەکان یان کۆپتەر ئەهات و رەمی ئەکرد.. وامان بەباش زانی کەسەری خۆمان هەڵگرین و بڕۆین خۆمان بکەینە شارەکان و موجەمەعەکاندا لەماڵە خزم و ناسیاو خۆمان بشارینەوە تابزانین دونیاکە چی بەسەر دێت.. بەڵام

هیچ چارەیەکمان نەمابوو ماینەوەو چارەنوسی خۆمان دایە دەست قەدەر.. لەسەعاتێکدا دووسێ خەبەری خراپ ئەهات.. هەواڵی ناخۆشت ئەبیست.. یەکێ ئەهات ئەیووت ئەڵێن وەك پشتوێن لەکەرکوك و هەولێرو کۆیەو تەق تەق و چەمچەماڵ و ئاغجەلەرو دوکانەوە عەسکەری ریزکراوەو چواردەوری ناوچەکەیان گرتووەو نایەڵن تەیرێك رزگاری بێت.. یەکێ ئەیووت ئەڵێن ئەوانەی کەگیراون هەموویانیان بردووەو لەناو عارەبسان خستویانیانەتە ناو(شەتەوە). هەریەکی قسەیەکی ئەکرد.. خۆڵەرۆژی وادا قسەیەکی خێر نابیستی.. خەڵك گشتی سەری کردۆتە یەکداو هەمووی وەك یەك سەرگەردانە، کەس نی‌یە رێنمای کەس بکات، کەس لەکەس ئاقڵ ترنی‌یە، چونکە گشتی وەك یەك سەری لێشێواوەو کەس بەتەمای روح خۆی نی‌یە..

بەرۆژ ئەچووینە ئەو چەمو شیوانەو بەشەو ئەهاتینەوە ئاوایی.. ئەو ئێوارەیەی کەکۆمەڵە تەیارەکە بەدوای یەکدا هاتن و بەسەر دێیەکەی ئێمەدا رەتبوون و چاومان لێبوو کەچوونە سەرگۆپتەپەو رەمیان کرد.. ئێمە زۆرجار رەمی کردنی تەیارەمان بینی بوو بەڵام ئەمجارە رەمی‌یەکەیشیان جیاواز بوو یەکەمجار تەیارەکان هەندێ سوڕانەوەو هاتن و چوون و کەوتنە رەمی کردن دەنگی تەقینەوەکان گەورەتربوون و کەدوکەڵیان لێبەرز بووەوە رەنگی دوکەڵەکانیش جیاواز بوو.. ئێمەنەمان ئەزانی کیمیایی‌یە بەڵام هەربەزرمەکەی وتمان هەموو گۆپتەپەی تەواو کردووەو روح لەبەری تیا دەرنەچووە.. تەیارەکان گەڕانەوە..

هەموو خەڵکی ناوچەکە ترس و دڵەراوکێمان تێکەوت و خەریك بوو شێت بین لەتاوا بۆخەڵکی گۆپتەپەو نەشمان ئەوێرا بڕۆین بۆهەواڵ و بەهاواریانەوە.. چونکە هێشتا خۆری مابوو ئەترساین کۆپتەر بێت و رەمیمان لێبکات لەبەر ئەوە چاوەڕێ بووین کەخۆرئاوا بێ و ئەوجا بچین بزانین ئەو خەڵکەچی بەسەر هاتووە..

کەتاریك داهات خەبەری گۆپتەپەمان زانی کەکیمیایی لێی داوە ئیتر بەجاری تۆقین و هێز لەبەدەنماندا نەما وتیان قومبەلەکە بۆنی هاتووەو

ئەوەی بۆنی کردوە کوشتویەتی.. بایەکەیش بەناو خەڵکەکەدا بۆنەکەی بڵاو کردۆتەوە..

جاران کەتەیارە ڕەمی ئەکرد مەگەر پارچەی قومبەلەکە بەرت بکەوتایا ئەویش زۆرجار خەڵك پێوە ئەبوو بەڵام نەیئەکوشت و بریندار ئەبوو.. بەڵام ئەمجارە ئەڵێن تێکەڵ بەهەناسە کەتئەبێت و ئەو کوژێ.. ئێمە قەت شتی‌وامان نەدیبوو نەشمان بیستبوو کەحکومەتێ لەشەڕێکدا قومبەلەی وای هەبوو بێ‌و تەقاندبێتی‌و لەگەڵ هەوادا بێت و بتکوژێ.. وتیان کیمیایی داوەلەوژورەو لەقەرەداخ و لەهەڵەبجە، بەڵام ئەو وتنانەو ئەو بیستنە وەك ئەوەنەبوو لەوبەری ئاواییەکەی خۆمانەوەو بەبەرچاومانەوە بیتەقێنێ‌و ڕەنگە بەیانی‌و دووەی بیکاتە سەر ئێمەیشدا.. وەك مردن وابوو هەموو ئەزانین کەئەمرین بەڵام تائەو کاتەی لێمان نزیك نەبێتەوە لێی ناترسین..

ئەم قومبەلەیەیش وابوو.. شەو ئاگامان لێی بوو لەتەکیەوە لایتی سەیارە زۆر بەرەو ناوچەکە ئەهات ئیتر زانیمان جەیش حەرەکەتی کردووە.. لەترسا هەرشەو چوینەوە ئاوای‌و کەوتینە ماڵ شاردنەوەو نان‌و کەل‌وپەلمان لەگەڵ خۆمان هەڵگردو هەربەوشەوە کەوتینە ڕێ هەموو ئاوای بوینە دووبەشەوە بەشێکمان چووینە (چەم بابوڕشە) لەنێوان چوقلیجەو جەلەمۆردو بەشەکەی تری ئاوای چوینە (هەزارکانی) لەنێوان دارەقوتەو جەلەمۆرد.. لەو دوو چەمەدا خۆمان شاردەوە لەژێر ئەودارو کونە تەیارانەدا کەزوتر دروستمان کردبوون بۆخۆشاردنەوە.. ئەو هەموو ژن‌و منداڵەی ئاوای هەمووی خەریکە لەترسا هاروشێت بن، گشتی لەوچەمو دارانە خۆیان پەناداوە.. زیرەو هاواریان ئەگاتە نازانم بڵێم کوێ.. بەچی منداڵێك ژێر ئەکەیتەوە، ئەو ترسی ئەوەی لێنیشتبێ تەیارە دێت و ڕەمی لێ‌ئەکات..

تاخۆرئاوای سبەینێ لەوچەمەدا ماینەوە.. هەردەنگی تۆپ‌وگورەی تەیارە دێت و ئەزانین ئەمە ڕۆژەکەیە کە ، ئەترساین‌و کەس بەفریامان ناکەوێ‌و بەڵام خۆمان لەوچەمەدا شاردۆتەوە بەڵکو ئەمە خوایە بەسەرماندا

تیَ پەڕن و نەمانبینن و دیَیەکە بڕوخیَنن و بگەڕیَنەوەو خۆمان و ئەوژن و مناڵە بەسەزمانانە رزگارمان بێت..

تەنها دەسەلاَتی پاڕانەوەمان مابوو.. تەنها دالَدەمان قاپی خوابوو.. ئەمبینی وامناڵەکانیش لەترساو هەست بەمەترسیەکە ئەکەن.. ئەوانیش والەخوا ئەپاڕانەوەو فرمیَسکیان بەرئەدایەوە.. قاژەی جەرگم ئەهات.. گاوریان پیَموسوڵمان ئەبوو، بەلاَم دەسەلاَتم چیبوو..!!

کەخۆرئاوا بوو هەندیَ بەیەکدا هاتین و ئەبیَ تەگبیریَك بکەین و بەلایەکدا بچین وائەلَیَن ئەمرۆ جەیش هاتۆتە ناوچەکەو هەموو ئەو دیَهاتانەی ناوچەکەی تاگۆپتەپە روخاندووەو هەرکەسی دەست کەویَ ئەیخاتە سەیارەوەو ئەیبات، ئەلَیَن چەندیَ جەیش و جاش لەخوارەوە ئەگەڕیَن ئەوەنە کۆپتەریش بەئاسمانەوە چاودیَری ئەکەن و خەڵکیان کردوە بەژیَر خۆڵەوەو خانوویان روخاندووەتە سەر بریندارەکانی (گۆپتەپە)دا..

یەك دوو زەلام پەیابوون ناسیاو بوون وتیان ئەلَیَن (میرزای سمایل دارکیَش) کەموستەشار بوو خەڵکی خەرابەی کۆیە بوو وتویەتی باهەرچی زەلامیان هەیە بیَن و خۆیان بگەیەننە لایمن و تەسلیم من بن ئەیانپاریَزم و ئەیانکەمە چەکداری خۆم وعایلەکانیشیان بابیَن ئەیانبەم موجەمەعیان بۆئەکەم.. ئیَمەیش ئەو دووزەلامەی هاتبوون جیَی باوەڕبوون و ناسراو بوون، قەناعەتمان بەقسەکانیان کردو ناوی هەندیَ پیَشمەرگەی دیَیەکانی خۆمانیان ووت کەئەوانیش تەسلیم بەوبوون و پاراستویانیَتی ئیتر متمانەمان لادروست بوو بەڵکو ئەمە خوایە ئەوپیاوە ئەو چاکەیەمان لەگەڵ بکات و رزگارمان کات لەم رۆژە رەشە، لەم لیَقەومانە..

زووتر زۆر رقمان لەجاش بوو بشمانیان کوشتایا ئامادە نەبووین چەکی جاشایەتی لەشان بکەین.. بەلاَم ئەمرۆ لەتەنگانەدا بووین و بۆکرینەوەی روحی خۆمان رازی بووین و ئەشمان ووت خوا ئەکا ئەو پیاوە ئەو چاکەیەمان لەگەڵ ئەکات.. ئیَمەیش بۆئەوەی چاکەکەی بدەینەوە شەرتیَ هەتا ئەمرین ئەبیَ چەکی بۆهەڵگرین..

بەو دووزەلامەی هاتبوون رەزامەندی خۆمان نیشان داو لەسەر وەعدی ئەو کەوتینە رێ.. ئەقڵەکەمان ئەوەندە فەقیربوو باوەڕمان وابوو مستەشارێك بتوانێ داڵدەی هەموومان بداتو بمانپارێزێ.. ئێمە چووزانین ئەمە فێڵو تەڵەکەیەو هەرچی جاشیش هەیە دەسەڵاتی یەك عەسکەری نییە.. لەچەمەکە هاتینە دەرەوە هەموومانیان گردو بەشەکەی تری ئاوایشیان بەو شێوەیە هاوردو ئەو دووزەلامەیش مستەشارەکە هەڵی خەڵەتانبوونو ناردبوونی بەدوای ئێمەدا، ئەوانیش وەك ئێمە گیرانو لەئێمەیش خراپتریان بەسەر هات..

هەر لەچەمەکە دەرمانیان کردو بردمانیانە (چوقلیجە) سەیرمان کرد خەڵکی ئەوێش هەمووی گیراوە.. ئێمە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی ئاوای بووینو بەخوا کابرایەك هەبوو لەدێیەکەمان ناوی (حامید مولود)بوو گۆجیش بوو شێتیش بوو پێیان ئەوت (حامیدە گۆج) ئەویش گیراو دوای کەبردمانیانە (نوگرە) حەوت رۆژمانی لەخواردن گردو لەبرسا مرد..

ژنێکیتر هەبوو لەدێیەکەمان گەڵ دەمێك بوو نەخۆش بوو (بەگیسی وەلی) ناوبوو.. بەکۆڵ هەڵیان ئەگردو دایان ئەنایەوە ئەویش هەرگیراو تانوگرە هەر بەکۆڵ کوڕەکەیەوە بوو ئەویش لە(نوگرە) مرد..

من خۆمو دایکمو ژنو منداڵەکانمو برایەکم بەدوانزە سەرخێزانەوەو برایەکی گەنجیشم لەگەڵ خەڵکی ئاوایدا بەوشێوەیە گیراینو هەرلە(چوقلیجە) خستمانیانە ناو سەیارەی (زیل) عەسکەریەوەو بردمانیان بۆ(تەق تەق) لە(دەواجینەکەی تەق تەق) سجنمانیان کرد. بۆبەیانی جەیشەکە گەیشتبووە گوندەکەمانو بەشۆفڵ تەختیان کردبوو، سێ زەلامیش لەئاوایدا مابوونەوەو خۆیان شاردبۆوە گیرابوونو هەرسێکیانیان کەلەپچە کردبوو سواری کۆپتەریانیان کردبوو برد بوویانیانو تائێستاش هەواڵیان نییە.. ئەوانیش (١-خەلیل حاجی رەشید سلێمان ٢-حەیدەر محمد سلێمان ٣-میرزا ئەحمەد یاسین)بوون.. وەك باقی خەڵکی ئاوای ئەوانیش بێ سەرو شوێنن..

شەوێك لەدەواجنەكەی تەق تەق هێشتمانیانەوە عەسكەریەكی زۆری لێبوو. كەتەماشای هێزەكەت ئەكرد ئیتر ئەتزانی كەئەم حكومەتە نیازی چی‌یەو ئەتزانی كەئەم جارە دارو بەردی ئەم كوردستانە بەسەریەكەوە ناهێڵن.. ئەتزانی هێزەكە لەوەیا نی‌یە كەبەری پێبگیرێت، وارۆژێ دووان پێشمەرگە مقاوەمەتی كرد، قواتەكە لەحساب ناهاتو تەواو دڵنیا بووم كەهەموو ئەم میللەتە بەم دەردەی ئێمە ئەچێت..

بۆبەیانی ئێمەیان خستە سەیارەوە ئەو قافڵەی سەیارانە ئەتووت دەنك تەزبیحە بەدوای یەكەوە ئەمسەرو ئەوسەری دیار نەبوو بەرێمانیان خستو حیمایەكی زۆر لەپێش‌وپاش سەیارەكان‌و هەرسەیارەیەكیش عەسكەرێك‌و دووان بەتفەنگەوە بەدیارمانەوە وەستا بوون.. سەعات ٦ی ئێوارە گەیاندمانیانە (تۆبزاوا).. تۆبزاواچی هەرچی كورد هەیە لەوێ بوو.. بڕوابكە ئەتووت رۆژی حەشرەو قیامەت هەستاوە دەرزیت هەڵدایا بەزەوی نەدەكەوت.. ئەم وەجبە سەیارە خۆی ئەكردە ناو مەعەسكەرەكەدا وەجبەیەك دەرچوو.. ئەم وەجبە دائەگیرا. وەجبەیەك بارئەكرا.. مەعەسكەرەكەیش گەلێ گەورە بوو حەوشەیەكی گەورەی هەبوو چواردەوری تەلبەند بوو جێگای ئەم هەموو (شێخ بزێنی‌یەی تیائەبووەوە).. كۆمەڵێ قاعەی درێژ درێژی لێبوو هەمووی پڕكرابوون لەخەڵك..

حەوشەكەیشی پڕی خەڵك بوو.. خەڵكی هەموو ناوچەكانی كوردستانت دەبینی.. هەر بەجل‌و بەرگ‌و جامەدانی یەكانیان دەمزانی خەڵكی چی‌ناوچەیەكن..

لەچەند شوێنێكەوە بەریز خەڵك رێكدەخراو ناویان دەنوسرا.. ئەوی دەفتەر نفوسی پێ بوایا لەسەر دەفتەری نفوسەكەی‌و ئەوی پی‌ی نەبوایا بەكەیفی خۆیان تەمەنیان بۆدادەناو بەپی‌ی ئەو ناونوسینە لێكتر جیادەكراینەوە.. زەلامی گەنج بەجیاو پیرە مێردو پیرێژن بەجیاو ژن‌ومناڵی وورده بەجیاو كچە جوان‌و جەهێلەكانیش بەجیا.. ئەوخەڵكە دەكران بەچوار فیرقەوە.. بەچوار بەش‌و هەرلەویا خەڵكی ئاوای ئێمەیش هەموو

لەیەکتر جیاکراینەوە.. چەندێ هاوارمان کردو هەوڵماندا سودی نەبوو.. خێزانی وابوو بەرهەر چوار بەشەکەی دەکەوتن.. بەبەرچاو خۆتەوە کورەگەنجەکەتیان پاڵ دەنایە ناو گەنجان و کچە جهێلەکەت بۆناو کچان و ژن و منداری بۆناو ژن و منداران و بۆخۆشت بۆناو پیرو پەککەوتەکان پەکلێش دەکرای..

وای لەو کاتەی تۆبزاوا کەچەند زەحمەتە تۆ جەرگەکەت، ناموسەکەت، بەزۆری لێزەوت بکەن و لەیەکتر جیاتان بکەنەوەو هیچ دەسەلاتێکیشت نەبێ.. یاخوا ئەوەی بەسەر ئێمەدا هات گاورو جولەکەیش بەسەری نەیات.. یاخوا دوژمنیش ئەوەی بەسەر نەیات.. ئەتووت مەڕو بەرخ لەیەك دائەبڕن ئاوا دایك و جەرگەکەیان لەیەك جیائەکردەوە.. زیڕەو هاوارو ونزولەی ئەو خەڵکە گەیشتە کەشکەلانی فەلەك.. بەلام کەس بەفریای ئەم کوردە داماوە نەکەوت..

من خۆم ئێستاش ئەو دیمەنە لەبەرچاومە کەچۆن مناڵەکانمانیان لێم جیاکردەوە چۆن پەلی یەکترمان رائەکێشا و ئەتووت دەمارێك لەناو دڵمەوە رائەکێشن کەعەسکەرەکان بەزۆر پەلیان رادەکێشت..

بەو حاڵە ئەو هەموو خەڵکەیان لەیەکتری جیاکردەوەو هەرکەسەو لەگەڵ سنفی خۆیدا بۆئەو قاعانە بەرێمانیان کرد کەبۆمان دەست نیشان کرابوو.. بەلام سەرم لەوە دەرناچوو زۆریان پەلەبوو نازانم پەلەی ئەوەیان بوو خەڵك تربەرێگاوە بوون.. نازانم یان ئەیانویست زووبمان بەن و کەس نەزانێ و بمانکوژن..

هەر ئەو شەوە خراینە قاعەکانەوە.. بەلام تابەیانی لەتاو ئازاری دابڕان و لەیەکتر جیاکردنەوەمان ئاگامان لەدونیا نەبوو ئاگامان لەهۆش خۆمان نەبوو تابەیانی هەرئەمان لورانەوە لەتاوا.. خۆزگە بۆمەرگیش بوایا هەرپێکەوە ئەبووین.. جیاکردنەوەمان هەر سەعاتێکی مردنێ بوو..

تەنها یەك شەو لەتۆبزاوا ئێمەیان هێشتەوەو بۆبەیانی سەیارەیان هێناو ئێمەیان بارکردو گواستمانیانەوە، سەیارەی مونشەئەیان هاورد بارمانیان

کرد.. بەلاّم لەتاوا ئاگامان لەخۆمان نەمابوو بەخوا نەئەزانم چەند سەیارەبووین و نەئەزانم سەیارەی چەند کەسیان تیٚکرد، نەئەزانم کەی بوو خستمانیانە ریٚ..

بەلاّم ئەوەندە ئەزانم لەدەرك قاعەکە سواری سەیارەمانیان کردو کەوتەڕیٚ و ناموسەکەمان و بجەرگەکانمان لەویٚ جیٚهیٚشت.. (دامانە دەست خوا)

ئینسان تاناخۆشی زیاتر ببینیٚ ئەوەی پیٚشتری لائاسان ئەبیٚتەوە.. ئیٚمە کەگیراین زۆر ناخۆش بوو بەلاّم هاوردمانیان بەرەو کەرکوك لامان ناخۆشتر بوو ئەمانووت دورمان ئەخەنەوە لەناوچەکەی خۆمان و دیارە نیازیان خراپە.. کەلەتۆبزاوا لەیەکتر جیامانیان کردەوە ئاگر کەوتە هەناومانەوەو خۆزگەمان ئەخواست هەتامردن سجن بین بەلاّم بەیەکەوە بوینایا...،. کەلەتۆبزاوایش گواستمانیانەوە ئەمووت خۆزگە دەسالّی تریش سجنبم بەلاّم هەر لەتۆبزاوا بوینایاو ئەوان لەقاعەیەکی ترو من لەقاعەیەکی‌تر، خۆلەپەنجەرەکانەوە چاومان بەیەکەوە بوو..

ئیٚستایش وائەمانبەن خوا ئەزانیٚ بۆکویٚمان ئەبەن و چی‌خراپتر ئەبینین.. رۆی تۆبزاوامان جیٚهیٚشت و هەر ریٚگای کردو هەر نەبرایەوە.. تاهەنگاویٚ زیاتر لەتۆبزاوا دور ئەکەوتەوە ئازاریٚ زیاتر ئەکەوتە ناوجەرگمەوە.. شەومان بەسەردا هات و ریٚگا هەرتەواو نەبوو.. نازانم ئەتووت بۆئەو پەڕی دونیامان ئەبەن.. کەوتینە هیلاکەت لەتینواو بەفەتارات چووین لەبرسا، ریٚگا هەر ئەوسەری نەبوو..

هەر شەو بوو روناکی دەرکەوت وەك چراخان ئەدرەوشایەوە لەدورەوە.. ئیتر نازانم هی‌ئەوە بوو دونیا هەمووی تاریك بوو تەنها ئەو گلّۆپانە ئەسوتان یان هەر خۆیان واشەوقیان گەورەبوو..!

لەدورەوە ئەدرەوشانەوە.. لەتاریکی‌دا هەموو روناکی یەك جوانە.. گەرچی ئەوە سجن بوو قەلاّیەکی گەورەبوو پڕبوو لەکورد.. (نوگرە بوو نوگرە) قەلاّی نوگرە بوو.. بەلاّم ئەو شەوە روناکی‌یەکی گەلیٚ جوان بوو..

بردمانیانە ئەویٚ قەلاٚکە هەندیٚ لەشوێنی بەرز دروست کرابوو، وەك بان گرد وابوو.. بەسەیارەکانەوە سەرکەوتنە سەرگردەکە.. قاپی قەلاٚکە ئەوەندە گەورە بوو ئەو سەیارە گەورەو درێژانەی ئەخوارد هەموو سەیارەکان چوونە ژوورەوە.. حەوشەیەکی گەلیٚ گەورەی هەبوو.. وابزانم دووقات بوو لەسەریەك دروست کرابوو کەئەچویتە ناو حەوشەکەی ئیتر لەئاسمان زیاتر هیچ شوێنێکی ترت لێوە دیار نەبوو..

تابەیانی لەناو ئەو حەوشەیە هێشتمانیانەوە.. کەخوا رۆژی کردەوە ئەوجا بینیمان کەئەو قەلاٚیەش پڕیەتی لەخەڵك.. نازانم ئەمانەیان کەیو لەکوێوە گەیاند بووە ئەویٚ.. ئێمەیشیان بەپێی ناونوسین، دابەش کردە سەر قاعەکاندا.. رەنگە بڵێم هەر قاعەی ٢٠٠ کەس زیاتری تیابوو.. نازانم بڵێم چەند قاعەبوو.. بەلاٚم چەنیٚ لەقاتی خوارەوە بوو ئەوەنەیش لەسەرەوە دروست کرابوو بەگەورەی قەلاٚکەیش ژێری ژێر زەوی بوو.. ئەوەندە حەوشەکەی گەورەبوو لەمبەری قەلاٚکەوە بۆئەوبەری خەڵکت نەئەناسیەوە.. لەیەکەوە دوور بوونو قەلاٚکە بەخڕی دروست کرابوو چوار دەوری هەمووی قاعەبوو رویان کردبووە یەکتریو لەوە ئەچوو ئەم قەلاٚیە هەربۆ سجن ئاوا کرابیٚ یان کەدروستیان کردوە رەنگە هەر ئەوکاتە بۆکورد دروستیان کردبیٚو بەتەمای ئەو رۆژە بووبێتن.. ئەگینا ئەو قەلاٚیە بەوە نەبوایا بەهیچ پڕنەئەبووەوەو بەکەڵکی هیچیتر نەدەهات..

ئەو کاتە هەژدە بۆبیستی مانگی رەمەزان بوو لەجیاتی ئەوەی بەزەییان پێماندا بێتەوەو سور ئەزانن ئێمە هەموو موسوڵمانینو لەهەموو تەمەنماندا سەرمان چوبیٚ نوێژمان نەچووەو لەوەتەی خۆمان ناسیوەتەوە بەرۆژو بووینو رۆژمان لیٚنەخواردوە.. کەچی هیچ حورمەتی ئەو مانگە پیرۆزەیان نەگردو هیچ بەزەییەكو هیچ رەحمێکی خوا لەدڵیاندا نەبوو.. بەئەندازەیەکی خراپ ئەمانیان چەوساندەوە..

باس و بەسەرهاتی (نوگرە) تەواو نابێ.. تابلێی بۆمان خراپ بوون.. تابلێی زاڵم بوون لەگەڵماندا.. نان نەبوو ئاو نەبوو هەر مردین لەبرسا، کوێر بووین لەتینوا.. لەگەرما پیشاین..

رۆژی یەکجار خواردنیان ئەداپێمان ئەویش سەمونێکی عەسکەری زۆر رەق بوو لەگەڵ هەندێ ئاوی گەرم و تاڵ ئێمە بەرژیانمان ئاوی واتاڵمان نەدی بوو.. ئاوەکەیش رۆژانە بەتەنکەر بۆمان ئەهات و لەحەوشەکە ئەیانکردە ناو تانکییەوەو ئیتر ئەبوو چەند سەعاتێك نۆرە بگری تائاوت بەرئەکەوێت.. هەر بۆئەوەی زیاتر ئازارمان بدەن و بمان چەوسێننەوە. لەکاتی نۆرە ئاوەکەدا ئەهاتن بەسۆندەوە ئەکەوتنە ناو ئەو خەڵکەو لێیان ئەدا.. سۆندەکانی دەستیان نوکەکەی ئاسنی تیابوو بەرهەر شوێنێکت بکەوتایا ئەتووت فیشەکە ئەوەندەی ئازاری هەبوو.. خوا ئاگادارە خۆم جارێکی سۆندەیەکیان داوەتە بان پشتم و لاقە برغەم داو ئەوە لەوکاتەوە تائێستا هەر شوێنەکەی ئەوەندەی جێ مشتێك ئەبێت رەشەوە بووە،،

رۆژێك هەرلەو سەرەگرتنەدا بۆئاو یەك سۆندەی لەوەی دەستیان دالەژنێکی خەڵکی ئاوای خۆمان بەتەنیشت منەوە راوەستابوو بۆئاو.. جێ وەجێ کوشتی.. ژنەکە ناوی (فاتم محمد لاوە) خێزانی (خالید حەمەخان)بوو هەردوای ئەوەی دایان لەقەبرغەی ناو زگی بڕی و کوشتی..

پیرە ژنی واهەبوو سەرسپی یان پیرەمێردی وای‌تیابوو دوو عومری منی هەبوو، لەتری ئەدا ئەڕۆیە رێوە.. کەلێیان ئەدا تاسەعاتێ دوای ئەوەش لەو عەرزەدا ئەکەوت و ئەکوروزایەوە، کەس لەترسا نەیئەوێرا بچێتە دیاری.. چونکە بەدەنگ هەرکەسێکەوە بچوایای تەعزیبتیان ئەدا.. بەخوا بەچاو خۆم دیوومە هەندێ عاموود لەناو حەوشەی قەلاکەبوو زەلامیان سەرەو خوار پیا هەڵواسیوە تامردووە.. کەس نەیئەوێرا بچێتە دیاری.. یان ئەیانبرد لەبەر خۆرەکە ئەیانبەستەوە هەتا لەگەرما ئەتاسا.. کورە شتی وایان ئەکرد گاور نەیکردوە..

شتی وات ئەبینی قەت رووی نەداوە.. ژن و مێردێك هەردووکیان خەڵك ئاوای ئێمە بوون، خۆیان بەتەمەنبوون و پێنج منالیان پێبوو.. خۆیان و شانسیان لەتۆبزاوا لەبەر ئەوەی هەردوکیان پیربوون مناڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیان نوسی و لە(نوگرە) بوون.. یەکەم جار باوکە کەیان مرد دوای دایکەکەشیان مرد.. باوکیان ناوی (غەفور ئەحمەد مصطفی)بوو دایکیان ناوی (تێلی واحید محمد)بوو ئەو پێنج مناڵە بێ دایك و باوکە لەوێ مابونەوە خەریك بوو جەرگم دەرچێ بۆیان زەلیل بوون ئەوەندە رەزیل بوون گاوریان پێ موسوڵمان ئەبوو کەچی ئەو زاڵمانە بەزەیان پێیاندا ناهاتەوە کەسێك نەبوو هەڵپەی قومێ ئاویان بۆبکات.. لەوێ کەس بەکەس نەبوو کەس بەفریای کەس ناکەوت رۆژە رەشێ بوو..

من دایکم لەگەڵمان بوو لەوێ بەخوا لەبرسا وردە وردە وشك بۆوەو مرد.. کاتێ مردو کەتەرمەکەیمان بردە دەرەوە لەقەلاکە گەرچی کەخەڵك ئەمرد هەندێ زەلامی خۆمان بەگوروتین تربوون لەئێمە هەر ئەوان ئەیانبردە دەرەوە.. کەدایکم مرد خۆیشم لەگەڵیاندا چوومە دەرەوە ئەوکاتە زانیم کەمردوەکانمان ئەدرێتە سەگ.. من لاشەی دایك خۆمم بینی بەدەم سەگەوە.. ئیتر ئازارو پەت پەتی هەیە لەدونیادا لەوە ناخۆشتر..!!

کێ ئەمرد لاشەکەی ئەبووە خۆراکی سەگ.. هیچ نەبوو چاڵی پێبکەیت.. هەروا قلێ لمت ئەکردە سەر لاشەکەیدا لەولاوە سەگە رەش لمەکەی لائەداو لاشەکەی هەڵئەدڕی..! سەگەکانیش هی(عوربان)بوون کۆمەڵێ رەشماڵ بوون لەولای (نوگرە)وە دیاربوون سەگەکان هی ئەوان بوون... جگەلەو رەشماڵانە هیچیترت نەئەبینی لەدورەوە (سەلمان) دیار بوو ئەویش قەلاکەی دیار بوو لەناو سەلمانیش قەلایەکی تریش وەك ئەوەی (نوگرە) هەبوو ئەیانووت ئەویش پڕیەتی لەسجن، سایەق تەنکەرەکان وایان ئەووت کەئاویان بۆمان ئەهێنا ئەوان ئەیانووت قەلایەکی تریش وەك ئێرە هەیە خەڵکی تریش وەك ئێوەی تیا سجنە.. مەگەر خوابزانێ لەچەند شوێن

سجنی هەبووە، ئەگینا ئەو هەموو خەڵکەی تۆبزاوا لەکوێ جێگایان ئەبووەوە ئەگەر کۆمەڵە قەڵایەکی وای نەبووبێ..!

زۆر سەیر بوو هەرجارە ناجارێك هەندێك سەیارە ئەهات‌و وەجبەی تریان ئەهێنا.. چەنێکمان لێ‌ئەمرد ئەوەندەی تریان بۆئەهێنا.. هەبوو تازە گیرابوو هەبوو لەسجنی ترەوە نەقڵیان ئەکرد بۆلای ئێمە..!

جارێکی پێمانیان ووت دووسێ رۆژی‌تر جەژنی قوربانە.. دڵمان خۆش بوو بەڵکو بەبۆنەی جەژنەوە عافواتێ بدات‌و بەرمان بدەن یان هیچ نەبێ ئەو دووسێ رۆژەی جەژن لەگەڵماندا باشتربن‌و بەڵکو هیچ نەبێ هەرخواردنێکی باشمان بدەنێ..!!

کەچی ئەو دووسێ رۆژەی جەژن هەرکوشتمانیان لەتینواو لەبرسا بای ئەوە سەمون‌و ئاوەکەیان ناهێنا هەروەك جاران بمانبدەنێ نیوەی ئەو خەڵکەی خستە هیلاکەت.. زۆر کەس لەوسێ رۆژەدا لەتونیدا خنکان‌و لەبرسا مردن..

رۆژێك عەسکەریەکان هاتنە ناو حەوشەکەوە کردیانە تەقەکردن.. وتمان بەڵکو ئەمە خوایە عافوات بێت‌و بەرمان بدەن وائەم عەسکەرانە تەقە ئەکەن..، یان شێك بووبێ گشتمان نەجاتمان بێ.. کەچی وتیان شەڕی ئێران‌و عێراق وەستاوەو تەقەکانیان بۆئەوە بووە.. شەڕ وەستان بەئێمە چی. ئێمە چاوەڕێی دەروپەکی خێر بووین ئەو هەموو رەزالەتەی دیبوومان هەموو شتێکی لەبیرمان بردبوو‌ەو تەنها خەمی خۆمانمان بوو.. کوڕو مناڵەکان‌و ناموسەکەیشمان لەبیر چوبوو‌ە، مەگەر ئەو کاتانەی کەوەجبەیەکیان ئەهاورد ئەکەوتنەوە یادمان‌و ئەمانووت بەڵکو خوایە لەناو ئەم وەجبەیەدابن‌و ئەوانیش بهێنن بۆلای ئێمە باهەمووومان پێکەوە بمرین‌و سەگ بمان خوات..

بەڵام هەر وەجبەیەکیان ئەهاورد هەمووی ئەختیار بوون‌و دیاربوو ئەم قەڵایە بۆپیرەکان بووەو خوا ئەزانێ گەنجەکانیان چی‌لێ کردووە..

رۆژێك وەجبەیەکیان هێنا پاك‌و تەمیس تر بوون لەئێمەو عایلە بوون پێکەوە.. لەوە ئەچوو تازە گیرابێتن..

کەقسەمان لەگەڵیان کرد، سەیرمان کرد هەڵەبجەیی بوون کاتی خۆی کەحکومەت بەکیمیایی داوێتی لەشارەکەیان ئەمانە رایان کردۆتە ئێران ئێستا بەحساب عافواتی بۆیان دەرکردبوو، سەیارەی ئێرانی هێنابویانی تاحدوودو حکومەت سەیارەی ناردبوە پیریانەوە هێنابوویانیەوەو پێ‌یوتبوون ئەتانبەین بۆ موجەمەع‌و تەعویزتان ئەدەینەوەو لەدایرەکان داتان ئەمەزرێنین..کەچی هەر یەکسەر هاوردبویانیان بۆلای ئێمە بۆ(نوگرە).. مانگی پایز بوو ئەمان هاتن ماوەیەك دوای ئەوەی کەوتم تەقەکراو وتیان شەڕ عێراق‌و ئێران وەستاوە، مانگێ دوای ئەوە ئەبوو..

ئەو هەڵەبجەیانە کەهاتن کەل‌و پەل‌و خواردنیان پێ‌بوو ئەوان وەك ئێمە نەگیرابوون بەشێوەی ئێمە نەیانیان هێنابوو هەر بەسەیارە لەئێرانەوە کەهاتبوونەوە چیان پێ‌بوو بوو هەموویان هێنابوو بۆ(نوگرە)..

زۆر بەکەڵکمان هاتن‌و قاپ‌وقاچاغیان پێ‌بوو چێشتیان کردو چێشتیان داپێمان‌و نانیان دابەئەو خەڵکە.. بەخوا خێرێکیان دەست کەوتووە بەوەی کەچێشتیان داپێمان بەسەد زیارەتی (حەج) ئەوەندە خێرت دەست ناکەوێ.. ئێمە رەنگ‌و تام‌و بۆنی خواردنی ترمان لەبیر چووبووەوەو ئەوەندە ئاوی تاڵ‌و سەموونی بێ‌خوێ‌و رەقیان دابوو پێمان..!!

دوای ئەوەی هەڵەبجەییەکانیان هاورد یەك دووجاریش ئەهاتن بەناو خەڵکەکەدا ئەکەوتنە گەڕان‌و هەرکەسێ خۆیان ئەقڵیان بیگرتایا ناوەکەیان ئەنوسی‌و وابزانم دوو وەجبەیان بەوشێوەیە لێمان گواستەوەو کەس نەیئەزانی بۆکوێیان ئەبەن.. بەڵام دوای کەخۆمان هاتینەوە زانیمان کەئەو دوو وەجبەیەشیان بەردا بوو..!

ئێمەیش ئەوانەی وادواجار بەرمانیان داو ئیتر لەدوای ئێمە کەسی تری بەرنەدا، ئێمە لەمانگی یانزە بەربووین شەش مانگ‌و پانزە رۆژ لە(نوگرە) بووم..

رۆژێك هاتن لەناو قاعەکانی ئێمەیش هەندێ ناویان نوسی و رۆیشتن، دووسێ رۆژی پێچوو هاتنەوە.. ئەو ناوانەی نوسیبویان بانگمانیان کردە حەوشەکەو کاتێکمان زانی هەندێ سەیارە پەیا بوون و هاتنە ناو حەوشەکەوە.. سواری ئەو سەیارانەمانیان کردو بێئەوەی بزانین بۆکوێیە کەوتنە رێ.. بەلاّم بەخوا بۆناو جەهەنەمیش بوایا هەر لە(نوگرە) خۆشتر بوو..

هاوردمانیانە مەعەسکەرێك لەسەماوە، ماوەی پێنج رۆژ خزمەتمانیان کرد.. حەمام و تەراش و خواردنی باش.. ئیتر نەمان زانی دنیا گۆڕابوو چیبوو.. دوای زابتێك وتی زووتر دوو وەجبەیان بەرداوە شێوەیان زۆر ترسناك بووە.. ئێوە تێر ئەکەین و قەڵەوتان ئەکەینەوەو ئەتانبەینەوە.. گاڵتەی پێمان ئەکرد.. ئەیووت وەك حەیوان چۆن دائەبەستن ئێوەیش ئاوا دائەبەستین هەتا قەڵەو ئەبن.. بۆخۆتان ئازابن زوو قەڵەو بن و بڕۆنەوە..!!

دوای ئەو پێنج رۆژە خستمانیانە ناو سەیارەوەو هاوردمانیانەوە بۆ تۆبزاوا.. ئاخ تۆبزاوا بۆئەو شوێنەی لەگەڵ جەرگەکانماندا جیاکراینەوە.. شەو بوو گەیشتینە ئەوێ.. تابەیانی لەوێدا هێشتمانیانەوە زۆر چاوم گێڕدا ئەمووت بەڵکو خوابکات مناڵەکانم لێرەبن.. بەیانی لەگەڵ خۆرکەوتندا خستمانیانەوە ناو سەیارەو بەرەو سلێمانی هاوردمانیان و پاشان هاوردمانیانە قایم قامیەتی چەمچەماڵ و لەوێ بەکەفالەت بەرەلاّمانیان کرد..

کەس وکار هەمووی تیاچووەو کەس نەماوە ماڵە ناسیاوێك لە(تەکیە) گرتمانیانە خۆیان هەتا راپەڕین و دوای ئەوەی رامان کردە ئێراندا و هاتینەوە.. من یەکسەر هاتمەوە بۆدێیەکەی خۆمان و لەوکاتەوە تائێستا لێرە ئەژیم..

بەلاّم بەخوا هەر بەروح زیندوم.. هەموو رۆژێك و لەهەموو شوێنێکی ئەم ئاواییەدا شوێنی مناڵەکان ئەبینمەوە، بەدەست خۆم نییە (تۆبزاوا) ئەکەوێتەوە بەرچاوم و وەك ئەو دەقەیەی لەیەك جیاکراینەوە ئازارم ئەدات.. زۆر زەحمەتە ژن و مناڵ و براو برازاو بووك و خوارزا، بیست و چوار کەسم

بێسەرو شوێنە.. بیستو چوار کەس هەر بەدەم ئاسانە.. هەریەکەیان بۆخۆی جۆرێك ئازاری خۆی هەیەو وەك برینێك وایە لەجەرگمداو هەموو رۆژێ ئەکولێتەوە..

هەرچەندە من خۆم مەرگی زۆر کەسم بینیو ئەزانم ئەوەی لەوێ بێ چۆن ژیاو چۆن مرد.. بەلاَم قەت ناتوانم بێ ئومێدیش بمو هەر ئەڵێم بەڵکو خوابکات ئەمە دنیایەو خەبەرێ خێریان بێتو بێنەوە.. هەمیشە چاوم هابەڕێو گوێ قولاَغم بۆ هەواڵێك کەباسی ئەنفال بکات..

بەخوا هەر ئێمە بەرگەی ئەو ئازارە ئەگرینو شێت نابین ئەم دێیەی تۆ ئەیبینی چوار سەدو یەك کەسمان ئەنفالەو زۆربەی هەرە زۆریشی ژنو منالٚ بوون..

دێیان رووخاند ماڵیان سوتاند، زەلامیان بردو بەبەرچاوی خۆمانەوە دەستو چاویان بەستنەوەو خرانە سەیارەی سەرداپۆشراوەوە.. بەهەمووی بەقەدەر ئەوە نەبوو کەمناڵە کۆرپەکان لەناو سجن لەباوەشمان برفێنن و بیان بەن.. ئەوە لەئێشی بنیادەم ناچوو..

# ئینجی رەحمان عوسمان

لەدایك بووی ساڵی ١٩٢٢، گوندی حەمك

ناوچەی جەباری سەربە ناحیەی قادر کەرەم.. رۆڵە من گەلێ گەورەم لەعومردا لەزەمان مەلیکەوە لەبیرمە، کەس وەك ئەم زاڵمە نەبووە.. دەردە



سەریم زۆر دیوە لەژیانا بەلاَم هیچی وەك ئەنفال نەبووە.

ماوەیەك بوو دەنگو باس وابلاَو بووبووەوە ئەیان ووت حکومەت ئەو ناوچانەی ئەو ژورەی هەموو روخاندوە خەڵکەکەی گرتووە.. ناشوکری خوا نەبێ ئێمە هیچ شوێنێکمان نەبینی بوو نەمان ئەزانی ژویرو خوار کوێیە.. بەلاَم ئەیانووت لای سلێمانیو قەراغی هەمووی وێران کردووەو ئەڵێن ئێمەش وەودەرزە ئەبات..

چەند رۆژێك کۆپتەر وەك دالاش بەئاسماندا ئەهاتو ئەچوو. خەڵکەکە ئەیانووت چواردەوری ناوچەکەی هەمووی گرتوە.. بەکۆپتەریش جێش و جاش ئەباتە سەر گردە بەرزەکان و سەررێگاکانی.. ئیتر رێگای هاتوچۆکردن بۆشار نەمابوو خەڵك لەشارەکان بەوحاڵەیان ئەزانی و کەس نەیئەوێرا بێتە ناوچەکەو لەدێیەکانیشەوە رێی دەرچونمان نەبوو تابەرەو شارەکان یان بەرەو ناوچەی تر برۆین. من لەتاریخ و ماریخ نازانم هەروا پانزە بۆ بیست رۆژێك ئەبوو نەورۆزمان کردبوو کەلێمان قەومیا.. کەس نەئەپەرژایە سەر کەس، برابەفریای برا نەئەکەوت.. هەرکەسەو هەوڵی ئەوەی ئەدا خۆی لەم لافاوەرزگار بکات.

ئێمەماڵی دوو کوڕو کچێکمان لەگەڵدا بوون (احمد حمە علی) کوڕم خۆی و خێزانەکەی و ٩ منالْ بوون ماڵی (فکری) کچیشم ٦ منالی پێبوو... شەو لەدێیەکەی خۆمان دەرچووین بەرەو ئەو هەردەو هەڵەتانە خۆمان شاردەوە.. چونکە خەڵکەکە ئەیزانی کەجێش دەوری ناوچەکەی گرتوەو دێ بەدێ هەمووی ئەڕوخێنێ و خەڵکەکەشی ئەگرێت و ئەیبات..

شەوکەچووینە هەردەکە من خۆم و ماڵ و منالەکانمان کەوتینەڕێ بەرەو لەیلان هەربەپێ بەو بنارکەن و کەلۆزانەدا رۆیشتین، بەشکوو ئەمە خوایە رزگارمان بێت و بگەینە شار. شەو هەرڕێمان کردوو نەوەستاین بەلام خەریکە زیڕە بکەین هەروا زرمەی تۆپ دێ و گوڕەی سەیارەیە بەورێگاو بانانەدا دێت و دەچێت..

ئێمە ئەوەمان دابووە چاو کەئەمشەو بەدزیەوە خۆمان لەوچوار چێوەی جێش و جاشە رزگار کەین و بگەینە نزیك لەیلان تالەوێوە بچینە کەرکوك. چونکە ماڵ کچێکم لەکەرکوك بوو.. بۆبەیانی جاش بینیمانی گرتمانیان.. پێش ئێمەش و دوای ئێمەش کۆمەڵێ ماڵ و منالی تریان گرتبوو کەلەدێیەکانەوە خۆیان دزی بووەو وەك ئێمە بەهیوا بوون رزگاریان بێت و نەگیرێن.. هەر لەکەرکوکەوە بۆ لەیلان و قادر کەرەم و بەرەو ئەو گەرمیانەو ئەیان ووت لەکفری و کەلارو چەمچەماڵیشەوە وەك بازنگ تەوقی ناوچەکەی

کردەوە.. بۆ هەرلایەك بچویتایە هەرئەچویتە بەردەم ئەو جێش و جاشێلە.. ئێمە کەگرتمانیان عەسکەریان تیانەبوو هەمووی جاش بوون.. جاش (دەوریّ خراوی گێڕا ڕۆڵە) ئەیانتوانی نەمان گرن و نەجاتمان بێت.. بەڵام ئەتووت بۆ ماڵ خوای ئەکەن..

دامانیانە پێش و بردمانیان بەرەو لەیلان لەهەردەیەکدا خڕمانیان کردەوەو پەیتاپەیتا خەڵکی تریان لەوشیوو دۆڵانە ئەگردو ئەیان هێنا..

هەر لەوێ کەوتنە ناومان هەرچی نێرینە هەبوو جیایان کردەوەو ئەوانیان برد بۆ مەعەسکەری لەیلان.. ڕۆژێکی گەڵ ناخۆش بوو هەموو جەرگەکانمانیان بەبەر چاومانەوەبرد.. لای خۆی ئەوانە کورد بوون زۆر تکامان لێیان کرد یان خۆشمانیان لەگەڵدا بەرن یان ئەوانیش هەر لەگەڵ ئێمەدا بهێڵنەوە.. بەڵام فایدەی نەبوو.. جاشێك ئەیووت ئەیانبەین عافواتمان بۆیان وەرگرتووەو ئەیانهێنینەوە.. یەکێ تر ئەیووت ئەیانبەن تەسلیم حکومەتیان ئەکەن ئەڵێن ئەمانە هەمووی (ئێرانین).. هەریەکی قسەیەکی ئەکرد.. زەلامەکانیان بردو ئێمەشیان هێشتەوە، ئیتر نازانم چاوەڕێی چیان بوو وائێمەیان هێشتەوە..

وەرە بەبەرچاو خۆتەوە ئازیزترین خەڵکت بەرن و هیچ دەسەڵاتێکت نەبێت.. بەڵام ڕۆژە ڕەش بوو شعورمان لەلای خۆمان نەمابوو.. ئەگینا حەق بوو هەرلەوێ هەموومان خۆمان بکوشتایە..! من لەگەڵ سێ ژنیتر (ئاسکەو وەزیرەو نەسرین) خۆمان لەو خەڵکە جیاکردەوەو فرسەتمان بینی بەرەو کەرکوك کەوتینە ڕێ.. زوتر زەلامەکانیان بردو خۆشمان ئەو قەوم و قیلەیەی ترمان بەجێ هێشت.. بەخوا لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا قاژەیەك ئەکەوتە جەرگمەوە.. بەڵام چی ئەکەیت رووح شیرینە.. بەهەر ترس و لەرزو هیلاکەتێك بوو گەیشتینە کەرکوك، لەگەڕەکی (شۆریجە) من ماڵی کچێکم ناوی (گورجی) بوو لەگەرەکی شۆریجە بوو ژنی جەبار بوو، من چوومە ماڵی کچەکەم و ئەو ژنانەی لەگەڵم دابوون چوونە ماڵە هاوسێکانیان. وتمان باهەموومان پێکەوە نەبین و تائاشکرا نەبین و قوڕنەکەین بەسەر ئەم

ماڵانەشدا.. چونکە حکومەت هەڕەشەی ئەوەی ئەکرد کەس نابێ هیچ کەسێ بگرێتە خۆی.

ڕۆژی یەکەم لەماڵ کچەکەم بوومو هیچ دەنگو باسێ نەبوو، کەمێ هیلاکی ڕێگەمان دەرچوو ئەوکاتە هەستم ئەکرد چی کارەساتێکمان بەسەر هاتووە.. کەمێك کەوتبومەوە هۆش خۆم ئەوسا ئەمزانی ئەمە چیکۆست کەوتنێکە.. کوڕو کوڕەزاو براو هەرچی زەلاممان هەیە ڕۆییو ئەو هەموو ژنو منالانەش مەگەر خوابزانێ بەو دەشتەوەو لەناو ئەو هەموو تۆپو تەیارەیەدا چیان لێ دێت..

زاواکەیشم دەنگو باسی ناوشاری هاوردەوەو ئەیووت حکومەت هەر جێش ئەبات بەرەو ناوچەکەو هەروا کۆپتەر ئەڕوات بەرەو قادر کەرەمو قەرە حەسەنو دێتەوە.. دەنگو باس گەلێ خراپەو ئەلێن جێش ئەگاتە هەر دێیەك ئەیسوتێنێو بەشۆفلێ تەختی ئەکاتو خەڵکەکەیشی بەژنو منالو زەلامەوە هەمووی ئەگرێت.. ئەیووت ئەلێن لەهەندێ شوێن پێشمەرگە شەڕ ئەکات بەلام بەچی ئەچێ هەرزوو هەموویان ئەکوژرێن قوەتەکەی حکومەت لەکێشا نەبوو..

بەهەرحالێك بوو ئەو ڕۆژەم بردەسەر شەوەکەی تابەیانی خەو نەهاتە چاوم هەر گریامو لالامەوە هەر تەزبیحاتم کردوو پاڕامەوە بەشکو ئەمە خوایە ئەم وەزعە کۆتای بێتو ڕزگارمان کەیت.. خوا بکات زەلامەکانمان سەلامەت بنو ئەو ژنو منالەی ئاوایش نەجاتیان بووبێ.. خوایە بینێی لەدڵی ئەم زالمەو قەرارێ دەرکات.. ئەم لافاوە ڕاگرێ.. تابەیانی هەزارو یەك دالغەم لێدا..

بۆ بەیانی نازانم ئیخباری کرا بووین.. نازانم ئەم حکومەتە غەیبی هەبوو، چیبوو.. لەدەرگایاندا کاتێ منالەکان دەرگایان کردەوە کۆمەلێ عەسکەری جل مغاویری خۆیان کردە ژووردا هەر بۆوە تۆق بووم، خوایەگیان من لەترس ئەمانە ئەو هەموو ژنو منالەی ئاوایی و ئەوکەسو کارەم جێ هێشت.. ئەم زالمانە لەکوێوە پەیابوون.. من بەمێ ئەوەندە لەخوا

پاڕابوومەوە.. دڵم خۆش بوو ئەم ووت ئەم شەو ئاهوو نزولەم گەیشتۆتە قاپی خواو ئەوانیش رزگاریان ئەبێ.. چوزانم خۆیشم بەو دەردەی ئەوان ئەچم و خراپتریشم بەسەردێ..

هاتنە ژوورەوە.. داوای وەرەقەی (أحسا)یان کردو داوای هەویەی ماڵ و منداڵ و کەوتنە گەڕان بەناو ماڵەکەداو منیان لەگەڵ خۆیانا بردە دەرەوە.. چەندێ کچەکەم هاواری کردو پاڕایەوە ئەمە دایکمەو نەخۆشەو ساڵێکە لای منە.. فایدەی نەبوو.. پیاوەکەیشی لەماڵ نەبوو منو کچەکەشمیان گردو ئەو سێ ژنەش کەلەماڵە هاوسێکانیان دابوون ئەوانیشیان هاوردو لەهەر ماڵێك یەکێکی خاوەن ماڵە کەشیان گرد.. بردمانیانە مەقەڕێك ئێستاش ناوەکەی لەخەیاڵم ماوە وابزانم ناوی (مەیسە لوون) بوو...

لەوێ کچەکەی منو خاوەن ماڵەکانیان لەئێمە جیاکردەوەو ئێمەیان خستە سەیارەوە مەگەر هەر خوا بزانێ بۆکوێ کچەکەم و ئەو سێ ماڵەی تریش لەو مەقەڕەیا خستیانیانە سجنەوە.. ئێمە دوایی کەبەر بووین و گەڕاینەوە زانیمان کەئەوانیان یەك مانگ لەئەمن کەرکوك سجن کردووە لەسەر ئەوەی داڵدەی ئێمەیان داوە گوایە ئێمە ئەنفالین..!

بەسەیارە بردمانیان بەرەو خوار کەرکوك.. نازانم چی نەگبەتی یەك بوو تووشی ئێمە بوو، سەد خۆزگەمان ئەخواست کەهەر لەگەڵ ئەو قەوم و قیلەی ئاوایدا بمانیان گرتایا بەس نەبێ گشتمان پێکەوە بووین... ئاخر ئێستا ئێمە ئەگەر بمانخەنە ئاوەوە.. ئاگرەوە.. کێ بەهەواڵمان ئەزانێ.. نازانم چەنێکی پێچوو.. کردمانیانە ناو مەعسکەرێکەوە، دارهەڵدەی بەزەوی ناکەوێت.. هەرچی کورد هەبوو لەوێ بوو.. خێرا خێرا بەقافڵە خەڵك تریان ئەهاوردو دایان ئەگرد.. ئێمەشیان داگرد... بەوخوایە ولەوسەعاتە رێیەدا ئەوەندە ترسابووین.. لەوێ وامان ئەزانی بەردراوین.. خۆئەگەر بشمان کوژن لەگەڵ قەومەکەی خۆمان داین و دنیایە ژن و منداڵ و زەلامی لێیە... ئێ تۆ بڵێی ئەم عالەمەش هەر بکوژن.. بۆچیمان کردووە.. هەر دامانیان گرد لەسەیارەکان بەناو ئەو خەڵکەدا کەوتینە چاو گێڕان بەڵکو ئەمە خوایە..

زەلامەکان ئێمەیش لێرەبن.. یان بڵێی ژن و منالْ ئاوای ئێمەیشیان گرتبیْ و هێنابێتیانە ئێرانە.. زۆر چاوم گێڕا.. براکەس لەکەسەوە دیارنەبوو.. ئەمسەرو ئەوسەری نەبوو.. چەنیْ خەڵك لەو ساحەیەیا کۆمەڵ کرابوون دەئەوەنە خرابوونە قاعەوە..قاعەی دنیای تیا دروست کرابوو بەدوای یەکەوە ریزکرا بوون ئەتووت قافڵەی سەیارەیە.. هەمووی هەر پڕی خەڵك بوو.. کویْ ئەگەڕیْی.. لەکیْ پرسیار ئەکەیت.. واهەر پەیتا پەیتا خەڵکی تریان ئەهاورد.. دایانیان ئەگردو کۆمەڵ کۆمەڵ ریز ئەکران و ناو ئەنوسراو ئەخرانە قاعەوە.. ئێمەش کەوتینە ناو کۆمەڵێکەوە کەسیانمان ناناسیو خەڵکی ناوچەی ئێمەش نەبوون.. ترنجانمانیانە قاعەوە.. ئەوەنەیان تیْ کرد بوو.. ریْ نەبوو بجوڵێینەوە..

لەناو ئەو قاعەیە کەلەخەڵکەکەمان ئەپرسی لەویْ زانیمان ئێرە (تۆبزاوە)یە.. ئەیانووت زۆربەی ئەو خەڵکەی کەگیراوە هاوردویانە بۆ ئێرە. ئیتر کێچ کەوتبوە کەوڵم چۆن سۆراغی کورەکانم بکەم چۆن بزانم لێرەن، لێرەنین.. چۆن بزانم ژن و منالی ئاوای چیان بەسەر هات.. قاعەکە پەنجەرەی زۆری تیا بوو، چووبومە ناوپەنجەرەیەك و چاوم ئەگێڕا.. بەخوا هەر کەسێك بکەوتایەتە بەرچاوم جلو بەرگەکەیشی لەوەی کوڕەکانی منی بکردایا.. وەخت بوو ئاگر لەهەناوم بەربێت...

پێنج رۆژ بەو دەردەسەریە لەوقاعەیەدا ماینەوە.. پێنج رۆژ لەو پەنجەرەیەوە چاوم ئەگێڕا بۆ کوڕەکانم بۆ کچ و کچەزا بۆ کوڕەزا بۆ قەومانی ئاوایی.. پێنج رۆژ بەبەر چاومەوە بەزیل عەسکەری بەگلاّبە بەکۆستەر خەڵکیان هاوردو خەڵکیان برد.. پێنج رۆژ بەبەر چاومەوە پۆل پۆل زەلامیان ریز ئەکردو دەست و چاویان ئەبەستنەوەو لەسەیارەی (سەرداپۆشراو) باریانیان ئەکرد، مەگەر خواو سەدام و سایەق سەیارەکان زانیبێتیان بۆ کوێیان ئەبەن.. پێنج شەوو پێنج رۆژ لەو پەنجەرەیەوە چاوم بڕی بووە قاپی خوا.. بەخوا مەگەر خوا بۆ خۆی بزانیْ چیان بەسەر ئەو خەڵکەدا

هاورد.. خەڵك والەگاورو جولەکەیش ناکات.. نازانم خۆڵای خۆی ئەمانە موسوڵمان بوون‌و ئێمەش موسوڵمان بووین، بۆ وایان پێمان ئەکرد...

لەو پێنج رۆژەدا لەناو ئەو قاعانە مردنمان بەچاو خۆمان بینی.. بەئەنقەست تینومانیان ئەکرد، برسیمانیان ئەکرد.. سوکایەتی دنیایان پێمان ئەکرد..

ئێوارانێ هاتن لەناو قاعەکەماندا هەرچی زەلام‌و مێرد منداڵ هەبوو بردیان وەك ئەو هەموو زەلامەی قاعەکانی تر... من هەر چەندە لەهەردەکەی نزیك لەیلان کورەکانمانیان جیاکردەوەو بردیان‌و حەوت رۆژ بوو زوخاوم بۆیان هەڵئەرشت.. بەڵام کەبەبەرچاومەوە ئەو هەموو زەلامانەیان پەلکێش ئەکردو قیژەی ژن‌و منداڵ بۆ باوك‌و برای ئازاری خستەوە جەرگم‌و وێنەی کورەکانم ئەهاتەوە بەرچاوم کەجاشەکان بەزۆر لەئێمەیان جیاکردەوەو بردیانیان.. کەمناڵم ئەبینی قاچی باوکی ئەگرت‌و ئەی قیژاند (باوکە مەرۆ جێمان مەهێڵە).. سەرباری ئەو دەردەسەری‌و بەشمەینەتی‌و پەت پەتی یەی بەسەر خۆمدا هاتبوو.. قاژەی جەرگم بۆ ئەوان ئەهات‌و بەزەیم پێیاندا ئەهاتەوە.. نازانم ئەو زاڵمانە چی ئۆمەتێك بوون وارەحم خوا لەدڵیاندا نەبوو.. بەزۆرو بەپەل راکێشان ئەو هەموو گەنجە جوان‌و جاحێڵەیان برد.. !

وەدوای ئەوان شەوێك هاتن لەقاعەکە هەرچی منداڵی تیا بوو کەوتنە جیاکردنەوەی ئەوانیش‌و یەکە یەکە ئەیانخستنە دەرەوەی قاعەکە.. (ئۆهخوایە ئەوەی ئەو شەوە من دیم‌و بەسەر ئێمەدا هات، بەسەر گاورو جولەکەشدا نەیات) خەڵك والە دوژمن خۆیشی ناکات.. نازانم کوێراییان دایا چۆن دڵیان ئەهات والەو منداڵە کۆرپانە بکەن..

هەرچەندە من منداڵم پێ نەبوو بەڵام بەقەدەر هەموو ئەو ژنانەی منداڵەکانیان لەباوەشیان ئەرفان، ئازار کەوتبووە جەرگمەوە.. تۆ وەرە بیهێنەرە پێش چاو خۆت لەچوار شەوو چوار رۆژدا ماڵت تالان‌و ئاواییەکەت بسوتێنن، خۆت بگرن مێردو براو کورو کچت هەموو پەلبەست بکەن.. بەبەرچاو خۆتەوە هەرچی نێرینەت هەیە بیبەن‌و نەزانی چیان

بەسەر دێت و خۆت تینوو برسی بکەن و سجنت کەن و لەناو سجنیشدا بێن منداڵە وردەکان جیاکەنەوەو بیان بەن.. خۆزگە وا ئیمڕۆ ئەوەندە (ڕەسم گر) زۆر بووە.. ئەوکاتە ڕەسمی ئەو خەڵکەو ئەو قاعەیە ئەگیرا.. بزانم لەهەموو دنیایا کەس وای بەسەر هاتووە.. ناڵێم خۆزگە بەچاو خۆتان ئەتانبینی و یاخوا دوژمنیشم ڕۆژی وانەبینێ.. بەڵام خۆزگە ئێمە بمانتوانیایا وەك خۆی بۆتانی بگێڕینەوە.. بەخوا باس ناکرێ‌نا، کەس ناتوانێ وەك خۆی بۆتان بگێڕێتەوە..

منداڵ پەلێکی بەدەستی دایکی‌یەوەو پەلەکەی تری بەدەست عەسکەری‌یەوە پەلکێش ئەکرا.. بەخوا بەچاو خۆم بینیومە کەمناڵەکەیان بەکێش ئەکردو دایکەکەی پەلی گرتبوو بەری نادا.. عەسکەرەکان بەقۆناغە تفەنگ ئەیاندایە سەرو ملی دایکەکەدا تابەو شێوەیە مناڵەکەیان لەژێر دەستی دەرئەکردو پەلکێشیان ئەکرد... منداڵ چی هەمووی تۆقی. لەتاوا ئەیان زیراندو هاواریان بوو بەخوا وەك چۆلەکە بەدەست ئەو عسکەرە زاڵمانەوە هەڵدەلەرزین..

تائەوەیان لەگەڵمان نەکردبوو من هەر ئومێدم هەبوو بەرمان ئەدەن و ترسەکەم کەمتر بوو.. دێیان رووخاند ماڵیان سوتاند، زەلامیان بردو بەبەرچاوی خۆمانەوە دەست و چاویان بەستنەوەو خرانە سەیارەی سەرداپۆشراوەوە.. بەهەمووی بەقەدەر ئەوە نەبوو کەمناڵە کۆرپەکان لەناو سجن لەباوەشمان بڕفێنن و بیان بەن.. ئەوە لەئیشی بنیادەم ناچوو.. ئەمانە وەحشی بوون.. ئەگەر وەحشی نەبوونایا چۆن دڵیان ئەهات والەو پەپولانە بکەن.

ئەو شەوەمان بەشێوەیەك ڕۆژ کردەوە مەگەر دۆزەخ وابێ وەك باسی ئەکەن.. تابەیانی هەموومان هەرهارو شێت بووین ژن واهەبوو تابەیانی ڕەنگە ١٠ جار بورابێتەوەو هاتبێتەوە هۆش خۆی.. دیار بوو ئەو قاعەیەی مناڵەکانیان تێ‌کردبوو ولێمانەوە نزیك بوو چونکە تابەیانی گوێمان لەزیڕەو هاواری مناڵەکانیش بوو.. ئەوشەوە بڕوام وایە زریکەی منداڵ و ئاهوو

نزولەی دایك گەیشتبێتە لای خواو (خوا) شەو نابێتی لەدڵی (سەدام) کەقەرارەکە بگۆڕێت..

چونکە بەیانی زوو منداڵەکانیان هاوردەوەو کردیانەوە ناو قاعەکەو.. منداڵ گشتی ئەوەندە گریابوو ئەوەندە هاواری کردبوو، وڕوگێژ بوو بوون.. لەو دەقەیەی منداڵەکانیان هاوردەوە ئەوەندە دڵمان پێ خۆش بوو وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێ.. ئەم کوردە ئەوەندە دڵمان سافە کەمنداڵەکانمان بینیەوە ئەو هەموو مەینەتیی و پەت پەتیەی ترمان لەبیر چوەوە..

قەدەرێ دوای ئەوە ئەمجارە هاتن کەوتنە ناو قاعەکە هەرچی بەتەمەن هەیە جیامانیان کردەوەو یەکەیەکە ئیشارەتی بۆ ئەکردی و ئەبوو بەدەم بانگکردنەکەیەوە بچیت و ئەتیان کردە دەرەوە.. ئیتر پیرەژنی واهەبوو کۆمەڵێ منداڵی پێبوو.. دوێنێ منداڵەکانیان بردو بەو دەردەمانیان برد.. ئەمڕۆش خۆمان.. ئەمجارەش ئەتبینی منداڵ پەلاماری ژنەکانی ئەداو ئەیانقیژان کە جێیان نەهێڵن بەلام فایدەی نەبوو.. ئێمەیشیان دەرکردە دەرەوەی قاعەکان. وتم رەنگە وەك منداڵەکان هەربۆ عەزاب وامان لێ بکەن شەوێك بێت و بەیانی بمانگەڕێننەوە قاعەکە..

کەچی کەهاوردمانیانە دەرەوە سەیرم کرد کۆمەڵێ سەیارە ریزکرابوون گشتی سەیارەی (سەوزی سەرداپۆشراو بوون) کەئەچویتە ناویەوە هەمووی کورسی کورسی بوو بەدوای یەکداو شوشەکانی رەش بوون دنیات لێوە دیار نەئەما.. پڕیان کردو دەرگاکەشیان پێوەئەداو سەیارەکە کەمێك ئەجولاو ئەچووە پێشەوە. دیار بوو سەیارە سەیارە پڕیان ئەکردو چاوەڕێی بوون گشتی پڕبێت و بەڕێمان بخەن...

سەیارەی هەشت ریز کورسی تیا بوو هەرریزی چوار کەس، دوانی بەم بەرەوەو دوانی بەو بەرەوە... لەبەیانی یەوە خستمانیانە رێ.. هەموو هیلاك و تینوو برسی.. هەریەکەمان کوڕو کچ و کۆمەڵێ منداڵمان لێدا براوە.. ئەبێ خوایە گیان خۆمان بۆ کوێ بەرن.. تۆ بڵێی بمانخەنە بەحرەوە نەجاتمان بێت..

هەریەکەو لەلای خۆیەوە ئەمانلورانەوەو ئەگریاین‌و فرمێسکمان هەڵئەڕشت.. ئاخر خوایە گیان ئەمانە بۆوامان لێ ئەکەن.. هەرکەس لەماڵەکەی خۆماندا بەکوێرەوەری ئەژیاین‌و زۆر شوکر بەقاپی خوا بووین.. هەقی کەس بەلامانەوە نەبوو. لەپای چی‌بەم دەردەمان ئەبەن..

سەیارە هەر ئەڕۆی‌و رێگەنابڕایەوە.. کونێکی نەبوو هەر نەفەسێ بدەین هەرخنکاین. خەریك بوو لەگەرما بتەقین.. لەتینوا کوێر بین.. رۆڵە عیبیشە بیگێڕمەوە ئەوەندە بەرێگادا رۆیشتین‌و گەرمامان بوو تینوومان بوو هەبوو میزی خۆی ئەکردە ناو پێڵاوەکەیەوەو ئەیخواردەوە تالەتینوانا نەخنکێین..! پەت پەتی‌یەك بەسەر ئێمەدا هات نەبوونا.. بەیانی کەخستمانیانە رێ دوای خۆر کەوتن بوو لەشوێنێك سەیارەکان راوەستان‌و دامانیان گرد سەیرمان کرد واخۆر لەئاوا بووندایە.. ئیتر ئەوەنە هەر بەرێوە بوو بووین بزانە چەند سەعاتە رێ بوو..

کەلەسەیارەکە دامانیان گرد هەرچەندە هەتا چاوبڕ کات هەر سەحرا بوو هەر لم بوو، چۆڵەوانی بوو تەنها قەڵایەکی گەورەی لێ بوو کەئێمەیان لەبەردەمی داگرد.. لەناو سەیارەکە ئەوەندەمان گەرما بوو بوو ئەوەندە بۆنی پیس‌و هەڵاوی ناو سەیارەکە بەسەرماندا هاتبوو.. ئەم سەحرایە بەلامانەوە زۆر خۆشتر بوو.. من چوزانم (ئەمە ناوجەرگەی جەهەنەمە)...

هەروا سەیارە بوو ئەهات‌و لەریزدا ئەوەستا قافڵەیە گەلێ زۆر بووین.. یەکەیەکە دامانیان دەگرد و لەریزێکدا دەمانیان وەستان.. لەبەر دەرگای قەڵاکە دەفتەر بەدەست ناوتی ئەنووسی‌و ئەچوویتە ژورەوە.. خەڵکەکە ئەوەندە زۆر بوو شەو تەواو تاریك داهاتبوو هێشتا سەرەمان بەر نەکەوتبوو بچینە ژوورەوە.

کەچووینە ئەودیو دەرگای قەڵاکەوە کەدەرگایەکی گەورەی هەبوو قەڵاکە زۆر دیوارەکانی بەرز بوون‌و خڕ دروست کرابوو.. دیووی دەرەوەی هەر دیوارێکی رێك بوو.. بەڵام لەژوورەوە دنیایەکی تر بوو.. هەمووی قاعە قاعە

ترت بکە بائەوانیش نەمرنو نەبنە خۆراکی سەگ تاخوا دەرویەکمان لێ ئەکاتەوە)..

حاجی ساڵح ئەوەندە جەنازەی بردبووە دەشتەوەو دیبووی بەدەم سەگەوە لای ئاسای بوو.. من هەر هاورو شێت بووم لەتاوا، بەخوا ئێستاش کزەی والەجەرگمداو ئێستاش گوێم لەحەپەی سەگ دەبێ ئەوەڕی ئەو رۆژانەم بیرئەکەوێتەوە.. ئاخ چۆن لەبیرمان ئەچێتەوە..!!.

هەر سەعاتێکمان مردنێ بوو.. ئەوان بۆیە بەگوللە نەمانیان ئەکوشت تارەزالەتی زیاتر بچێژین.. بەخوا (جار جارێ زابتێ رەش بەراز ئەهات ناوی حەجاج)بوو.. کارێکی بەو عالەمە ئەکرد مەگەر هەر خوابۆ خۆی بزانێ..!؟ رۆژوابوو ئەهات بەناو قاعەدا ئەسوڕایەوە، ئەوەی کەوازۆر رەزیل بوایاو ئینسان بەزەی پیابهاتایەتەوە.. ئەو ئەوەی ئەبردە حەوشەی قەلاّکەو پەت پەتی دنیای پێئەکرد.. جاروابوو ئیختیار پەککەوتە واگیان ئەدا، ئەیبردە ئەو حەوشەیەو لەبەر ئەو خۆرە گەرمەو لەسەر ئەو چەمەنتۆیە رای ئەکشان و ئەیبەستە عەمودێکەوە.. تاگیانی دەرئەچوو..! کورە نازانم بڵێم چییان پێمان نەکرد بەخوا ئەوەی خوا پێناخۆش بوو کردیان. بەخوا بەیەکەوە سێ ئەختیاری بەو شێوەیە کوشت.. لەبەر خۆرەکەو لەگەرما ووشک ئەبوونەوە.. یەکیانم ئەناسی ناوی عبدالله بوو خەڵك تەپەسەوز بوو یەکێ تریشیان خەڵك قەلاّچەرمەڵە بوو، ئەوەکەی تریان نازانم خەڵکی چیناوچەیەك بوو.. بەوشێوەیە هەرسێکیانی کوشت.. بەمردوێتیش هەر سوکایەتیان پێمان ئەکرد.. لاشەکەت بخەنە بەردەستی سەگو لەجیاتی کفنو دفن.. بدەنە دەم سەگەوە، ئاخر لەچی زەمانێکدا بووە.. لەسەدام بەولاوە.. بەخوا ئەوانەی کەجەنازەکانیان ئەبردە دەرەوە ئەیانووت هەمووی هەر لەمەو هیچ نییە چاڵی پێبکەیت هەردای ئەپۆشیتو سەگەکان بەبەرچاو خۆمانەوە لەمەکەی سەری لائەدەنو لاشەکەی ئەخۆن.. بەلاّم کەئەو دەرمانەیان کردبووە ناو تەنکەرە ئاوەکەوەو لەوشەو رۆژەدا ئەوەندەی مرد هەر لەژمارە ناهات.. وتیان حەفارەیان هێناوەو چاڵی درێژ درێژیان کردوە.

قوتوویەك ئاو گەرمو تاڵیان ئەدا پێمانو سەعاتێ دوای ئەوە ئەهاتن ئەکەونە ناو ئەو خەڵکە ئەوەی سەموونو ئاوەکەی هەڵگرتبوو ئەوە ئەیانزانی بەڕۆژوە.. لێمانیان ئەسەندەوە.

کورە ئیتر پەت پەتی دنیا بەسەرماندا هات گەڕو گول بووین.. ئەسپێو رشك خواردمانی گشت چرچو لۆچەوە بووین بەخوا ئەوەی مابوو تەنها پێستەکەی بوو بەسەر ئێسقانەکەیا رەش هەڵگەرا بوو..

هەر رۆژی کۆمەڵێکی لێ ئەمردو بۆ خۆی نەجاتی ئەبوو.. من یەکەم جار خۆزگەم بەمردوەکان ئەخوارد ئەمووت بەجەنازەیش بێت ئەیبەنەوە بۆ وەتەن.. بەلاّم رۆڵە دوای زانیمان جەنازەی مردوەکانمانیان داوەتە سەگ.. هەر لەدەرەوەی قەلاّکە کۆمەڵێ سەگی رەشی گەورەیان هاورد بوو نازانم هیچی ولاّتێك بوون.. دایانیان نابوو لاشەی مردوەکانمانیان ئەدا پێیانو ئەوانیش ئەیانخوارد.. چ گاور سانێتییەك بوو بەخوا لەزەمان گاورو جولەکەیش شتیوا رووی نەدابوو.. ئەوەی ئەم زاڵمە دەرحەق بەکورد کردی کەس بەکەسی نەکردووە..

رۆڵە گشت جلو بەرگ لەبەرمانا لەچڵکنیو پیسیا وەك خێوەتی لێ هاتبوو ئەوەندە لەبەر ئەوگەرماو خۆرە، دامانیان ئەنا جلەکان بەرمان هەمووی رزیو گشت لەشمان کەوتبووە ئەوەناوە.. هەر حەیامان چوو خوا حەیایان بەرێت لەدنیاو لەقیامەتدا..

نازانم شوێن لەوە خراپتریشیان هەبوو چی بوو هەرجار نەجارێ ئەهاتن قافڵەیەکیان لامان بارئەکردو ئەیان برد کەس نەیئەزانی بۆ کوێ ئەبران.. بەخوا مانگێك ئەبوو لەوێ بووین من ئەوسا زانیم ئەمە ناوی (قەلاّی نوگرە سەلمان) ئیتر نازانم لێرە بەولاوە خەڵکەکەیان بۆ کوێی تر ئەبرد.. قەلاّی تریان هەبوو.. نازانم..!

پەیتا پەیتا خەڵك تریشیان ئەهاورد.. قەلاّکە ژێر زەویشی هەبوو بەلاّم نازانم قاپییەکەی لەکوێوە بوو لەوە ئەچوو لەژێر زەوییە کەیش خەڵك تری لێبوو بێت..

پێنج مانگو بیست رۆژ بەو حاڵەوە ماینەوە نیوەی ئەو خەڵکە مرد نازانم بۆ ئێمە نەجاتمان نەبوو..! دوای ئەوەی پێنج مانگو بیست رۆژە هاتن بەناوخەڵکەکەدا کەوتنە گەڕانو سەیرمانیان ئەکرد.. ئێ ئێمە هەموومان رەنگمان چوو بووەوە سەر یەك، وەك یەك کەسمان رەنگ بەشەریمان لەروودا نەمابوو وەك یەك رەقو ووشك بوو بووینەوە.. ئیتر نازانم بۆچی بەناوماندا ئەگەڕانو سەیریان ئەکرد.. هەریەکێ ئەقڵیان بیگرتایە ناویان ئەنووسی.. ناوەکەی منیشیان نووسیو نەمان زانی بۆچی بوو خەریك بوو بتۆقین. خواخوامان بوو زووتر رۆحمان دەرچێتو بمرینو نەجاتمان بێت.. بەلآم لەناو نووسینەکە ئەترساین ئەمانووت رەنگە بۆ شوێن خراپترمان بەرن.

چەند رۆژێکی پێچوو هاتنەوە ئەوەی ناوەکەیان نووسی بوو یەکەیەکە بانگمانیان ئەکرد.. چەند کەس هەبوو ناویشیان نووسی بوو لەدوای ئەوە مرد بوو..

جیامانیان کردەوەو هاوردمانیانە دەرەوەی قەلآکە. هەندێ سەیارە بەریز وەستا بوون، خستمانیانە ناو ئەو سەیارانەوە.. وەك ئەو سەیارانە وابوون کەبردمانی بۆ ئەوێ هەموویان بانیان قەپات بوو یەك قاپیەکی هەبوو کەئەچوویتە ناویەوە ئیتر (عەشتەبای خوات نادی) شوشەکانی رەش بوون. هەروەك ئەو سەیارەیە وابوو یەکەم جار بردمانیان بۆ ئەوێ...

خوایە ئەم نەگبەتی‌یە چی‌یە گرتوومانێتی ئاخر چیمان کرد بوو.. پرو پیرێژن وەك من هێزی چی‌تیا مابوو هەتا وامان لێ بکەن..

بەوخوایە درۆنی‌یە بڵێم چەندێ بەڕێوە بووین کەبردمانیان رەنگە دوو ئەوەندەی تر هەر بەرێگاوە رۆیشتنو نەمان ئەزانی بۆ کوێ ئەچێ.. ئەوەندی تر دڵمان سەغڵەت ئەبوو.. ئەوەندی تر تینوو بووینو گەرمامان بوو..

لەشوێنێك سەیارەکان وەستانو دەرك سەیارەیەکەیان لێمان کردەوە شەماڵێ ئەوەنە خۆش خۆی کردە ناو سەیارەکەیا.. مەگەر ئەو خوایە بۆ

خۆی بزانێ چەندێ بۆنی خۆش بوو.. بەبۆنی خاکەکەو بایەکەدا زانیم کوردستانە..! بەخوا هێشتا لەسەیارەکە دامانیان نەگرت بوو هەر بەبۆنی خاکدا زانیم ئەمەوەتە..

کەدامانیان گرد شەو بوو نەمان ئەزانی کوێیە.. بەلاّم هەر لەناو حەرەس و عەسکەریەکان ئەو مەعەسکەرەی لێی دامانیان گرد گوێم لێ بوو بەکوردی قسەیان ئەکرد.. ئیتر لەخۆشیدا خەریك بوو باڵ بگرم بیشمان کوژن خۆلەولاّت خۆماندابن..

هەر بەو شەوە سەرو وەرەقەیەکیان داپێمان و خستمانیانە سەیارەی (کۆستەرەوە) وتیان ئەتانبەینەوە بۆ چەمچەماڵ.. من وام ئەزانی ئەو شوێنە کەرکوکە بەیەکێ لەکوردەکانم ووت ئەمە کەرکوکە ئەمووت ئەگەر کەرکوك بێت من ماڵ کچەکەم لێرەیە.. وتی ئێرە (عەربەتە). هەر بەوشەوە. خستمانیانە رێ بەرەو چەمچەماڵ.. ئەمجارە سەیارەکان شوشەکانی رۆشن بوون ئیتر بەدڵ خۆم سەیری دەشتەوەم کرد.. دنیا وشك بوو پایز بوو بەلاّم وام ئەزانی بەناو چەمو دارستاندا ئەرۆم ئەوەندە ئاو هەواکەی خۆش بوو خۆ ئێمە چەند مانگ بوو فەوتاین لەوجەهەنەمە..

شەوکاتێ هاوردمانیانەوە چەمچەماڵ و لەم شوێنی شورشە بەرەلاّمانیان کرد.. دنیایە خەڵك هاتبووە پیریمانەوە لەخۆشیان حەپەسابووم بەو خوایە زمانم بەسترا بوو کەلیمە قسەم بۆ نەئەکرا.. ئەو خەڵکە ئەهات و ئەچوو پرسیاری ئەکرد.. بانگ یەکیان ئەکرد.. زمانم بۆ هەڵ ناهێنرایەوە.. کەسم نەئەناسی‌یەوە.. یەکێ لەکچەکانم هاتبووە پیریمانەوە ئەو نەگیرابوو ئەویش سوێندی ئەخوارد کەبەکراسەکەمدا منی ناسیوەتەوە چونکە رەنگ و روومان هەموو گۆڕابوو بەخوا لەئۆمەت ئەم زەمانە ناچووین منال لەشێوەمان ئەترسا..

ئیتر هاوردمیانەوە ناو ئەم خزمانە لەشۆڕش.. لەوێ زانیم کەکچەکەی کەرکوکم وامن لەماڵە کەیا گیراوم (مانگێ) لە(ئەمنی کەرامەی کەرکوك) سجن بووەو مێردەکەیشم دوای ئەوەی منالّەکان و من گیرا بووین دڵی تەقی

بوو مرد بوو... کۆمەڵێ خزمو کەسم تیا چوو بوو هەر مناڵەکان خۆم وزاواو ئامۆزای مناڵەکانمە کۆمەڵێ بوون..

١-ئەحمەد محەمەد عەلی ١٩٤٣ خۆیو شوکر کوڕی کەموالید ١٩٦٨ بوو.

٢-عەبدوڵلا محەمەد حەمە عەلی ١٩٤٩.

٣-ساڵەح حەسەن محەمەد عەلی ١٩٥١.

٤-عەبدوڵلا حەسەن محەمەد عەلی ١٩٥٥.

٥-ئیسماعیل حەسەن محەمەد عەلی ١٩٦٠.

ئیتر لەوکاتەیشەوە هام لەم خانوەیا بەخوا شەو هەتا بەیانی بەورینەوە بانگ کوڕەکانم ئەکەمو ئەڵێم بەڵکوو ئەمە خوایە ئەگەر لەخەویشدا یەك جار وەلامم بدەنەوە.

کاتێکمان زانی وتیان واجەیش لەهەموو لایەکەوە حەرەکەتی دەست پێ کردووەو ئەڵێن ئەگەنە هەردێیەك لەگەڵ زەوی‌یەکەدا تەختی دەکەن و خەڵکەکەیش جەیشەکە ئەیبات و کەس نازانێ مەسیرمان بەچی ئەگات..!

# جەلال محەمەد محێدین

لەدایك بووی ساڵی ۱۹۳۷ گوندی (قەیتول)

قەیتول دێیەکی گەلێ کۆنە لەناوچەکەدا باووباپیرانمان و چەندین پشتمان هەرلێرە ژیاون.. بژێوی ژیانی خەڵکی گوندەکەشمان بەمەڕداری و بەروبوومی کشتوکاڵی بووە..



منیش سەردەمی گەنجێتیم بەشوانکارەی بردۆتە سەرو لەساڵی ۱۹٦۱ ژنم هێناوە.. ئەو ساڵەی واشۆڕشەکە هەڵگیرساو شەڕەکەی دەربەندی بازیان بوو.. هەروا دوو ساڵی پێچوو بوو نەچووبوو.. جەیش و عارەب هاتن دایانە سەر ئاواییەکەمانداو تاڵانیان کرد.. گەلێ دێیان سوتان بەڵام باش بوو دێیەکەی ئێمەیان نەسوتان.. تەنها ماوەیەك دەربەدەر بووین و گەڕاینەوە..

ئیتر ئەوەنەساڵەی شەڕو دەربەدەری بوو دێیەکەی ئێمە لەبەر ئەوەی لەناوەڕاستی کۆمەڵێ لادێیتردا بوو هەمووشیان هەر ناوچەی ئازاد بوون.. دەستی حکومەت و جەیش و جاش بەئاسانی ناگەیشتە (قەیتول) مەگەر جار جارێ تەیارە لێی دایا، یان لەدورەوە تۆپ باران بکرایا..

کەشەڕی ئێران عێراقیش بوو گەنجێکی زۆری شارەکانیش بۆ رزگاربوونیان لەشەڕو بەکوشت چونیان هاتبوونە گوندەکەی ئێمەو لەمردن رزگاریان بوو.. ماڵەکانیان هاوردبووە دێیەکەمان و ئاوایەکی گەورەی لێدەرچوو وەك شار وابووین و هیچ کێشەو گیرو گرفتێکمان نەبوو بێخەم ئەژیاین و هەمووی خەریکی کەسابەتی خۆمان بووین..

بەم دوا دوایەو دەور ساڵێ بەر لەئەنفالەکە ئیتر حکومەت رزقەکەمانی بڕی و نەوت و غازو هەموو ئازوقەیەکی قەدەغەکردبوو بۆلادێکان.. ئەوە هەندێ سەغڵەتمانی کردو گرانی خستەوەو ژیانمانی قورس کردبوو.. پاشان رێگای هات وچۆی شاریشی بڕی و لەرێگاو بانەکان کۆیتەر رەمی دەکرد.. وردە وردە وەزعەکەمانیان تێك داو نەیان هێشت بۆخۆمان بژین..

دەنگ و باس لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە وتیان حکومەت جەیش و جاشێکی زۆری بردوە بۆئەو سەرەو هەرچی پێشمەرگەی ناوچەکانی ئێمەش هەبوو هەمووی رۆی.. ماوەیەکی زۆریان پێچوو کەگەڕانەوە بەشپرزەی و پەرتەوازەی.. وتیان حکومەت بەکیمیایی لێمانی داوەو لەدێهاتەکانیشی داوە.. ئاگری ناوەتە گوندەکانەوەو هەرچی خەڵکی دەست بکەوێ ئەیگرێت،. هەربەدوای ئەم هەواڵەدا وتیان واجەیشەکە نزیك کەوتۆتەوەو قەراخ و هەموو ئەو دێیانەی نزیکیانی کاول کردوە.. ئەیانووت دەست لەژن و منالێ ناپارێزێ و منالی شیرەخۆرەو مام جەلال یەك حسابیان بۆکراوە..

توشی سەرگەردانی‌یەکی خراپ هاتین و نەمان ئەزانی چی‌بکەین.. چیمان کردوەو گوناهمان چی‌یە واوامان بەسەر دێنن.. ئەبێ ئەم حکومەتە بۆچی رقی لەدێهات بێت و واهەمووی ئەڕوخێنێ.. نەمان ئەزانی چی‌بکەین، بڕۆین

مل بنەین بەرەو شارەکانو دەستبەرداری ئەم هەموو خاکو ئاوەبینو رەوکەین.. ئەی کێ ئەڵێ لەشار نامان گرێتو عەزابی دنیامان ناداتێ.. هەر لەئاوای ئەمێنینەوە.. واجەیش لەقەراخەو ماوەیەکیتر ناوچەکانی ئێمەیش رادەماڵێ..

وتی وتیو هەواڵی ناخۆش رۆژانە دەیان جار بەر گوێمان دەکەوت، هەر رۆژێ جۆرێ هەواڵت دەبیست.. بڕوامان بەهیچ نەمابوو.. وەزعەکە تەواو تێك چوو بوو رۆژانە تەیارەو کۆپتەر ئەهاتنە سەر گوندەکانو رەمیان ئەکرد.. هەروا زرمەی تۆپ ئەهات.. نەئەمانزانی لەکوێوە تیێ ئەگرنو نەمانئەزانی بەرکوێ دەکەوێت.. دوای چەند رۆژێك کەبەو حاڵەوە نەشەومان مابوو نەرۆژ.. سەری دنیامان لێهاتبووەوە یەك، لەترسا ئاوایمان چۆڵ ئەکردو ئەچووینە ئەو هەردەو کەلوەزانە خۆمان ئەشاردەوەو شەوان ئەگەڕاینەوە بۆئاوای.. ئیتر تەواو ژیانمان لێتێك چوو، تائەو کاتەی تەواو تەوق کرابووینو لەهەموو لایەکەوە جەیشو جاشیان بۆمان دەرکردبوو لەئاسمانیشەوە تەیارەو کۆپتەر وەك واشە ئەهاتنو ئەچوون.. ئەیانووت لەقادرکەرەمو نەوجولو کفریو کەلارو سەنگاوو بەری قەراخو چەمچەماڵو کەرکوكو لەیلانەوە وەك پشتوێن جەیشیان بەدەورماندا کۆکردۆتەوەو خەڵکەکە هەمووی ئەگرن.. ئەڵێن کیمیایش ئەتەقێنن بەسەر خەڵکداو لەناوچەکانی تری داوە.. هەربەو هەواڵانە هێز لەئەژنۆمان بڕابوو، سەرمان لێشێواو نەمان ئەزانی چیبکەین.. کاتێکمان زانی وتیان واجەیش لەهەموو لایەکەوە حەرەکەتی دەست پێکردووەو ئەڵێن ئەگەنە هەردێیەك لەگەڵ زەوییەکەدا تەختی دەکەنو خەڵکەکەیش جەیشەکە ئەیبات و کەس نازانێ مەسیرمان بەچی ئەگات.. رووح شیرینەو لەترسا خۆمان پێرانەگیرا لەئاوای ئەو هەموو ماڵو موڵکەمان جێهێشتو کەوتینە رێ بەرەو چەمچەماڵ.. سەیرمان کرد هەرچەمو شیوێك واکۆمەڵێ خێزانی پەرتەوازەی بەکۆڵو بارەوە بەرەو سەرجادە دێن ئەوەی سەیارەی بوو تەرەکتەری بوو ماڵو منداڵی تێئەکردو هەمووی لەترسا بەرەوجادە ئەهاتن.. ئێمەیش بەرەو

چەمچەماڵ ئەهاتین تووشی کۆمەڵێ خەڵکی تربووین‌و هەموو وەك یەك لێقەوماو بووین.. بەیەکەوە ملی‌ڕێگەمان گرتە بەرو لەسەر هەموو گردەبەرزو ڕێگاوبانەکان جەیش‌و جاش دامەزرابوون‌و هەروا قوات بوو ئەڕۆی بەرەو قولایی گەرمیان.. سەیرمان لێهات واحکومەت ئەمانبینێ‌و دەنگ ناکات‌و پشت بەخوا بەسەلامەتی رزگارمان ئەبێت‌و ئەگەینە چەمچەماڵ.. نەمانئەزانی بۆکوێ بچین هەردێینەوە ناو داوەکەی ئەوان‌و بەئاسانی ئەمانگرن، وامان ئەزانی کەبەرەو شارەکان هاتووین هەقیان نی‌یە بەسەرمانەوەو ئەوان تەنها ئەرکیان ئەوەیە لادێکان بسوتێنن.. چوزانین لەبەردەمان‌و بەبازنەیی بەدەوری هەموو ناوچەکەدا عەسکەری گرتویەتی‌و خۆیان چەند شوێنێکیان داناوە بۆ شوێنی کۆکردنەوەی خەڵك‌و بەئاسانی ئەچینە ناو ئەو شوێنەوە.. کاتێ گەیشتینە (قەرەتامۆر) تەماشامان کرد ئەو خەڵکەی کەبەهەر جۆرێك بووبێت خۆی لەدێیەکانەوە رزگار کردوەو بەئومێدی ئەوەی بگاتە شار، واهەمووی لەو هەردەیەدا خڕکراوەتەوە.. وتیان بارق خۆی لەپێشەوە راوەستاوەو ئەم چەند رۆژە کێ لەلادێکانەوە رای کردوە هەموویان گرتۆتەوە..

لەو دەشتەی قەرەتامۆر کۆمانیان کردەوەو دوو رۆژ هەروا بەلێشاو خەڵکی‌تر هات‌و کەوتە ناو ئێمەوەو بەزیل‌و تەرەکتەری دێیەکان خەڵکی تریان هێناو لای ئێمە خڕیان کردەوە.. منداڵ‌و ژن‌و پیرو پەککەوتەو شەل‌و شێت‌و ئەوەی لەناوچەکەدا بوو هاوردیان.. حەشاماتێك بوو هەر مەپرسە.. پەیتا پەیتا خەڵکی تریان ئەهێناو لای ئێمە هەڵیان ئەڕشت.. هەر لەوێداو خەڵکەکەی خۆمان ئەیانووت شەش بۆحەوت هەزار کەس ئەبووین تەنها ئەوەی لەقەرەتامۆر کۆکرابووینەوە.. لەئیرادەی خواوە سەرمایەکیش بوو هەر مەپرسە.. گەرچی وەرزەکەی بەهارێکی تەڕو خۆش بوو، کاتیش نزیك جۆدرەو بوو بووەوە.. بەلام ئەو سێ شەوەی لەقەرەتامۆر رامانیان گرد ئەتووت چلەی زستانە، تابەیانی لەسەرما هەڵدەلەرزین، ئیتر نازانم

هی‌برسێتی و ترسەکەیش بوو وایەکجار سەرمامان بوو یان ئەو دووسێ شەوە هەردونیا ساردی کردبوو..!

ئەو سێ ڕۆژە لەقەرەتامۆر ماینەوە کەوتینە هیلاکەت بۆنان و ئاو ئەو عالەمە چی بەشی ئەکرد.. ئەو زاڵمانەیش هیچیان نەدا پێمان خەڵکەکە خۆی هەریەکی شتێکمان پێ‌بوو ئەوەی لەپەڕۆو پاتاڵ و کوڵ و باردا شتێ نانمان پێبوو هەر لەوێ خواردمان.. خەڵکەکە هەر لەوێ کەوتە هیلاکەت.. بەخوا نازانم دوان بوو یان سیان ژن لەوێ منالی بوو هەر بەبەرچاوی ئەو خەڵکەوە.. وەزعێکی خراپ و ناخۆشمان بەسەرهات.. دوای ئەو سێ‌ڕۆژە سەیارەیەکی زۆری عەسکەری و مەدەنیان هێنا بۆمان.. لەئیڤای عەسکەری و مونشەئەوە تالۆری و کۆستەرو قەمەرەی بچوکیش و بەتەرەکتەرەکانی خۆیشمان زیاتر لەسەد تەرەکتەریان لەدێیەکانەوە هێنا بوو.. ئەم قافڵە زۆرە بەریزو بەدوای یەکتری‌دا خستمانیانە ڕێ و هەرسەیارەیەك عەسکەرێك بەتفەنگەوەو لەپێش و پاش قافڵەکەو لەنێوان سەیارەکانیشدا سەیارەی پڕلە عەسکەر لەگەڵماندا بوون وەك حیمایەی خەڵکەکەو هەلی کۆپتەریش بەبان سەرمانەوە ئەهات و ئەچوو.. کەگەیاندمانیانە ناو ئۆردوگای شۆڕش خەڵك هاتبووە سەر جادەکەو هەندێ تایەیان دانابوو لەسەر ڕێگای سەیارەکان و ئاگریان تێ‌بەرداو منال لەقەراخ جادەکانەوە بەردی ئەگردە سەیارەی عەسکەریەکان.. کەگەیشتینە ناو چەمچەماڵ بەیەکجار خەڵکی چەمچەماڵ پەلاماری سەیارەکانمانیان داو پێشیان لەقافڵەکە گردو کەوتنە خەڵك داگرتن.. بووە هات و هاوارێك هەر مەپرسە، لەهەموو لایەکەوە بەرد بارانی عەسکەریەکان کراو منال و زەلام چەمچەماڵ پێشی سەیارەکانیان دەگرت و بەزۆر خەڵکیان دائەگرد..

ئێمە ئەو سێ ڕۆژەی لەقەرەتامۆر بووین پێمانیان ووت ئەتانبەین لەشاردا موجەمەعتان بۆ ئەکەین و تەعویزتان ئەدەینەوە.. خوا خوامان بوو ئەو خەڵکەی واپێشی سەیارەکانیان لێمان گرتبوو وازبهێنن..

چونکە ئەمانووت هەقەکەمان ئەفەوتێ.. هیچ تاوانێکمان نەکردبوو تابترسین یان بڵێین حکومەت لەتۆڵەی ئەوەدا سجنمان ئەکات.. ئێمە هەموو خەڵکی کاسبکارو فەقیرو هەژاری لادێکان بووین چیمان لەچیا بوو تاسجنمان کەن.. لەو هاتو هەرایەدا بووە تەقەو کۆپتەر کەوتە رەمی کردن بەسەر خەڵکەکەی چەمچەماڵداو (بارق) خۆی گەیشتە ئەویو قواتێکی زۆریان گەیاندە سەر ئەو جادانەو خەڵکەکەیان لەئێمە دورخستەوە، گەرچی بەشێکی زۆریش لەقافڵەکانی ئێمە دابەزینو لەگەڵ ئەو خەڵکەی چەمچەماڵدا بلاوەیان لێکرد.. ئێمەیان بەحیمایەیەکی زۆرەوە گەیاندە ناو لیواکەی چەمچەماڵ.. لەوێ تیایا چی حەشاماتێك هەستاوە.. ئەتووت رۆژی حەشرە.. دنیایەك خەڵکی لێبوو.. عەسکەریش چواردەوری لیواکەیان گرتبوو خستمانیانە ناو لیواکەوە گەلێ قەرەباڵغ بوو.. ئەو هەموو خەڵکەیان دەرکردە ناو حەوشەی لیواکەوەو گشتی سەری کردبوو بەیەکداو هەر کۆمەڵێ خەڵكو چەند عەسکەرێك تفەنگەکانیان بەدەستیانەوە بوو بەدیار سەرمانەوە راوەستابوون.. ئەوەنە لەناو لیواکەی چەمچەماڵ نەمانیان هێشتەوە.. لەوە ئەچوو بترسن لەوەی کەخەڵکی چەمچەماڵ پەلاماری لیواکە بدەن بۆئەوەی ئێمە دەرباز بکەن.. چونکە هەر دەنگی تەقە ئەهات لەناو شاردا.. بەو شەوە سەیارەیان ریز کردو کەوتنە بارەکردنمان.. هەر سەیارەیەکیان بار ئەکرد ئەچووە دەرەوەی لیواکەو لەریزی یەکتری دەوەستان.. رەنگە بڵێم دوو سێ سەعاتی پێچوو تائێمە بارکراین.. خەڵکەکە ئەوەندە زۆر بوو لەدەلاوە بار دەکراو هەر تەواو نابوو.. گەلێ شپرزە بوون بەپەلە پەل بارمانیان کردو خستمانیانە رێ زۆربەی سەیارەکان بەرەو کەرکوك چوونو هەندێ سەیارەیان بەرەو سلێمانی بەرێ کرد.. ئێمە لەناو ئەو سەیارانە بووین کەبۆ سلێمانی چوون.. بردمانیانە تەواری سلێمانیو ناومانیان نوسیو تێکەڵ کۆمەڵێ خەڵکی ترمانیان کردو بەرەو کەرکوك گەڕاندمانیانەوە.. بەشێك لەسەیارەکانیان بردە ناو کەرکوکەوەو ئێمەیشیان راستەو راست برد بەرەو تۆبزاوا..

گەرچی هەرشەو بوو گەیشتین بەلام لەبەر لایتی سەیارە ناو مەعەسکەرەکەی (تۆبزاوا) بوو بووە چراخان.. لەوێ تەماشامان کرد چیهەرایەکەو چی خەڵك خڕکراوەتەوە بڵێم بەقەدەر دووشار وەك سلێمانی خەڵکیان گرتبوو درۆنییە.. هەمووی هەر رەشی ئەکردەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکیان دانابوو گشتی عەسکەر بەدیاریانەوە وەستابوو.. ئێمەشیان بردە ناو مەعەسکەرەکەوەو لەسەیارەکان دامانیان گرد هەریەکسەر کۆمەڵێ عەسکەری رەشیمل قەوی وەك گورگ پەلامارمانیانداو بەجیا بردمانیانە لایەکەوەو نەیانهێشت تێکەڵ بەو خەڵکەی تربیین.. وەك ئەوەی لەناو رانە مەڕدا بگەڕێن و بەرخ لەبەردەمی مەڕ هەڵگرن.. ئاوا کەوتبوونە ناو ئەو خەڵکەو گەنجیان جیاکردەوە.. گەنجەکان لەترسا خۆیان ئەکردە نێوان ئەختیارەکانەوە بەڵکو نەجاتیان بێت و دایان نەبڕن.. بەلام بێسود بوو چونکە ئەوەی هەر لەحەوشەکە جیایان کردەوەو بران بۆ قاعەی تایبەتی گەنجەکان ئەوە برا.. ئەوەی بەهەر شێوەیەك بوو خۆی کردبووە نێوان پیرەمێردو ژن و منالەکانەوە، دواتر یەکە یەکەی ئەو خەڵکە ریز دەکران و تەحقیقیان لێدەکرا، ئەوەی کەگەنج بوو لەپێشدا هەر دەردەکەوت و کەناوەکەیان دەنوسی لەریزەکە دەریان دەرکردو دەیان خستە ناو گەنجەکانەوەو بەریز ئەیانیان برد بۆقاعەی گەنجەکان..

هەر لەناو نوسینەدا کچی گەنجیشیان گشتی جیاکردەوەو ئەوانیشیان ئەبردە قاعەی جیاوازەوەو ئیتر مەگەر هەر خوا بزانێ چیان لەوان کرد..

ئەوجا ئەختیارەکانیش بەجیاو ژن و منالیش بەجیا بۆناو قاعەی تایبەت دەنێردران.. هەربەوشەوە کەنازانم فەجریدا بوو یان نا بەلام هێشتا زۆری مابوو بۆئەوەی رۆژ ببێتەوە ئاوا لەیەکتر جیامانیان کردەوەو ئەو هەموو نامووسەمان کەوتە ژێر دەست زاڵمەوەو ئیتر خۆمان ئاگامان لێیان برا.. ئەو زاڵمانەیش خۆیان و خوای خۆیان چیان بەو کچێلە کردبێ..!

بەجیاجیا کراینە ناو قاعەو سنفی خۆمانەوە، ئەو رۆژە تائێوارە هەر خەریك بوو هارو شێت بین بۆکچەکان بۆ ئەو هەموو ژن و منالە بۆ گەنجەکان

بۆ خۆمـان.. ئـەمانووت ئـاخر چیمـان کـردوە وابـەو دەردەمانیـان بـرد.. گوناهمـان چیبـووە لـەدنیایا هـەموو خـەڵکی رەش‌و رووت‌و کاسـب مـاڵ خۆمان بووین، بەڵام ئەو زاڵمە ئەوانەی نازانی گرنگ ئەوە بوو ئێمە کورد بووین‌و لای ئەوان گوناهبار بووین..!

دەمەو مـەغریب لەقاعـەکان ژن‌و منـاڵ زریکـەو هـاوار بـەرزەوە بـوو وەك ئەوەی ئاگریان لێیان بەردابێ قیژەیان رامانی ئەچەڵەکان‌و لـەزیرەو هـاواری منـاڵ موچورکـە ئەکەوتـە گیانمانـەوە.. خوایـە گیـان ئـەبێ چیبـوو بـێ هەموومان تەپماندا بووە سەر پەنجەرەکان لای قاعـەکانی ژن‌و منالەکانـەوەو سەیرمان کرد بزانین چییە..

یاخوا ئەوەی ئێمە بینیمان گاور نـەیبینێ.!! لەبەر دەرکی هـەر قاعەیەك کۆمـەڵێ عەسـکەری وەسـتا بـوون‌و بەپـەل راکێشـان منالیـان لەقاعـەکان ئـەهاوردە دەشـتەوە.. منـاڵ تـەکانی ئـەدا بچێتـەوە نـاو قاعـەکان‌و عەسکەریەکان ئەیانیان دایە بەر قۆناغە تفەنگ.. ئاگامان لێبوو ژن هـەبوو تـەکانی ئەداو بـەدەم دەستی منالەکەی‌و پەل راکێشانی عەسـکەریەکانەوە ئەهاتە دەرەوەی قاعەکەوەو منالەکـەیان لەبەر دەست لائەداو خۆیـان بـەپاڵ ئەکردە نـاو قاعەکەوە.. (چـی گاورسـانیەك بـوو هـەر مەپرسـە..).. ئـەوەی ئەوان کردیان قەت نەبووەنە، هیچ زاڵمێ لەدنیایا شتی وای نەکردوە..

کەمنالەکانیان وەك کارو بەرخ دایەپێش‌و بەدەم تێهەڵدانەوە بردیانیـان بەرەو قاعەیەکی دورتر.. هەمووی هەر هاوارو زیرەی بوو، ئاوڕیان ئەدایـەوە بۆلای ئەو قاعانەی وادایکیانی تیا سجن بوو ئەیانقیژان‌و بانگیـان ئەکرد.. بەڵام کێ بەفریایان ئەکەوێ.. ئەم زاڵمە خوایش لەهەقی نەدەهات..!

لـەناو قاعـەی ژنەکانیشـدا کـەزووتر لەگـەڵ منالـەکاندا پێکـەوە بـوون‌و منالەکانیان لێیان سەند.. بووە شیوەن‌و واوەیلاو قژڕنینـەوە یـەك دەنگیـان ئاسمانی کاس دەکرد..

وتمان تەواو ئەمە رۆژە رەشەکەیە.. تامنالەکانیان بەو دەردە نەبرد باشتر بووین.. بەڵام کەئەوەمان بینی ئیتر دڵنیا بووین ئەم زاڵمە نیازی گەڵێ خراپـە

بەرامبەرمان، ئەگینا کێ دڵی دێت واڵەمناڵ بکات ئەگەر رەحمی خوای لەدڵدا بێ.. ئەمانە ئینسان نەبوون رەحمیان نەبوو، ئەتووت ئاژەڵی کێووین هیچ درندەیەك ئەوەندە زاڵم نییە..! لەچاو ئەو زوڵمەی ئەمانە لەئێمەیان کرد..

ئیتر لەقیژەو هاوار زیاتر گوێت لەهیچ نەدەبوو چەند وەجبەیە سەیارە هاتن و چوون و لەحەوشەکەو لەبەردەم قاعەکان خەڵکیان هەڵرشت.. ئێمە تەنها گوێمان لەقیژەو هاواری ژن و منداڵەکان بوو.. تەنها دیمەنی ئەو جیاکردنەوەیە لەبەر چاومان بوو هیچی ترمان نەئەبینی.. چەند سەعاتێکی پێ‌چوو، قەناعەتمان وایە نزوللەی ئەو منالاّنەوو قیژەو هاواری دایکەکانیان و سوێی جەرگی ئێمە هەر ئەو سەعاتە گەیشتبێتە لای خواو خوا نای لەدڵیان منداڵەکان بگەڕێننەوە بۆلای دایکیان.. ئاگامان لێبوو بەزیرەو هاوار منداڵەکانیان هاوردەوە بۆناو ژنەکان و کڕبوونەوە.. ئەتووت قاڕەو باڕی بەرخ و مەڕو بزنە هاوار بۆیەکتری دەکەن تائەو کاتەی ئەگەنە یەکتری و هەر بەرخەو سەر ئەکاتە ژێر گوانی دایکی‌داو ئیتر قرەنامێنێ.. بەو خوایە ئەو کاتەی تۆبزاوا ئاوهابوو..!

هەر لەپەنجەرەکانەوە رۆژی دوای ئاگامان لێبوو کەقاعەی گەنجەکانیان هاوردە حەوشەکەو ریزیانیان کرد.. جلەکانیان لەبەریان دائەکەن تەنها کراس و بیجامە یان کراس و شەرواڵێکیان لەبەریان هێشتەوەو بەپشتوێن و جامانەکەی خۆیان دەست و چاویانیان بەستەوەو سواری سەیارەی سەرداپۆشراویانیان کردو سەیارەکان ئەڕۆیشتن ئیتر لەو کاتەوە تائێستا کەسێ نییە هەواڵیان بزانێ..

ئەو دوو شەوو دوو رۆژەی لەتۆبزاوا هێشتمانیانەوە، پەیتا پەیتا خەڵکی تریان دەهێناو وەك ئێمە دەبرانە بەردەم قاوشەکانی ناو نوسین و بۆ چوار بەش جیادەکرانەوە.. کەئێمە رۆیشتین چەندێ خەڵکی لێبوو لەو دوو رۆژو دوو شەوەدا ئەوەندەی‌تر خەڵکیان بۆهێناو بەش بەش دەکران و

دەخرانە ناو ئەو قاعەزۆرانەوەو پەیتا پەیتایش لێی دەگوازرایەوە.. چونکە ئەگەر لێیان نەگواستایەتەوە جێگا نابووەوە..

بەڵام چەندێکیان بۆدەهێنا ئەوەنەشیان دەبرد.. بەوەجبەی جیاجیا دەبران و زۆر بەشیان بەشەوو دەگوازرانەوە..

دوای نوێژی بەیانی بوو وەجبەیەك سەیارەی‌تر هاتنە ناو حەوشەکەوەو هاتنە بەردەم قاعەکانی ئەختیارەکان راوەستان و ولایتەکانیان کوژاندەوە.. زرەیان لەدەرکی قاعەکانمان هەستان و ئێمەشیان لەقاعەکان کردە دەرەوە، گەلێ زۆر بووین.. من دایکم بەگۆچان ڕێی ئەکرد لەگەڵ خۆماندا گیرا بوو پێکەوە بووین، بەڵام لەو دەرکردنە دەرەوەو بارکردنەماندا هەموویان لەیەك دابڕی و لەگەڵ دایکمدا لەیەکتر دابڕاین.. خوا ئاگادارە لەناخەوە وەك ئەو منالانەی دوێنێ بۆدایکم ئەگریام و ئاگام لێبوو ئەویش چۆن هەڵئەلەرزی بۆمن.. بەڵام ئێمە هەموومان زەلیل و بێدەسەلات بووین و هیچمان بۆ ناکرا، هەرچیان بووتایا ئەبوو وابکەین.. کەپەلمانیان رادەکێشا دەبوو بەدەم دەستیانەوە بچین،

بەپاڵ و بەدەم لێدانەوە وەجبە وەجبە سواری ئەو سەیارانەمانیان کرد کەهاوردبوویان بۆگواستنەوەمان، سەیارەکان بچوك و سەرداپۆشراو بوون و کەکردمانیانە ناوییەوە ئیتر وەك ئەوەی چاومانیان بەستبێتەوە ئاگامان لەهیچ نەما، چونکە سەیارەکان جامەکانیان تاریك بوو تەنانەت کونێکی تیا نەبوو بۆ(هەوا گۆڕکێ)، هەر خنکاین.. پیشاین لەناو ئەو سەیارانەدا.. چونکە ئەوان کەخستمانیانە ناو سەیارەکەوەو ئیتر سەیارەکە ئەچووە ریزی ئەو سەیارانەی ترەوە واپڕکرا بوون نازانم بڵێم چەند سەعاتی پێچوو تاهەموو سەیارەکانیان پڕکرد ئەو ماوە زۆرە ئێمە هەر لەناو سەیارەکاندا بووین و دەرگامان لەسەر داخرابوو.. کاتێ بەڕێ کەوتن ئێمە هیچ شوێنێکمان لێوە دیار نەبوو تابزانین بۆکوێ ئەچێت و روومان لەکوێیە.. ئەمانزانی بۆشوێنی خراپمان ئەبەن، چونکە ئەگەر بۆشوێنی خراپ نەبوایا بۆچی ئەمانیان خستە ناو سەیارەی سەرگیراوەوە ئیتر تەواو نائومێد بووین

کەجارێکی‌تر چاومان بەدونیای رۆشن بکەوێتەوە.. هەمووی سێ‌رۆژ پێشتر بوو لەگەڵ کەس‌و کارولە وولاتی خۆماندا بووین وابەخێرای گرتمانیان‌و هاوردمانیانە تۆبزاواو یەکەیەکە لەیەکتر جیامانیان کردەوەو کەس نازانێ چیمان بەسەر دێنن.. وائێمەشیان بەو شێوەیە خستە رێ قەناعەتی تەواوم وابوو کەئەمانبەن ئەمان خەنە ناو (بەحرەوە).. ئێ ئەو خەڵکە ئەوەندە زۆر بوو مەگەر (شەت) بتوانێ بیگرێتە خۆی، ئەگینا لەهیچ شوێنێ جێگای نابووەوە.. ئیتر هەزار داڵغەمان لێ‌ئەداو هەموو رۆژانی ژیانی رابردوومان ئەهاتەوە بەرچاو.. خۆزگەم ئەخاوست کەهەر ئەمانکوژن هەموومان پێکەوە بووینایاو ئەم ئازاری لەیەکتر جیاکردنەوەیەمان نەبینیایا.. هەر خۆم دڵی خۆمم ئەدایەوەو ئەمووت ئاوا باشترە ئەگەر بشمان کوژن باچاومان لەمەرگی یەکتر نەبێ.. زۆر زەحمەتە تۆبەبەرچاوی خۆتەوە جەرگەکەت بکوژن‌و بەرگەبگری..

هەر رێگامان کردو هەر نەبڕایەوە، هەر تینومان بوو، قورگمان ووشك بوو لاڵ‌و پاڵ کەوتین‌و نەگەیشتینە هیچ شوێنێ.. کێ ئەڵێ نەگەیشتبووینە زۆر شوێن‌و گەلێ شارو دێهاتمان تێ نەپەڕاند بوو بەلام ئێمە هیچمان لێوە دیار نەبوو مەگەر سەیارەکان بووەستایاو دامانیان بگرتایەتە خوارەوە ئەو کاتە بمانزانیایا ئەمە شوێنی مردنەکەی ئێمەیە.. دیار بوو کەهەر ئەڕۆیشتن‌و لایان ناداو نەئەگەیشتن.. بۆشوێنی مردنی ئێمە ئەگەڕان..!

تەواو برستمان لێبڕاو چەند کەس هەر لەتینوا بورایەوە.. سەیارەکان لەشوێنێك راوەستان‌و قەدەرێکی زۆریش رامانیان گردو دەرگایان لێمان نەکردەوە.. پاش ماوەیەك دەرگای سەیارەکەمان کرایەوەو هەندێ عەسکەری کلاو سورو بەرگ سەوز وەستا بوون‌و ئیشارەتیان بۆمان کرد (دابەزن).. هێزمان تیا نەمابوو لەترمان ئەدا، یەکەیەکە دابەزینە خوارەوە.. تەماشامان کرد سەحرایەکە ئەمسەرو ئەو سەری نەبوو تاچاو بڕی ئەکرد هەر دەشتایی بوو.. ئێمەیان لەنزیك قەلایەکی زۆر گەورە داگرتبوو جگەلەو

قەڵایەو لەعەسکەرەکانو سەیارەکان کەخۆمانیان هێناو جگە لەدەمو چاوی شلەژاوی خۆمان هیچی تری لێنەبوو.. هیچ دیار نەبوو..

لەناو ئەو خەڵکەی تردا کەلەسەیارەکانی‌تر بوون تەماشام کرد وادایکم لەوێیە.. باوەشمان کرد بەیەکتری‌داو ئەو دیمەنەی تۆبزاوا جارێکی‌تر ئەهاتەوە بەرچاوم کەمناڵەکانیان گەڕانەوە بۆلای دایکیانو هاتو هاواری قاعەکان بێدەنگ بوونەوە.. منیش کەباوەشم کرد بەدایکمدا وەك ئەوەی ئاو بکەن بەسەر ئاگردا، لەناخەوە ئاوا ئارام بوومەوە.. ئەمجارە لەدڵی خۆمدا ئەمووت مەگەر بمکوژن رازی نابم لەدایکم جیام بکەنەوە.. ریزمانیان کرد لەبەردەم قەڵاکە.. بینایەکی گەلێ گەورە بوو لەژیانمدا بینای واگەورەم نەدی بوو هەمووی بەبەردی سپی دروست کرابوو بیناکە خڕبوو وەك قەڵاو دیوارەکەی دەرەوەی گەلێ بەرز بوو سێ‌وچوار سەیارە بنێتە سەریەکەوە ناگەیشتە سەری دیوارەکە.. دەرگایەکی گەورە گەورەیشی هەبوو سەیارەکانی ئەخوارد بەڵام دیار بوو بۆیە سەیارەکانیان نەبردە ژورەوەو لەدەرەوە دامانیان گرد تاچاو بەو سەحرایەدا بگێڕینو دڵنیابین کەئەو شوێنی مەرگو ژیانمانە.. ئەویش لەوە ئەچوو هەر بۆ تەعزیبی نەفسی ئێمە بوو بێت تابەخەفەتەوە بمرین کەبۆچی ئێمەیان گەیاندۆتە ئەم بیابانە.. لەوڵاتی ئێمە نەبیابانی واهەبوو نەخاکەکەمان وابوو ئەمە هەمووی وەك (لم)وا بوو..

زووتر ئەیانووت ئەچیت بۆحەج هەمووی بیابانەو خاکەکەی لمەو هیچی لێ ناڕوێ.. ئەمووت رەنگە ئێرە نزیك (ماڵەکەی خوا بێت)..

کەبردمانیان بەرەو ناو قەڵاکە.. خەڵکمان لەگەڵ بوو خوێنەوار بوو لەدەرگاکە بەگەورەی شتێ نوسرابوو ئەیانووت نوسراوە (قلعة الويل).. وەیل وەك ئەڵێن ناو جەرگەی جەهەنەمە بەخوا برا ناوەکەی پڕ بەپێستی خۆی بوو ئەو شوێنەیش ناوجەرگەی جەهەنم بوو..

بردمانیانە ناو قەڵاکەوە حەوشەیەکی زۆر گەورە بوو بەچوار دەوری‌دا هەمووی غورفە غورفە لەسەریەك دروست کرابوونو دووقات بوو لەسەریەك

گەلێ بەرز بوو وەك ئەوە وابوو لەناو مەنجەڵی ساوەر کوڵێندا بین و تەنها ئاسمانت لێوە دیار بوو..

کەئێمەیان بردە ئەوێ هەندێ خەڵکی تری لێبوو بەڵام غورفەی چۆڵ زۆر بوو پیاویان بەجیا کردە غورفەی جیاوازەوە لەلایەکی قەڵاکەو ژنەکانیشیان بردە لاکەی تری.. من ئەمجارە سوێندم خواردبوو نەهێڵم لەگەڵ دایکمدا لەیەکتر جیامان بکەنەوە.. وەك منداڵ خۆم نوساندبوو پێوەی و زۆر هاوارم کردو رجام کرد، لەگەڵ ئەو زاڵمانەدا سوودی نەبوو گەلێ پاڕامەوە بالەگەڵ دایکم پێکەوە بین و دایکم نەخۆشە.. دامیانە بەر قۆناغە تفەنگ و لەیەکترمانیان دابڕی..

ئێمە گەلێ هیلاکی ئاو بووین، ئاوێکیان داپێمکان وەك ژهر وابوو چەند کەس هەریەکسەر رشایەوە ناو زگ ئەو خەڵکەی گشت هێنایە خوارەوە.. بەگاڵتە ناوی ئەم قەڵایەیان نەنابوو (وەیل) مەلاکانیش زووتر ئەیانووت لەناو جهەنم کەتینووت ئەبێ ئاوێکت ئەدەنێ وەك (گوژاڵك) تاڵە.. بەڕاستی ئەو قەڵایە لەهەموو رویەکەوە وەك جهەنم وابوو.. مەگەر تەنها عەسکەرییەکان لەمەلایکەکان جیاوازبن ئەگینا ئیتر هەموو شتەکانی لەیەك ئەچوون..

هەریەك رۆژ دوای ئەوەی ئێمە گەیشتین، کۆمەڵێ سەیارە خۆیان کردە ناو حەوشەی قەڵاکەوەو دەرگایان لێیان کردەوە تەماشامان کرد هەمووی خەڵکی وەك ئێمە بوون و گواسترا بوونەوە بۆلای ئێمە.. ئەوانیشیان کردە غورفەکانەوە.. ئیتر لەوەودوا رۆژانە وەجبەی تریان هێناو تاوای لێهات ئەو قەڵاگەورەیە کەدووقات لەسەریەك دروست کرابوو هەمووی غورفە غورفەی درێژ بوو هەموو پڕکراو حەوشەکەیشی جمەی ئەهات.. پەیتا پەیتا خەڵکی تریشیان ئەهاورد.. تاوای لێهات نەئاوو نەئەو سەمونە رەقەی کەئەیان داپێمان بەرگەی نەدەگرت و بەهەزار حاڵ بەرت دەکەوت.. زاڵم بوون هەر بەئەنقەست وایان ئەکرد تاعەزابی زیاتر بچێژین.. ئەم حکومەتە توانی ئەو

هەموو دێهاتە بڕوخێنێ‌و ئەو هەموو خەڵکە بگرێ‌و بیگەیەنێتە ئەوێ قابیلە نەیئەتوانی بای ئەوەی کەتەنها بەشی خواردنەوەمان بکات ئاومان بداتێ..؟

بەڵام هەر بۆ چەوساندنەوەی ئێمە وایان ئەکردو ئاویان کەم ئەهێناو بەشمانی ناکرد.. ئەبوو بەشەرەپاڵ‌و بگرەو بەردەیە لەسەر نۆرە ئاو هەر مەپرسە.. بەخوا ئەختیارو پەککەوتەی واهەبوو ئەکەوتە ژێر پێی خۆمانەوە، لەناو خۆت کێ ئاگای لەکێ مابوو کێ رەحمی مابوو، ئاخر وات نەکردایا لەتینوا ئەخنکای.. ئەهاتن بەسۆندەو قامچی‌یەوە ئەکەوتنە ناومان تاشانیان هیلاك ئەبوو لەوخەڵکەیان ئەدا.. چەند کەس هەر بەو لێدانە مرد نەجاتی بوو..!

وەزعمان نەبوو رۆژی یەك سەمونی رەق‌و بەو حاڵەیش چۆرێ ئاوت بەردەکەوت.. بەبەرچاوی خۆمانەوە بەتەنکەری گەورە ئاویشیان بۆخۆیان ئەهێناو بەسۆندەو بەبەرچاوی ئێمەوە ئەیانکردە قەد دیوارەکانداو ئەیانرژان.. قاژەی جەرگمان ئەهات بەڵام دەسەڵاتمان چی‌بوو.. ئێمە تەنها خوامان هەبوو خوایش بەسەبر بوو نەیئەدایە ناو چاویاندا..

قەڵاکە لەمسەری‌و ئەوسەری چەند غورفەیەکی جیاوازی هەبوو لایەکیان شورتە بوون‌و لایەکیان ئەمن بوو..

بەسەیارە قاڵبە بەفریان بۆئەهات بۆ هەردوو لایان بۆشورتەکان‌و ئەمنەکان میوەیان بۆهات، مریشکیان بۆئەهات.. جاری وابوو گۆشتیان ئەبرژان‌و بۆنەکەی هەر خەریك بوو شێتمان بکات.. لەوە ئەچوو ئەو زاڵمانە کەبەبەرچاوی ئێمەوە وایان دەکرد، بۆئەوە بووبێ خەفەتی زیاتر بدەنە ئێمە..!

ئەیانوویست بەعەزابی زیاترەوە بمانکوژن.. بۆیە ئەوەی کەرۆژێ زووتر بمردایا خەفەتێ کەمتری هەبوو.. خۆزگەمان بەمەرگ ئەخواردو لەتاو ئەو رازالەتەی خۆمان ئاگامان لەکەس نەمابوو نەبیری وەتەن‌و کەس‌و کارو ئازیزەکانمان بوو نەئەوەشمان لەبیر مابوو کەناموسەکەمان کەوتە دەستی دوژمنەوە.. هەر فریا دەکەوتین خەفەت لەخۆمان بخۆین..!

بـەڵام کـاتێ زانیمـان کەمردوەکانیشـیان ئەدەنــە دەم سـەگەوە، ئیـتر لەمردنیش ئەترساین‌و هیچ قاپی‌یەك نەما پەنای بۆبەرین..

کەخـەڵك ئەمرد ئـەوان هـەقیان نـەبوو تەنـها دوو چـەکدار وەك حـەرەس لەگەڵماندا ئەهاتن‌و ئەبوو خۆمان بیبەینـە دەرەوە.. هـەروا تـۆزێ قوممـان ئەکردە بـان لاشـەکەداو بەبەرچاوی خۆمانـەوە سـەگەکان ئەهاتنـە دیـاری‌و هـەڵیان ئەدڕی.. خـوا ئاگادارە سەگم بینـی کـەچووە دیـار لاشـەیەك پێـش هەموو شوێنێکی ناو زگی هەڵئەدڕی‌و جەرگ‌و ریخۆڵەکەی ئەخوارد.. خـۆم چەندجار سەری سەگم لەناو زگی مردوەکانی خۆماندا بینیوە.. هارو شێت بوویـن لـەتاوا.. یەکـەم جـار دڵمـان بـەوە خـۆش بـوو مـادام بیابانـەو هـەر سەحرایەکی لماویە.. زووتر حاجی‌یەکانمان ئەیانووت نزیك مەکەو مەدینە ئاوایا.. ئەمانووت ئینشائەڵا هەر رۆژێکمـان بە (حـەجێك) بـۆ ئەژمێردرێت‌و لای خوا ئەم عەزابەمان بەعیبادەت بۆحساب ئەبێ.. بەڵام ئەگـەر بـەعیبادەت حسـاب بوایـا خـوا یـەك شـەقی تێیـان هەڵئـەداو نەیئەهێشـت ئـەم هـەموو سوکایەتیەمان پێبکەن.. هەمووی بەلایەك ئەوە بەلایـەك کەلـەجیاتی ئـەوەی بەدەستوری ئیسـلام (کفن‌و دفنمـان بکـەن) کـەچی جـەنازەکانمانیان ئەدایـە سـەگ.. نازانم ئەو هـەموو سـەگە رەشـە گەورانـە لـەکوێوە هـاتبوون ئـەوەندە بەرز بوون زەلام سواری بوایا قاچی ناگەیشتە زەوی..!

کابرایەکیش جارنـەجارێ پـەیدا ئەبوو نـاوی (حـەجاج) بـوو مەگـەر ئـەو ئەوەندەی ئەو سەگە رەشانە رەزا گرانـە بووبـێ.. ئەو حـەجاجە زۆر ئەمانی چەوساندەوە.. هـەر جـارێ ئـەهات چوار پێنج زەلامـی ئەبرد سـەرەو خـوار هەڵیانی ئەواسی بەو عەمودانەی ناو حەوشەی قەڵاکەوە لەبـەر ئـەو گـەرمایا ئەیانیهێشـتەوە تاگیانیـان دەرئـەچوو.. نـازانم چی‌کـەیفی بـەوە دەهـات بـەو شـێوەیە خـەڵك بکـوژێ.. نـازانم چی‌بـوو بـەڵام هـەرچی جونـدی‌و ئـەمن‌و زابتەکانیش لێی ئەترسان.. دیار بوو گەورەی گشتیان بوو..

رەزالەتمان گەلێ بینی.. بەخوا ئەو ئاووسەمونەیش کەئەیان داپێمان گەر ئینسان زۆر ناعیلاج نەبوایا نەیئەخوارد.. ئەو سەمونە نازانم ئـەتووت وردە

شوشەی تیایە ئەوەندە زبر بوو ناو دەمو ناو ریخۆڵەی ئەو خەڵکەی گشت کردبووە زام.. ئەو خەڵکەی گشت خلاس کرد..

لەوێ بەو حاڵەی خۆمانەوە هێشتا هەر شوکر بووم بەڵام دایکم بینی گەلێ رەزیل کەوت و زۆر نەخۆش کەوت لەتاوا زمانی لەدەمی دەر ئەکردە دەرەوە هەمووی بوو بووە زام خوێنی لێئەچۆڕا.. چاوی چوو بووە قوڵدا لەژیانمدا کەسم نەبینیوە ئاوا رەزیل بێت.. زۆر ئازاری دام زۆر پاڕامەوەو زۆر شەو تابەیانی نەخەوتمو هەر سوجدەم بۆخوا برد کەبەو حاڵەوە نەیکوژێ.. ئاخرییەکەی بەرگەی نەگردو دایکم بەبەرچاوی خۆمەوەو بەو دەردە مرد.. کەلاشەکەیمان بردە دەشتەوە لەزەلامەکان ئەپاڕامەوە کەباچاڵێکی قوڵی بۆبکەین بەڵکو سەگ دەری نەکات.. بەڵام عەسکەرەکان بەدیارمانەوە وەستابوون و سەعاتیان دەگرتەوەو پێنج دەقە زیاتر نەیان ئەهێشت خەریکی شاردنەوەی لاشەیەك بین و بەزۆر هەڵمانیان ئەسان.. عەسکەرەکان چەندێ پەلەیان بوو سەگە رەشەکانیش دانیان جیڕ ئەکردەوەو لەعەسکەرەکان زیاتر پەلەیان بوو تالابچین و بێن بیخۆن.. من سەگم بینی هاتنە سەر لاشەکەی دایکم و خواردیان.. نازانم ئەبێ لەدونیادا لەوە ناخۆشی زیاتر هەبێ کەئێمە دیمان..

ئەو هەموو خەڵکە ئەمردو بەبەرچاومانەوە سەگ ئەیخوارد هیچی وەك ئەوەی دایکم کاری لێم نەکردو وەك شێتم لێهاتبوو لەوەودوا ئۆقرەم لێبڕابوو.. شەو هەتا بەیان ئەهاتمو ئەچووم چەندین جار لەسەرئەوە لێمیان ئەدا..

شەوێك بەدزی حەرەسەکەوە لەقاتی دووەم چوومە سەر قاڵدرمەکەو ملێکم کێشا تاچاو برکات هەر تاریکی بوو لەدور لەدور هەندێ ئاگر دیاربوو وەك شار وابوو.. دوای کەلەناو خەڵکەکە باسم کردو هەبوو پرسیاری لەشورتەکان ئەکردو عەرەبی ئەزانی قسەیان لەگەڵیان ئەکرد.. وتبوویان ئەوە (سەلمانە).. هەر ئەو شورتانە بۆمانیان باس ئەکرد کەچەند قەلایەکی

تریش هەیەو هەمووی هەر پڕی سجنەو وتبوویان لەعەرعەریش زۆری لێیەو ئەڵێن ئەوانە گەنجن..!

ئیتر بەردەوام چەند خەڵکمان لێئەمرد دوای ماوەیەك وەجبەیەکیان ئەهێناو شوێنەکانی ئەوایان پڕەکردەوە.. دوو بۆسێ مانگ ئەبوو لەوێ بووین وەجبەیەکیان هاورد هەمووی ژنو منالْ بوونو هەندێ غورفەیان بۆیان چۆلْ کردو بەجیا سجنیان کردو نەیان ئەهێشت تێکەلْ ئێمەبن.. وابزانم ئەیانووت ئەمانەیان لەدوبزەوە هێنابوو.. ئەوانیش زۆریان لێئەمرد.. بەتایبەت ئەو هەموو منالەی ئەتووت پەپولەن لەکوێ بەرگەی ئەو گەرماو برسێتیو ئاوەتاڵەیان ئەگرد..

کەئەوانیان هاورد ئێمە وەزعمان خراپتر بوو.. هەریەکەمان ژنو منالی خۆمان بیر دەکەوتەوەو بەردەوام چاومان بەغورفەکانی ئەوانەوە بوو.. کێ ئەڵێ ژنو منالی ئێمەشی تیا نەبوو.. وەك ئەوەی جەرگی خۆمان بێت ئاوها عەزابیان ئەخستە جەرگمانەوەو ئەم حکومەتەیش لەوە ئەچوو هەر بۆئەوە هاوردبێتیانی بۆلای ئێمە.. تاژنو منالەکانمان بیرکەوێتەوەو خەمو خەفەتمان زیاتر بکات.. ئەتووت سوێندیان خواردووە تەنها بەخەفەتو مەراقەوە بمانکوژن..

دووجاریش ئەکەوتنە ناو ئێمەو هەندێ ناویان ئەنووسیو دوو وەجبەیان لێمان بارکردو کەس نەیزانی بۆکوێیان ئەبەن..

هەندێ شێتی لێبوو هەر لەدێیەکان گیرا بوون لەوێ بوو بوونە مەخسەرەی ئەو جەلادانە.. جاری وابوو دوو دوو ئەیانیان بەستە یەکتریەوەو لەناو حەوشەکە ئەیانیان دایە شەڕدا.. یان تەنەکەیان بەپەتێك ئەبەستە پێیانەوەو بەناو قاوشەکاندا ئەیانیان سوڕاندەوە تاتەقەقەو خڕەخڕی تەنەکەکە ئێمە بێزار بکات..

باسی (وەیل) تەواو نابێ.. گاورسانێتی بوو.. بەخوا رەنگە دووسەد هەر کوێری لێبوو بێ گشتی لەدێهاتەکانی خۆیان گیرابوون چەند هەر کەم ئەندام گۆجو شەلو نەخۆشی پەککەوتەیان هێنا بوو.. هەندێکی لێبوو وابزانم یان

ووتیان گۆپتەپەین یان بالیسانیین باش لەبیرم نەماوە هەموویان سەریان پەنما بوو گیانیان بوو بووە زام ئەیانووت بەکیمیایی لێیانیان داوە گەلێ وەزعیان خراپ بوو تاشەش مانگ ماین‌و نەمردین، رۆژێك هاتن کەوتنە ناومان‌و ناویان نوسی‌و ئەمجارە منیش بەر ئەو ناونوسینە کەوتم.. خۆیشم لەبەر چاو کەوتبوو ئەوەندە رەزیل بووین خوا خوام بوو بمان بەن‌و بمان کەنە ناو (شەتەوە) ئێ‌خۆ باشترە لەوەی سەگ بمانخوات بابینە خۆراکی ماسی..

هەرکاتێ ناویان ئەنووسی‌و وەجبەیەکیان ئەبرد لەناو خەڵکەکەی خۆماندا ووتی ووتی ئەوە دروست ئەبوو کەئەیانبەن بۆکوشتن.. ئەوەندە بێزار بووم لەژیان خۆزگەم بەمردن دەخواست..

دوای ناونوسینەکە هەندێ سەیارەیان هێناو بردمانیانە دیارسەیارەکان، بارمانیان کردو دەور عەسر بوو خستمانیانە رێ.. شەو گەیشتینە شوێنێ شار بوو پرسیمان کوێیە وتیان (سەماوە)یە.. رۆژێك لەوێ هێشتمانیانەوەو شەوەکەی دواتر بارمانیان کردەوەو گەڕاندمانیانەوە بۆ (تۆبزاوا) بۆئەو شوێنەی یەکەمجار لەیەکترمانیان جیاکردەوە.. ئای چی عەزابێکمان چەشت کەگەڕاندمانیانەوە بۆ (تۆبزاوا).. تەنها ئەو شەوە لەوێ ماینەوە.. گەر دوو سێ رۆژی پێ‌بچوایا گشتمان شێت دەبووین لەتاوا، زیڕەی منداڵەکان‌و دەنگی ئافرەتەکانمان ئەهاتەوە گوێ.. گەنجەکان نەهاتنەوە پێش چاومان کەباڵبەستیان کردبوو، هەر هاربووین.

بەیانی دەمەو بەیان بارمانیان کردەوە.. بەڵام لەقاعەکانی لای سەرەوە خەڵکی تیامابوو هاتبوونە ناو پەنجەرەکانەوەو سەیری ئێمەیان ئەکرد.... بەڵام نەیانهێشت نزیکیان بکەوینەوە تاقسەیان لەگەڵ بکەین..

هاوردمانیانە محافەزەی سلێمانی‌و لەوێ بەپێی ناوچە جیامانیان کردەوەو ناومانیان نوسی‌و هەریەکی وەرەقەیەکیان بۆمان کردو ئێمەیان گەڕاندەوە بۆ چەمچەماڵ‌و لەقایمقامیەتی چەمچەماڵ بەکەفالەت بەرمانیاندا..

کەبەربووم کەسم نەمابوو گشتی گیرابوو هەر رۆژە هەر لەماڵە خزمێك بوو.. هەروا پانزە بیست رۆژێك ئەبوو بەربووم لەقادرکەرەمیەکان لەماڵە ناسیاوێك بووم (حەملە) کراو لەو ماڵەدا منیان گردو کۆمەڵێ خەڵکی تریشیان گرتبوو بەبیانووی ئەوەی ناوتان لە(احسا)کەدا نییە.. بردمانیانەوە بەرەو سلێمانی، گیان بەوەبوو وەرە قەکەم پێ بوو کەخۆیان دابوویان پێم لەجیاتی (احسا).. دوای چوار شەو لەتێهەڵدان و تەعزیبی جۆراو جۆر منیان بەو وەرەقەیە بەرداو وابزانم خەڵکەکەی تر ئەوەی کەلەگەڵ منا داگیرا بوون سێ مانگ و بیست رۆژ مانەوە دوای بەریانیاندا.. ئیتر لەوکاتەوە تاساڵی ١٩٩٥ هەر لەئۆردووگای شۆڕشدا ئەژیام و لەو کاتەشەوە چوومەتەوە بۆ (قەیتول).. بەڵام زۆر زەحمەتە ئەنفال لەبیر بچێتەوە.. رۆژانە بیرمان دەکەوێتەوە.. شوێنی ماڵ و منداڵ و دیمەنی ئاوای دیمەنەکانی پێش ئەنفال و ئەنفال دێنێتەوە یادمان و عەزابی پێ ئەچێژین.. هەمیشە چاو لەرێین بەڵکو خوایە خەبەرێ ئەوەی مابێ و لەبرسا نەمردبێ رزگاری بێت تائەم حکومەتە بمێنێ ئێمە هەر چاوەڕێین کەروخاو ئەسەرێکیان نەبوو دیارە هەر زوو هەموویانی کوشتووە..

مناڵەکە لەودیوو دەرگاکەوە ئەپاڕایەوە دایە توخوا قاپی‌یەکە بکەرەوە، وای ئەزانی دایکی قاپی‌یەکە لەوناکاتەوە.. هەردایکەدایکەی بوو.. ئەو عەسکەری‌یە زاڵمانە رەحم خوا لەدڵیاندا نەبوو بەزەییان بەو مناڵەدا ناهاتەوە تابەیانی ئەو دەرگایەیان نەکردۆتەوە

# رێژاو بابا یابە

لەدایك بووی ساڵی ١٩٥٣- گوندی سێ خڕانی ناوچەی تیلەکۆ

ئێمە چوار خوشك‌و دوبرابووین، زەوی‌و زاری کشتوکاڵیمان هەبوو



ئاژەڵیشمان هەبوو ژیانمان باش بوو بەخۆشی ژیانمان دەگوزەراند.. بەتایبەت من مناڵ بووم هیچ ئەرکێکی‌وا نەخرابووە سەر من تاماندوبم پێوەی.. هەستم ناکرد ئەو سەردەمەی مناڵیم ژیانمان قورسی‌و ناخۆشی تیا بووبێ.. تەمەنم گەیشتبووە دەوری دەساڵ، هەراش بووم باشم لەبیرە ترس‌و دڵە راوکێ‌یەك پەیا بوو بوو لەناو خەڵکی ئاوای‌دا ئەیان ووت تاڵانمان ئەکەن..

من تائەوکاتە وشەی تاڵانیم نەبیستبوو نەشم ئەزانی چی‌یە.

بەدايكم ئەووت تالآنى چىيە؟ ئەيووت عارەب ئەڵێن داوێتى بەسەر ئەو دێيانەداو هەرچيان هەيە بردويەتى دێن مەڕوماڵآتەكەمان ئەبەن، ماڵەكەمان ئەبەن... رەنگە بڵێم بۆيەكەمجار هەستم بەترس كردبێ ئەو كاتەبووەو لەتالآنيەوە ترسام.. هەر ئەوترسەيش لەمناڵيەوە لەگەڵمايە ئێستاش باسى فەرهوودو تالآنى بكەن موچوڕكە بەلەشمدا دێت..

بەخوا هەر دوو سێ ڕۆژ بوو قسەكە بڵاو بوو بووەوە هاتن (عارەب پاپەتى) دايانە سەرماندا خۆمان لەترسا ئاوايمان جێ هێڵاو چووينە ئەو چەمانە خۆمان شاردەوە.. هەرچى لەئاوایدا بوو برديانو لەدەشتو دەريش هەرچى مەڕو ماڵآت هەبوو برديانو ئاگريان نابەئاواييەوە.. خوا ئاگادارە خانويەكيان بەساغى نەهێشتەوە ئەتووت هەق باوكيان لەسەرمانە.. ئيتر بارمان كردە كانى (عوبێد ناو) زەنگە بان ئاوەسپى.. خەڵك هيچى نەما بەچى ماڵ دروست ئەكەيتەوە ئەوەى هەت بوو لەمەڕو ماڵآتو ئەشيايى ناو ماڵ (بەجلو جۆرەكانيشمانەوە) گشتيان برد.. ئێ بەهەموو ئاوايى پارەى بارێ دارمان نەبوو دارەڕاى يەك خانووى پێ بكەيتەوە.. خەڵك ئەو كاتە ئەوەندەى هەبوو بيخوات.. ئێمە چووينە (كانى عوبێدە) هەندێ لەماڵەكانى تر چوونە دێيەكانى ترئيتر هەريەكەو رووى كردە ئەو دێيانەى كەنەسووتا بوون.. چونكە حكومەت گۆڕا هەمووى هەر شەش مانگ بوو ئەو حكومەتە دەوامى كرد، ئيتر خواى ئێمە كردى روخانيان پێيانيان ئەوت (حكومەت بەعسيەكان.. ئەها ئێستايش خەڵك ئەڵێ ساڵ بەعسىيەكە، ئەوانە بوون)..

ئيتر نازانم چەند ساڵ دواى ئەوە بوو.. بەخوا هەرسێ چوار ساڵ بوو لەكات شەڕى جەلالىو مەلاىيەكەدا بوو كورە زۆر مناڵ بووم، تۆش وەك برام واى بەقورئان بالق نەبوو بووم دامیانە شوو بە (علی مجيد غەنى) كەئەو خەڵك كانى عوبێد بوو ئەو پێنج شەش ساڵ لەخۆم گەورەتر بوو.. لەدێى كانى عوبێديش هەر ژيانمان بەئاژەڵدارىو كشتوكاڵ كردنەوە ئەبردەسەر.. دێهات هەمووى وابوو.. ئيتر تاساڵى ١٩٧٤ بەبێ كێشە خەريكى ماڵدارى

بووین و من ئەوکاتە دوو منداڵم هەبوو حسین و ئاوازو دووگیانیش بووم.. شەڕ لەنێوان حکومەت و مەلامستەفا هەڵگیرسابووەوە.. تۆپ بارانی دێهاتەکان ئەکرا دێیەکەی ئێمە لەترسا چۆڵی کردو بۆ نەگبەتی تۆپێ دابووی لەخانووە کەی ئێمە روخاند بووی.. دوای ماوەیەك گەڕاینەوە ئاوای و سەر لەنوێ و بەهەزار هیلاکەت خانوومان چاککردەوە..

دوای ئەوە بوو شۆڕش تێك چوو. ماوەیەك دونیا ئارام بووەوە بەڵام ئەوەندی پێ نەچوو حکومەت کەوتە گواستنەوەی ناوچەکانی ئەو سنوورانە.. من ئەوانەم نازانی بەڵام زەلامەکان زۆر ئەترسان ئەیانووت حکومەت نیازی خراپە.. دێهاتەکانی ئەو سنورە رائەگوێزێ و ئەیانهێنێ موجەمەعیان بۆ ئەکات.. جاری وابوو ئەوەندە ئیشو کارمان زۆر بوو ماندو ئەبووین.. ئەمووت کورە ئەو دێهاتانە نەجاتیان بووە بۆ خۆیان ئەچنە موجەمەع خۆبەس نەبێ ئیتر دروێنەو ئیشی دەشت و دەریان نامێنێ. خۆئێمە فەوتاین بەدەشت و دەرەوە، ژیان قورس بوو ئەوکاتە فەلاحەت کردن و مەڕداری گران بوو..

ئیتر هەر ئەوە بوو خەڵکەکە ئەترسان و هێیش لەدێیەکانی ئێمە نەبوو.. وردە وردە پێشمەرگە پەیدا بوونەوە، خەڵکەکە ترسەکەی رەویەوە ئەیانووت ئەگەر پێشمەرگە هەبێ حکومەت ناتوانێ دێهاتەکان بروخێنێ و خەڵکەکەی بگوازێتەوە بۆمجەمەع ئەگەر جەیش و جاش بێن و بیسوتێنن و بیشیڕوخێنن.. خەڵکەکە ئاوەدانی ئەکاتەوە.. ئەوە بوو دوای شەڕی ئێران و عێراق هەڵگیرسا. حکومەت ئالآیە شەڕی ئێرانەوە ئێمەی لەبیر چووەوە.. هەرچەندە دوعای شەڕ خراپە.. بەڵام خۆزگە هەر شەڕی بوایا لەگەڵ ئێران ئەگەر ترس حکومەتێکی تری هەبوایا ناپەرژایە سەر ئەوەی ئێمە ماڵ وێران بکات..

ئەو شەش حەوت ساڵەی شەڕی بوو لەگەڵ ئێراندا ئێمە حەساینەوە.. هەرچەندە زوو زوویش جەیش و جاشی ئەهاوردە سەرمان بەڵام پێشمەرگەیش گەلێ زۆر بووبوو حکومەت لەحەقی نەئەهات و ترسمان

نەبوو.. ئەوەی لێی ئەترساین کۆپتەر بوو کە رەمی لەدێیەکان ئەکردو جاری وابوو سەیارە لەشارەوە ئەگەڕایەوە لەرێگەو بانەکان ئەیسوتانو شوانی ئەکوشتو هەندێ جار دەغڵو دانیشمانی ئەسوتان.. بەلاّم هەر ژیانەکەمان خۆش بوو ترسەکەمان کەمتر بوو بۆ خۆمان حوڕ بووین بەخوا دێیەکانمان وەك بەهەشتی لێ هاتبوو.. بەلاّم برا نەیان هێشت، هەواڵەی خوابن ژیانیان لێمان کردە دۆزەخ..

رێی هاتوچۆی شاریان لێمان بری.. حکومەت حەساری خستە سەرمان گرانیان خستەوە.. ئەوەی ئەچوو بەرەو شار ئەیان گرد.. نەخۆشییەك شتێ ببوایا نەمان ئەوێرا بیبەین بۆ شار، دێیەکانمانی کردبووە ناوچەی موحەرەمە).. لەمەعەسکەرەکانی شارەکانەوە رۆژانە تۆپ بارانی ناوچەکەی ئەکرد.. نازانم دنیا بۆ والەپڕ گۆڕا.. وتیان حکومەت قواتی زۆری بردوە بۆسەرو بۆ سەر سەرکردایەتیو بارەگاکانی پێشمەرگە..پێشمەرگەی ناوچەکەی ئێمەشیان برد بۆ ئەو ژورە بۆ بەرگری کردن.. مانگێ زیاتریان پێچوو کاتێ گەڕانەوە بەوەزعێکی زۆر خراپەوە هاتنەوە تێك شکا بوون، حکومەت کیمیای تەقانبوو دێیەکانیان گشتی روخاندبوو. خەڵکەکەی زۆربەی گیرابوو.. کەپێشمەرگەکان هاتنەوە ئەمانەیان گێڕایەوە ئەیان ووت ئەمجارە دەست لەژنو منداڵیش ناپارێزێو بەشۆفلێ خانووی روخاندوە بەسەر ژنو منداڵدا.. ئەیانووت کیمیایی تەقاندووەو خەڵکی زۆری کوشتووە.. ئەیانووت قواتەکەی زۆرەو لەکێشدا نییەو بەرگری ناکرێ.. ئەیانووت رۆژە رەشەو رۆژ ئەو رۆژەیە خۆت رزگارکەی.. ئەشیانووت ئێمە رێگە لەکەس ناگرین ئەڕوات خۆی ئەدات بەدەستەوە یان لەدێهاتەکان ئەمێنێتەوە..

ئێمە مەرگو ژیانمان بەسترابووە پێشمەرگەو شۆڕشەکەوە.. ئەگەر ئەوان تێك نەشکایانو سەرکردایەتی نەگیرایا یاحکومەت نەیئەتوانی دێهاتەکان بڕوخێنێ.. پێشمەرگە ئەمانی پاراست.. بەلاّم ئەوان شکستیان خوارد بوو، بۆ ئێمە رۆژە رەش بوو.. نەمان ئەزانی چی بکەین.. ئەچیت بەرەو شارەکان

ئەتگرن.. ناچی و لەدێیەکەدا ئەمێنیتەوە ڕۆژانە تۆپ بارانت دەکات و ئەڵێن پەلاماری هەموو ناوچەکە ئەدات و نەك هەر دێیەکان ئەسوتێنیێ و تالآنی ئەکات هەموو خەڵکەکەشی ئەگرێت و کەس نازانێ بۆ کوێی ئەبات.. وەرە ژیانێکی چەند زەحمەتە دوارۆژی خۆتت لێوە دیار نەبێت و لەبەردەم دوو ڕێگادا بیت هەردووکی چارەنوسێکی نادیاربێ..!! هیچ ئومێدێکمان بەژیان نەمابوو هەموو ژیانمان بووە ترس و دڵەڕاوکێ ئێستا نائێستا تۆپێك دێت و دەداتە سەر خانووەکەتداو ماڵ و منداڵت هەموو ئەکوژێ.. مردن خۆش بوو لەوە ئەترسای برینداربی و بەو حاڵەوە چی ئەکەیت..

لەپایزی پێش ئەنفالەکەدا تەیارە هاتە سەر دێیەکەمان و زۆر بەخەستی بۆردوومانمانی کرد (٥١) هاولآتی ئاوای بریندارکردم و کوژران.. من خۆم خەسوم برینـــدار بـوو.. وەرە لەدێیـەکی کـەلاوەدا ڕێگـای شـارت نـەبێ داودەرمانێ نەبێ، (٥١) کەس بەر ڕەمی تەیارە بکەون.. کۆمەڵێکی زوو نەجاتی بوو مردن.. بەڵآم ئەوانەی کەبریندار بوون زۆر ڕەزالەتیان بینی.. بەخوا شەش مانگ دوای ئەوە ئەنفالەکە بوو.. هەبوو ئەو شەش مانگە هەر بەبرینداری مایەوەو دوای بەو بریندارییەشیەوە ئەنفال کرا..

ئیتر ئەو شەش مانگەی دوای ئەو کارەساتەی بەسەر گوندەکەمان هات تائەنفال ئێمە هەر ڕۆژێکمان مردنێ بوو.. بەشەو نانمان دروست دەکردو شەبەق ئەبوو بچینە ئەو جەوەڵە.. لەبن ئەو کەلوەزو کونە تەیارانەدا کەزووتر خۆمان دروستمان کردبوو خۆمان ئەشاردەوە تائێوارە.. حاڵمان نەبوو وەرە شەش مانگ شەواو شەو وەرە دەرەوە.. من کۆمەڵێ منداڵیشم هەبوو (حسین لەدایکبووی ١٩٧٠بوو، ئاواز ١٩٧٣، جیران ١٩٧٥، سیروان ١٩٧٨، پشتیوان ١٩٨٠، ئارام ١٩٨٢، هاوکار ١٩٨٤)و ئەو کاتەش حامیلە بووم.. وەرە بەحەوت منداڵەوە شەو لەوکەلوەزو هەردانەوە بگەڕێرەوە ئاوای و تادەمەو بەیان نان دروست بکەو هەرشەبەق بگەڕێرەوە بۆ هەردەکان.. ژیانێکی زۆر ڕەزالەتمان بینی یاخوا قەت کەس نەیبینێ و دوبارە نەبێتەوە..

(باوك مناڵەكانم) كەوتە شوێن پێشمەرگەو ئێمەی بەجێ هێشت.. ئەيووت پياو ئەبێ لەم رۆژەسەختەدا بەرگرى لەميللەتەكەى بكات.. ئەو زووتر چەكدار نەبوو لەوكاتەدا چەكى هەڵگردو رۆيى.. ئەو رۆژەى رۆيشت مناڵەكان پێيان ناخۆش بوو ئەيانووت (باوكە زووبێرەوە) باوكيان رۆيى.. ئيتر من بەكۆمەڵێ مناڵى سەرگەردانەوە نەم ئەزانى چى بكەم.. ئەيانووت حكومەت قواتێكى زۆر زۆرى لەدەورى ناوچەكە كۆكردۆتەوەو لەهەمووڵاوە پەلامارمان ئەدات (كێومالّى ئەكات) لەخوارەوە بەجاش و جەيش و لەئاسمانيشەوە بەكۆپتەر.. هێشتا هجومەكەى دەستى پىٚنەكردبوو بۆ سەرمان تۆپ باران و رەمى كردنى تەيارەى بەدەقەوەستانى نەبوو.. نەشەو نەرۆژ ئەتووت شەستەى بارانە ئاوها گوللە تۆپ ئەيدابەو ئۆندو چەم و كێوانەدا.. توشى سەرگەردانىيەك بووين هەر مەپرسە ئاخر نازانى لەرۆژىوادا پەنابۆ كوێ بەرىو رۆلەكوێ بكەين هەمووڵايەك هەردوژمنتە.. زەوىو ئاسمان و دارو بەرديشمان لێبوو بوو بەئاگر..

ناچار بەخۆم و مناڵەكانەوە بەرەو ماڵى باوكم كەوتمە رىٚو چوومەوە لاى ئەوان.. گەر هەرچيەكمان لىٚهات لەگەڵ ماڵ باوكم دابم باشترە.. ئەمە رۆژە رەشە..!! ماڵ باوكم لە(سێ خڕان)بوو..

ماڵ باوكم تەرەكتەرێكيان هەبوو لەئاواييەكەدا چوار تەرەكتەرى تريشى تيا بوو هەرچى ژن و مناڵ ئەو ئاواىيەيە سوارى ئەو پێنج تەرەكتەرە بووين و چوين دوو رۆژ لە(كاكە برا)ماينەوە، دواى رامان كردە (ملە سورە)و دووشەويش لەوێ ماينەوە.. بەلاّم ئاگر ئەبارێ.. وتمان بەدزيەوە خۆمان ئەگەيەنينە نزيك (شار).. خۆمان ئەكەينە كەلار داولەو مالأنە خۆمان ئەشارينەوە تابزانين خواچى ئەكات.. زورتر ئەيانووت جەيش و جاش لەهەموو قوڵەكانەوە پەلاماريان داوەو چواردەورى گشت ناوچەكەيان گرتووە.. بەلاّم ئێمە چوزانين ئەمان وەك ريزى مێرووله بەدواى يەكەوە بەدەورى ناوچەكەوەن و رێگا نادەن كەس دەربازى بێت.. بەپىٚى خۆمان

چوینە ناویانەوە.. هەموو ئەو ژنو منداڵەی لەناو ئەو پێنج تەرەکتەرە بووین کەوتینە ناو کەمینی جاش و جێشەوەو گرتمانیان..

ئەو شەوە هەرلەو دەشتەدا هێشتمانیانەوەو چواردەورمانیان گرتبوو.. لەبەین هەر مەترێکدا دوو چەکدار بەتفەنگەوە بەدیارمانەوە بوون.. تفەنگەکانیشیان گرتبووە دەسیانەوە.. تابەیانی ئەوانیش وەك ئێمە نەخەوتن و ئێمە وەك ئاژەڵی بریندار لاڵ و پاڵ کەوتبووین و ئەوانیش وەك دار بەدیارمانەوە وەستابوون..

هەندێ جار مرۆڤ ئەوەندە ئەترسی دوای ناتوانی باسی ئەو ترسە بکەی نازانی چۆن باسی کەی چونکە هەموو ترسێك وەك یەك نی‌یە.. ئێمە ئەو شەوە ترسەکەمان جیاواز بوو من لەهەموو ژیانمدا بەقەدەر ئەو شەوە نەترساوم بڕوابکە پێمانیان بووتایە هەستن و راکەن ئازادتان ئەکەین، بڕوا ناکەم هیچ کەسێکی هێز لەئەژنۆیا بووبێت تابتوانێ بڕوات.. منداڵەکان لەخۆمان خراپتر.. ئێمە لەناو تەرەکتەرەکان هەندێ کەل و پەل و خواردن و ئاومان پێ‌بوو، بەلاَم ئەوان تەرەکتەرەکانیان لەدور خۆمان دانابوو رێگەشیان نەئەدا بچین بۆئەوەی ئەشتیاکان بهێنین.. ئەو شەوە منداڵکان هەر زیرەیان کرد.. کزەبایەکی ساردی ئەهات ئەم گەرمیانە بەشەو فێنکە.. ئەو کاتەیش هێشتا سەرەتای بەهاربوو شەوی ساردبوو.. ئەوەندە زاڵم بوون نەیان ئەهێشت بچین هەر سەروبەتانی و دۆشەکە شڕلەناو کەل و پەلەکانی خۆمان داگرین.. بەلاَم تارۆژ بووەوە جاشەکان هەر خەریك بوون ئەم دیوو ئەو دیویان ئەکردو موشەموشی ئەوەیان بوو شتێکیان دەست کەوێ.. هەرچی پەڕۆو پاتاڵمان هەبوو هەڵیان رشتبوو بەدوای پارەو ئاڵتون و شتی‌بەنرخدا ئەگەڕان..

کەرۆژ بووەوە کۆمەڵێ زیلی عەسکەریان هاوردو ئێمەیان خستە ناو زیلەکانەوەو تەرەکتەرەکانیشیان خستە دوامان.. شەو جاشەکان ئەوەندە ئەو کەل و پەلەیان ئەمدیوو ئەودیوو کردبوو تەرەکتەرەکان لەوە ئەچوو هەربەپڕ کەل و پەلەوە لەئاوای‌یەوە بەدوای ئەو زیلانەوە بوو بێت و

لەوەنەئەچوو نەفەرێکی تیا بووبێ.. وایان دابووە سەریەکدا، ئەتووت پڕی کەل‌و پەلی ناوماڵە..

بەوشێوەیە خستمانیانە ڕێو بردمانیانە قۆرە تـوو.. کەچووینە ئـەوێ سەیرمان کرد خەڵکێکی تری زۆری لێیە.. ئەوانیش هەمووی هەر لـەڕێو باندا گیرابوون.. خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی گەرمیان بـوون.. دیـاربوو قۆرەتوو دانرابوو بۆشوێنی کۆکردنەوەی ئەو خەڵکە چونکە هەموو سەر ڕێگاو چواردەوری بەعەسکەری‌و قواتی زۆر دەورە درابوو.. ئەوەی لەوچەند شەوو ڕۆژەشدا لەڕێو بانەکان گرتبوویان هەموویان هاورد بوو بۆ ئەوێ.. جارێ ئەوەی لەوێ خڕکرابووەوە تەنها ئەو خەڵکە بوون کەبەرەو شارەکان هـاتبوون تاخۆیـان لەمـەرگ ڕزگارکـەن‌و بەحساب بـەرەو نـاو حکومـەت هاتبوونەوە چونکە دیعایەش زۆر ئەکرا کەحکومەت سـێ ڕۆژ عـافواتی دەرکـردوەو ئـەوەی لـەو سـێ ڕۆژەدا بمێنێتـەوە لێی ئـەبورێ‌و ئـەوەی لەلادێکاندا بمێنێتەوە ئەدات بەسەریاندا.. ئەوانەی کەئەوکاتە لـەقۆرەتوو خڕمانیان کرددبۆوە هێشتا ئەوانەیان نەهێنابوو کەلەدێـهات‌و ئـەو چـەم‌و هەردانەدا گرتبوویـان تەنها ئەوانە بوویـن کە خۆمان هـاتبووین‌و لەڕێگـەو بانەکانی نزیك شارەکان دەستگیر کرابووین..

سێ‌شـەوو سـێ‌ڕۆژ ئێمەیان لە(قۆرەتـوو) هێشـتەوە لەوسـێ شەووسـێ ڕۆژەدا بـەردەوام بـەئیڤای عەسـکەری‌و بەگلاّبـەو بەتەرەکتـەری دێهاتـەکان خەڵکیان خڕکـردەوە.. بـڕوا بکـە ئـەوەندەیان خـەڵك هێنـا لـەو سـێ‌ڕۆژەدا دەشت‌و دەر نەیئەگرد قەد بڕوام ناکرد ئەم گەرمیانە ئەوەندە خەڵکی تیابێ بەشارەکانیشەوە..

بـەخوا بەقـەدەر یـەك قەڵایـەك هـەر کەل‌وپـەلیان خڕکردبـۆوەو لـەولای مەعەسکەرەکەوە.. بەخوا مـن ئەڵێم سـەد تۆبڵێـی هـەزار بـەس تەرەکتـەریان بەدوای‌یەکدا ڕیز کردبوو..

ئەوسێ ڕۆژوو سێ‌شەوە هەر لەتینوان‌و لەبرسا خـەریك بـوو بمریـن بەو هـەموو خەڵکە سـێ تەرەکتـەریان هێنـابوو ئاویـان بۆمـان ئـەهێناو بـەزیلی

عەسکەری ئەگەڕان و سەموونیان بەناو خەڵکەکەدا فڕێ ئەدا.. بەڵام گیانمان بەخواو بەخەڵکی کەلار بوو.. ڕۆژانە لە ماڵەکانی کەلار نانیان کۆکردەوەو بۆمانیان ئەهاورد..

زیلی عەسکەری و سەیارەی کۆستەریان هاورد وەك داروبەرد کەوتنە بارکردن ئەو خەڵکە.. خوایە ئەبێ بۆکوێمان بەرن، من باوك منداڵەکان لێمان دابڕاوە.. حسین کوڕ گەورەکەیشم لەگەڵ ڕانەکەیا بوو هەر نازانم کەوتە کوێوە لەم هەموو ئاگر بارانەدا چی وەسەرهات.. واخۆیشمان ئەبەن و مەگەر هەرخوا بزانێ بۆکوێیەو چیمان لێئەکەن..

خستمانیانە ناو ئەو سەیارانەوە.. ئێمە بەر وەجبەی زیلەکان کەوتین و بردمانیان بۆ تۆبزاوا، ئێمە چەندێ بووین بەو خوایە ڕەنگە دووئەوەندی ترخەڵکی لێبووبێ.. مەعەسکەرەکە هەمووی دەوری گیرا بوو زۆر گەورەبوو لەناویدا قاعەی زۆر درێژ درێژی تیابوو.. کەوتنە ناونوس کردنمان و هەر قاعەی (٥٠٠) کەسیان تێکرد.. ئێمە تابەرمان کەوت ناومان بنوسن و بمانخەنە قاعەوە گەیشتە شەو.. خوائاگادارە ژنێك لەریزەکەدا خۆی و دوو منالی بەرئەو (٥٠٠) کەسەی قاعەکەی ئێمە کەوتن منالێ هەروا حەوت هەشت ساڵانیشی ناوی دەرنەچوو بۆقاعەکە.. ژنەکە چەندێ پاڕایەوەو پەلاماری منالەکەیدا ئەو عەسکەرە زاڵمانە نەیان هێشت و بەزۆرو بەپاڵ خستیانە ناوقاعەکەوەو منالکەیشی لەدەرەوە بوو.. ئیرادەی ئەو خوایەو یەك بارانێك دایکرد هەر زۆرزۆر بەتین بوو.. خەڵکی زۆر لەناو ئەو حەوشەی مەعەسکەرە بوون و تابەیانی باران داوێتی لێیان.. ئەو منالەی ئەو ژنە تابەیانی لەبەر ئەو بارانە بوو تابەیانی ئەیدا لەدەرگای قاعەکەمان و بۆدایکی ئەیزیڕان.. ئەو ژنەیش هەر هاروشێت بوو لەتاوا ئەم لەم دیووی قاعەکەوەو منالەکەیش لەو دیووی قاعەکەوە.. تابەیانی هەر لورەیان هاتووە.. ئەو ژنە جاروابوو سەر خۆی ئەدابەو دیوارانەدا.. سەرباری ئەو وەزعەی خۆمان کەگشتمان وەك ئەومان بەسەرهاتبوو هەریەکەو بەشێوەیەك لەئازیزو جەرگەکانی خۆمان دابڕبووین بەڵام ئەوەی ئەو ژنە عەزابی خۆمانی

لەبیرمان بردبۆیەوە زۆر بەزەیمان بەودا ئەهاتەوە.. بەو خوایە تابەیانی گشتمان وەك ئەو ژنە جەرگمان بۆئەو منالە ئەسوتا.. منالەکە لەودیوو دەرگاکەوە ئەپاڕایەوە دایە توخوا قاپی‌یەکە بکەرەوە، وای ئەزانی دایکی قاپی‌یەکە لەوناکاتەوە.. هەردایکەدایکەی بوو.. ئەو عەسکەری‌یە زاڵمانە رەحم خوا لەدڵیاندا نەبوو بەزەییان بەو منالەدا ناهاتەوە تابەیانی ئەو دەرگایەیان نەکردۆتەوەو (حیلکە حیلك) پی‌ئەکەنین‌و ئەهاتن‌و ئەچوون گاڵتەیان پی‌ی ئەکردو منالەکەیان ئەترسان.. بەیانیش کاتی قاپی‌یەکەیان کردەوە ئەو منالەو دایکەکەی واباوەشیان کرد بەیەکدا موچوڕکەیەکی خۆشی سەرتاپای لەشی داگرتبووم بەوخوایە لەناخەوە لە خۆشیدان بۆیان ئەگریام..

هەر ئەو رۆژە ئێمەیان لەتۆبزاوا هێشتەوە، جی‌وڕی نەبوو لەسەعاتێکدا سەد سەیارە خۆی ئەکردە ناو مەعەسکەرەکەداو ژن‌و منالی دائەگرد.. ناومانیان نوسیاوەو ئەمجارە خستیانمانە ناو سەیارەی (قەپاتەوە) هەندی رۆیی لەوە ناچوو زۆر بووبی.. لەشوێنێك وەستاو دەرك سەیارەکەیان کردەوە دامانیان بەزاند قافڵەیەکی گەلی زۆر بووین هەموو سەیارەکان وەکو یەك وابوون ئەتووت یەك سەیارەیەو ئاوێنە بەرامبەری دانراوە نازانم ئەم هەموو سەیارەیەیان لەکوی بوو هەمووی یەك رەنگ‌ویەك شێوە.. ئەویش مەعەسکەربوو قاعەی درێژ درێژی هەبوو (دوبز)بوو.. عەسکەری زۆری لی‌بوو.. لەوێش بەناونوسین خستمانیانە ناو ئەو قاعێلەوە پێش ئێمەیش خەڵك تری تیابوو پەیتا پەیتایش خەڵکی تریان ئەهاورد..، من هەر چاوم ئەگێڕا ئەمزانی بەخوا مێردەکەیشم‌و کوڕەکەیشم کەلەگەڵ رانەمەڕەکەیا بوو ئێمە جێمان هێشت هەر گیراون.. ئەمووت بەڵکو لەناو ئەو خەڵکەبن.. لەتۆبزاوا زەلامی گەنجی زۆرلی‌بوو بەلام لە(دوبز) زەلامی گەنجم نەدی..

ئەوهەموو خەڵکەیان ئەهاورد هەر تاقیبم ئەکرد.. گەنجێکم نەدی تەنها پیرەمێرد نەبی.. ئیتر بی‌ئومێد بووم لەوەی تازە یەکتر ببینینەوە.. بەلام دڵەوئۆقرەی ناگرد بەعەزرەتەوە بووم تەنها خەبەرێکیانم دەست بکەوی..

ئیتر سیٚمانگ لە(دوبز) هێشتمانیانەوە.. لەچاو ئەو شەورۆژەی (تۆبزاوا) زۆر باشتربوو بەڵام زۆر نەخۆشی لەناوماندا بڵاوبووەوە (مۆرانە) لێمانیدا (هەر گەڕوگول) بویمان لەچڵکنیدا..

منداڵ گشتی تووشی (سورێنجە- سورێژە)بوو.. زۆری کوشت.. کەهەر کەسێکیش ئەمرد ئەبوو ئێمە لەپەنجەرەکەوە خەبەربدەین بڵێین خەڵکمان لێمردووە.. ئیتر خۆیان ئەهاتن جەنازەکەیان ئەخستە سەر عارەبانەی دەستیو ئەیانبرد.. نەمان ئەزانی چیلێ ئەکەن..

ئێمە کەبردمانیان مانگی رەمەزان بوو.. هەمان بوو بەرۆژو بوو، نوێژی ئەکرد.. بەڵام لەوەئەچوو پێیان ناخۆش بووبێت نوێژو رۆژوو بگرین.. چونکە رێگامانیان نادا دەست نوێژ هەڵگرینو بای ئەوە خواردنیشیان نادایێمان کەپشتی پیێ ببەستیو بتوانی بەرۆژووبی.. هەروا چۆریێ شۆربا یان سەموونێ رەق چی پێئەکەیت.. ئەویش ئەبوو سەعاتێ لەریزدا بووەستی تابەرت ئەکەوت.. وەك تەعزیبیش ئامرێکی لێبوو گەلێ زاڵم بوو ئەهات ئەکەوتە ناومان لەکاتی نان وەرگرتنەکەدا ئەیدایە (قولەقاپماندا) بەخوا رۆژی قۆناغە تفەنگێکیدایە قولەقاپی ژنێکدا چەرم هەموو پای داماڵیو تادوو مانگ دوای ئەوەیش خوێنی لێئەتکا..

لەرۆژی جەژنی رەمەزاندا دڵمان خۆش بوو بەڵکو ئەمە خوایە بنێی لەدڵ ئەم زاڵمەو جەژنەیەو بەزەی پێمان دابێتەوە هیچ نەبێ ئەم دووروژەی جەژن هەرلەناو قاعەکان بمانکەنە دەرەوەو لەحەوشەی مەعەسکەرەکەدابینو ژەمە خواردنێکی باشمان بدەنێ.. کەچی ئەو رۆژە لەهەموو رۆژەکان خراپتر بوون هەریەکەم رۆژی جەژن (٥) قاعەیان لێمان بارکرد.. کەلەسەرووی قاعەکانی ئێمەوە بوونو سەرپاك باریانیان کردو ئیتر کەس نەیزانی بۆکوێیان برد.. شورتەیەکی لێبوو پیاوێکی بەرەحم بوو پرقورگی بوو بوو لەگریان پێمانی ووت ئەیانبەن گشتیان ئەکەن بەژێر خۆڵەوە.. یان دەرمانو کیمیاییان پیێتاقی ئەکەنەوە..

تائێمەیان لە(دوبز) گواستەوە سێجار وەجبەی تریان برد.. ئیتر جارێ ئەیانووت ئەیانبەن بۆ(تکریت)وجارێ ئەیانووت بۆ(سەماوە). جارێکیش ووتیان بۆ(سەلمان)ە..

هەندێ جاریش ئەهاتن بەکۆمەڵێ قەمەرەوە عارەب دزداشە لەبەردائەبەزین و ئەکەوتنە ناو ئەو قاعانە ئەگەڕان بەناو ژنەکاندا.. ئەیانووت ئەمانیش هەرکەسێکیان بەدڵ بێت و جوان بێت ئەیبەن بۆخۆیان.. خوا هەڵناگرێ لەقاعەکەی ئێمە کەسیان نەبرد..

توخوا تالەبیرم نەچووە بائەوەت بۆبگێڕمەوە کەوەجبەکانیان ئەبرد بەژمارە ئەیانبرد بڵێین وەجبەی (٥٠٠) کەس بوون.. کەبەناو خوێندنەوە بانگیان ئەکردو وەجبەکانیان بەڕێ ئەخست..خەڵك هەبوو لەوێ لەیەکتر دابڕا.. ناوی خوشکێکی بەر ئەو وەجبەیە ئەکەوت کەئەیانبردو ناوی ئەمی بەرنەئەکەوت.. ژنێ لەگەڵ ئێمەدا بوو لەگەڵ دووبراژنیدا بوو، ژنەکە ناوی (جەهان)بوو لەو وەجبانەدا براژنەکانی بەرکەوتن و ناوی خۆی تیانەبوو چەندێ هەوڵیدا کەخۆیشی لەگەڵ براژنەکەی دابچێت نەیان هێشت.. لەوەودوا زۆر بەزەیم پێیدا ئەهاتەوە زۆر کزومات بوو، سێمانگی بەو حاڵەو بەهیلاکەت بردەسەرو رێك دوو رۆژ بەرلە جەژنی قوربان بوو ئەو شورتەیەی کەووتم پیاوێکی باش بوو وەستا بوو بەدیارمانەوە سەیرمانی ئەکرد لەپڕ چەکەکەی کەبەدەستیەوە بوو کەوتە خوارەوە.. زۆرداما چوومە تەنیشتی‌یەوە پرسیارم لێکرد دەنگی عافواتێ شتێ نی‌یە.. فرمێسك بەچاوەکانی‌دا هاتەخوارەوە ووتی بەیانی ئێوەش ئەبەن.. ئیتر نەیتوانی قسەبکات.. قورگی پڕبوو بوو لەگریان.. منیش دەستم کرد بەگریان.. ئەو شورتەیە دیاربوو هۆگری ئەوژیانە تاڵەی ئێمە بوو بوو حەزی ناکرد بمانگوازنەوە رەنگە ئەو شتی‌زانی بێت بۆیە وابەزەیی پێماندا ئەهاتەوە.. چوومەوە ناو ژنەکان دەستم کرد بەگریان و ووتم بەیانی ئەمانگوازنەوە، ئێمە هەموو قاعەکە زۆر سەغڵەت بووین ئەو (جەهان) ناوەی کەوتم لەبراژنەکانی دابڕابوو گەشکە گرتی و دیاربوو پیێ خۆش بوو لەوەئەچوو

هەر بەئومێد بووبێت بگاتەوە لای براژنەکانی و دیاربوو هەر دڵی لایان بوو.. براژنەکانی گەنج بوون و یەکیان تازە بووك بوو گیرابوو..!!

بەیانی زوو سەیارەیان هاورد کۆمەڵێ سەیارەی (قەپات)بوو. دنیایش گەرم بوو (تاوسان)بوو هەر خنکاین لەناو ئەو سەیارە سەر داپۆشراوەدا.. (٥٠٠) کەس بووین هەر سەیارەی وابزانم (٣٠) کەسی ئەگردو خستمانیانە رێ و چووە شوێنێ وتیان سەماوەیە بردمانیانەناو مەعەسکەرێکەوە قاعەکانی وەك ئەوانەی (تۆپزاواو دوبز) نەبوو هەمووی قاعەی بەرز بەرزبوون، هەمووی پڕی خەڵك بوو جێی نەبوو زابتێك هاتو لەگەڵ یەکێك لەسایەقەکانی قافڵەکەی ئێمەدا قسەی کردو کەوتینەوە رێ. دیار بوو وتبووی جێمان نییە..!!

هەر رۆیی و نازانم چەندێکی پێچوو بەلام بەخوا بەهەمووی سیانزە چواردە سەعات بەرێوە بووین.. کەلە جێگایەکی‌تردا سەیارەکان وەستان و دەرگایان لێمان کردەوە.. قەلایەکی بەرزو گەورەبوو جێگای دنیایە سەیارە ئەبۆوە لەحەوشەکەدا.. لەوێ دامانیان گرد. وتیان ئەمە (قەلای سەلمانە) هەمووی غورفە غورفەی لەبان یەك دروستکراو بوو.. گشت غورفەکانی پڕی خەڵك بوو تاقەتیان نەبوو سەیریشمان بکەن..

دیاربوو زووزوو وەجبەی تریان هێنابوو یان بردبوو ئەوان سایان لێخستبوو.. بەلایانەوە ئەوەنە گرنگ نەبوو کەوەجبەی تریان هێنا.. دەدەقە بۆچارەکێ لەحەوش رامانیان گردو لەوێش جێگا نەبوو خستمانیانەوە ناو سەیارەکان و کەمێك رۆیی و لەقەلایەکی تری وەك ئەوەدا دامانیان گرتەوەو وتیان ئەمەیان (نوگرە)یە.. ئەمیش بەرزبوو سێ‌قات بوو هەمووی قاعە قاعەی گەورە لەسەریەك دروست کرابوون.. هەرقاعەی (٢٠٠) کەسیان تێکرد.. خەڵکی تری زۆرێ بوو بەلام جێگای ئێمەشی لێ‌ئەبۆوە..

کەچووین ئەو ژنەی لەگەڵمانابوو (جەهان) براژنەکانی خۆی لەوێ بینیەوە.. ئێمە هەر نەمان زانی کەکچێکی تریشمان لەگەڵ بوو، لەتۆپزاوا لەدایك و باوکی جیاکرابۆوە.. لەوێ لەگەڵ دایك و باوکی‌دا کەئەوان پیربوون

بەیەك گەیشتنەوە.. خۆرئاوابوو بوو کەگەیشتینە (نوگرە) بەیانیش مەلابانگی ئەدا خستمانیانە ڕێ، ئیتر ئەوەندە هەر بەرێگاوە بووین.. ئیتر بزانە (نوگرە) لەکوێیە بەخوا لەبن دنیابوو..!!

قەڵاکەش زۆر گەورەبوو قاعەکانی هەشت هەشت بەم بەرو بەو بەرەوە رویان لەیەکتری بوو هەرقاتی (١٦) قاعەبوو.. بێجگە لەو غورفە درێژانەی ئەم سەرو ئەوسەری قەڵاکە، کەئەوانیش پڕی ژن و منالْ بوون.. (رابیعە)ی خوشکم کەلە ئاوای (سێخران) گیرابوو.. ئەویش لەوێ بوو.. ئەوان یەکەم قافڵە بوون هەرلە تۆبزاوە برابوون بۆ(نوگرە)و سوێندی ئەخوارد ئەیووت ئەو رۆژەی ئێمەیان هاوردە ئێرە.. دیار بوو پێش ئێمە سجنی تری لێبووەو بۆئێمە چۆڵ کرابوو.. چونکە تەماتەو خەیارم لەلەقاعەکاندا بینی وەو خواردومە..

ئیتر ئێمە بەسەرهاتی خۆمانمان لەو سێمانگەدا بۆئەوان ئەگێڕایەوەو ئەوان باسی وەزعی خۆیان بۆمان کرد.. ژیانی ئێمەبەو هەموو رەزالەتی و تینوێتی و برسێتی و نەخۆشیەوە لەچاو ئەواندا وەك ئەوە وابوو لەبەهەشتدا بین..

ئەوان باسی رەزالەتی و پەت پەتی خۆیان ئەکرد چۆن خەڵك لەتینوا کوێر بووە..! لەبرسا مردووە.. لەگەرما پساوە.. ئەیانووت شەوو رۆژی وابوو (١٠٠) کەس لەو قەڵایە مردووەو مردووەکانیان لەدەرەوەی قەڵاکە داوەتە دەم سەگەوە.. ئیتر بەسەرهاتی ئەوان تەواو نابێ..! وەك جەهەنم وابوو...

ئێمە یەکەم رۆژمان لەوێ جەژنی قوربان بوو، کەچووینە ئەوێ ئەوەندەی تربووین بەبارگرانی و هیلاکەت بۆئەوان.. هەر ئەوەندە ئاوەیان ئەهێنا کەزووتر بردبوویان ئێ‌ئێمەیش (٥٠٠) کەسین..

چی لە(٥٠٠) کەس ئەکەی بەچی ئاوی ئەوەی.. هەتا هەریەکەو قوتویەکی دۆشاوی تەماتەی بەتاڵیان بۆمان هێناو تەنکەرێکی تریان هێنایە ناو حەوشەی قەڵاکە تەواو ئەوانیشمان خستبووە رەزالەتەوە..!

دونیا خۆی چەندێ گەرم بوو ئەوێ دوو ئەوەندە گەرم بوو ئاوەکەی گەرمتر.. ئاوەکەی ئەوەندە تاڵ بوو ئەتووت دەرمانیان تێکردووە.. ناوزگ ئەو خەڵکەی گشت هاوردە خوارەوە گشتی توش رشانەوەو سکچوون کرد..

رۆژی هەرنەفەری یەك سەموونی رەقیشیان ئەداپێمان بۆئەو بیستو چوار سەعاتەت تانیوەڕۆکەی تردێتەوە.. لەکاتی گەرماکەی نیوەڕۆدا ئەیان هاوردو هەرکەس ئەبوو بچێ سەموونەکەی خۆی وەرگرێ.. هەتا نۆرەشت ئەهات هەر ئەوەنەبوو کەگیانت دەرچێ.. یان کەتەنکەرەکە ئاوی ئەهێناو ئەیانکردە ناو تەنکییەکەی حەوشەی قەڵاکەوەو ئەبوو هەر کەس بچێت قوتووە ئاوەکەی خۆی وەرگرێ.. سەد کەڕەت ئەتیاندایە بەر قامچی تائەو قوتووە ئاوەت وەرئەگرد.. ئاویش چیئاو.. کەتۆزێکی بەردەستت ئەکەوت یەك لەپێ خوێ ئەکەوتە سەر دەستت، وەك خوێـواو وابوو..! رەزالەتێك لە(نوگرە) بینیمان یاخوا دوژمنیشت نەیبینێ.. وەزعێك نەباسی تەواو ئەبێ نەئەتوانرێ بگێڕرێتەوە..

ئەوە بەراست بیرم نەبوو من ئەوکاتەی کەگیرا بووم حامیلە بوومو لەدوبز لەناو قاعەکانو بەچی دەردەسەریەك منالم بوو.. کوڕبوو بەبەرد ناوکیمان بڕی.. ناویم نائازاد هەر بەئومێدی ئەوەی کەرۆژێك بێتو ئازادبین.. لە(نوگرە) ئەو کوڕەم کەهەر لەسجن لەدایك بوو لەوێ مرد.. هەر چەندە ناوی ئازاد بوو بەڵام ئازادیی نەبینی.. هەر لەناوقاعەکەدا ژیا، ئێستاش ئاهوونزولەی وا لەجەرگمدایە کەبەچی شێوەیەك کەوتە هیلاکەتو مرد.. وشك بووەوە تەنها ئێسکەکەی مابوو بەرگەی ئەو برسێتیو گەرمایەی نەگرد..

وابزانم دوومانگ ئەبوو بردمانیانە (نوگرە) رۆژێك هاتنو کەوتنە ناو ئەختیارەکان.. ئەوەیزۆر پەکی کەوتبوو کەئەیان زانی هەروا چەند رۆژێکیترئەتوانێ لە(نوگرە) بژیو دواتر ئەبێتەخۆراکی سەگەڕەش.. ناویانیان نوسیو لەگشت قاعەکانەوە بایی قافڵیەکیان نایەیەکەوەو وتیان

(صدام) عافواتی دەرکردوە ئەمانە بەرئەدەن.. ئەوانیان بردو ئێمە بڕوامان نەکرد بەردرابێتن..

چونکە بەدرۆهەر وەجبەیەکیان لەتۆبزاواو دوبزەوە ئەگواستەوە ئەیانووت بۆ بەردانەو کەچی درۆیان ئەکرد.. بەلاّم کەدوای خۆمان هاتینەوە. سەیرمانکرد راستبووکە کاتێ خۆی ئەو وەجبەیەیان بەردا بوو..

هەر چەندرۆژێ دوای ئەوەی ئەوانیان بردو ووتیان عافواتەو بەریانیان ئەدەن.. کۆمەڵێ سەیارەخۆیان کردەوە بەناو قەلاّکەداو ووتمان دیارە گەڕاندویانەتەوە.. کاتێ دایانیان بەزاند لەسەیارەکان ئەمانە هەمووی ژن‌ومناڵ‌و زەلام بوون.. زۆر جیاواز بوون لەوان هەر بەڕەنگیاندا دیاربوو لەچاو ئێمەوە ئەتووت ئێستا گیراون..

هاوردیانیان‌و تێکەڵ ئێمەیانیان کرد.. سەیرمان کرد (هەڵەبجەیین).. بەلامانەوە سەیر بوو.. ئێ هێشتائێمە لەدێهاتەکانی خۆمان بووین ئەیانووت حکومەت کیمیایی داوە لەهەڵەبجە.. دوای ئەم پێنج شەش مانگە ئەم خەڵکەی لەکوێوە هاوردوە..

کاتێ کەوتنە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆیان سەیرمان کرد ئەمان لەئێمە خراوتریان وەسەرهاتووە.. کاتێ کیمیای‌یەکە دابووی لەهەڵەبجە ئەمان رایانکردبووە (ئێران)داو ئەم ماوەزۆرە لەئۆردوگاکانی (ئێران)دا بوون.. حکومەت عافواتی بۆیان دەرکردبوو کەلە(ئێران) بگەڕێنەوە.. تەعویزیان ئەداتەوەو خانوویان ئەداتێ‌و خەسارەکانیان بۆ ئەبژێرێتەوە.. ئەمانیش لە(ئێرانەوە) بەپیری عافواتەکەوە هاتبوون‌و گەڕابوونەوە بۆعێراق.. ئەیانووت لەئۆردووگاکەوە بەسەیارەی ئێرانی‌هاوردمانیان بۆحدود سەیارەی عێراقیش هاتۆتە پیرمانەوە.. ئەیانووت شەڕی عێراق‌و ئێران تەواو بووەو رێککەوتوون.. ئەوان خەبەرو بەسەرهاتی ئەم ولاّتەیان پێ‌بوو.. ئەیانووت لەهەموو کوردستاندا یەك دێیەك چی‌یە بەپێوە نەماوەو حکومەت هەمووی روخاندوەو خەڵکەکەی (ئەنفال) کردووە.

من لە(نوگرە) لەدەم هەڵەبجەییەکانم بیست کەئێمە پێمان ئەوترێ (ئەنفال)..

هەرچەند رۆژێ دوای ئەوەی هەڵەبجەییەکانیان هاوردبوو.. ئەودوو تەنکەرەی ئاویان ئەهێنا بۆمان، یەکێکیان دەرمانیان تێکردبوو کەنەخۆشی لەناوماندا بلاوبکاتەوە.. ئەوەی لەئاوی ئەو تەنکەرەیانی خواردبوو تووشی سکچوون‌و رشانەوە بووتا مرد.. دیعایەیەکیشیان بلاو کردەوە وتیان ئەم نەخۆشیە بەبۆنەی هەڵەبجەیەکانەوەیەو ئەم جۆرەنەخۆشیەیان لە(ئێران) گرتووە.. عەسکەرەکان ئەهاتن لەناوماندا وایان ئەوت‌و خەڵك هەبوو عەرەبی ئەزانی ئەیکردە کوردی بۆمان.. بەو شێوەیە ژمارەیەکی زۆری مرد.. بڕوا بکە لەپڕ بەتەنیشتەوە ئەرشایەوەو ئەمرد.. رۆژێ دوان دوای ئەوەش هاتن بەدرۆ کۆمەڵێکیان هێنابوو وتیان ئەمانە دکتۆرن نەخۆشی کولێرا لەناوتاندا بلاوبووەتەوە (موغەزیتان) بۆهەڵئەواسین بۆئەوەی تووشی نەبن.. ئەو منالەی تۆزێ قوت‌و قەڵەو جوان بوایاو هێشتا وەك ئەوەکان وشك نەبووبۆوە (موغەزیەکەیان لەومنداڵە ئەدا)..

ئەیانووت باتووشی (کولێرا) نەبێت.. کە(موغەزیەکەیان)بۆ ئەکرد ئەویش یەکسەر ئەرشایەوەو ئەمرد.. من خۆم کوڕێکم بەناوی (هاوکار) کەچوار ساڵان بوو بەو شێوەیەو خوائاگادارە هیچ عەیبی نەبوو کەسۆندەی موغەزیەکەیان بۆبەست‌و دایان لەدەستی هەربەسەر دەستی خۆمەوە رشانیەوەو مرد.. دیاربوو هەر دەرمان زەهریان تێکردبوو بەهەموو شێوەیەك ئەیانوویست بمانکوژن بەلام بەعەزابەوە.. من کە (هاوکار) کوڕم مرد، (حاجی صالح خەڵك تەپە چەرموو)بوو، ئەو جەنازەکانی ئەبردە دەرەوە لەگەڵ چەند زەلامێکی تردا کەبەگوڕتر بوون..

کەجەنازەی کوڕەکەی خۆمی بردە دەرەوەو هاتەوە من هەر ئەگریام (وتی بۆئەگری، کێ‌ئەڵێ مەسیری خۆت‌و ئەم منالانەی ترت خراپتر نابێ.. بەخوا لاشەی کوڕەکەت هەربەسەر دەستمەوە بوو یەکێ لەوسەگە رەشانە پەلاماری داو قۆڵێکی بردە دەماو لەدەسمی سەن.. ئیتر بۆئەگری خزمەت منالەکانی

ترت بکە بائەوانیش نەمرن و نەبنە خۆراکی سەگ تاخوا دەرویەکمان لیٚ ئەکاتەوە)..

حاجی ساڵح ئەوەنە جەنازەی بردبووە دەشتەوەو دیٚبووی بەدەم سەگەوە لای ئاسای بوو.. من هەر هاورو شیٚت بووم لەتاوا، بەخوا ئیٚستاش کزەی والەجەرگمداو ئیٚستاش گویٚم لەحەپەی سەگ دەبیٚ ئەوەری ئەو رۆژانەم بیرئەکەویٚتەوە.. ئاخ چۆن لەبیرمان ئەچیٚتەوە..!!.

هەر سەعاتیٚکمان مردنیٚ بوو.. ئەوان بۆیە بەگوللە نەمانیان ئەکوشت تارەزالەتی زیاتر بچیٚژین.. بەخوا (جار جاریٚ زابتیٚ رەش بەراز ئەهات ناوی حەجاج)بوو.. کاریٚکی بەو عالەمە ئەکرد مەگەر هەر خوابۆ خۆی بزانیٚ..!؟ رۆژئاوابوو ئەهات بەناو قاعەدا ئەسوڕایەوە، ئەوەی کەوازۆر رەزیل بوایاو ئینسان بەزەی پیابهاتایەتەوە.. ئەو ئەوەی ئەبردە حەوشەی قەڵاکەو پەت پەتی دنیای پیٚئەکرد.. جاروابوو ئیختیار پەککەوتە واگیان ئەدا، ئەیبردە ئەو حەوشەیەو لەبەر ئەو خۆرە گەرمەو لەسەر ئەو چەمەنتۆیە رای ئەکشان و ئەیبەستە عەمودیٚکەوە.. تاگیانی دەرئەچوو..! کورە نازانم بلیٚم چییان پیٚمان نەکرد بەخوا ئەوەی خوا پیٚناخۆش بوو کردیان. بەخوا بەیەکەوە سیٚ ئەختیاری بەو شیٚوەیە کوشت.. لەبەر خۆرەکەو لەگەرما ووشك ئەبوونەوە.. یەکیانم ئەناسی ناوی عبدالله بوو خەڵك تەپەسەوز بوو یەکیٚ تریشیان خەڵك قەلاچەرمەڵە بوو، ئەوەکەی تریان نازانم خەڵکی چیناوچەیەك بوو.. بەوشیٚوەیە هەرسیٚکیانی کوشت.. بەمردوویٚتیش هەر سوکایەتیان پیٚمان ئەکرد.. لاشەکەت بخەنە بەردەستی سەگ و لەجیاتی کفن و دفن.. بددەنە دەم سەگەوە، ئاخر لەچی زەمانیٚکدا بووە.. لەسەدام بەولاوە.. بەخوا ئەوانەی کەجەنازەکانیان ئەبردە دەرەوە ئەیانووت هەمووی هەر لەمەو هیچ نییە چاڵی پیٚبکەیت هەردای ئەپۆشیت و سەگەکان بەبەرچاو خۆمانەوە لەمەکەی سەری لائەدەن و لاشەکەی ئەخۆن.. بەلاٚم کەئەو دەرمانەیان کردبووە ناو تەنکەرە ئاوەکەوەو لەوشەو رۆژەدا ئەوەنەی مرد هەر لەژمارە ناهات.. وتیان حەفارەیان هیٚناوەو چاڵی دریٚژ دریٚژیان کردوە.

وەك ئەیانووت ئەم سەرو ئەوسەری دیار نەبوو.. هەموویان پڕکردبوو لەو جەنازانەو لمەکەیان کردبووە سەریا.. ئەوەی بەر ئەو وەجبەیە کەوت شانسی هەبوو بەس نەبێ نەبوونە خۆراکی سەگ.. خۆکێ ئەڵێ سەگ ئەوانیشی دەرنەکردووە.. ئەوەیان مەگەر خوابزانێ..؟

ماوەی ٤مانگ بەو شێوەیە لە(نوگرە) ماینەوە.. بەڵام زۆر زۆری لێ مردو ئەوەی مابوینەوە هەربایی وەجبەیەك سەیارە ئەبووین.. ئیتر لەوە ئەچوو زانیبێتیان ئێمە هەرماوین‌و بەرگەی هەموو ئازارو مەینەتیەك ئەگرین.. دوای ئەو چوار مانگەی (نوگرە)و(سێ‌مانگ لەدوبز بووین) بەهەمووی حەوت مانگ بوو.. دوای ئەو حەوت مانگە رۆژێك هەندێ سەیارەیان هێناو خستمانیانە ناو ئەو سەیارانەوە.. هەر سەرداپۆشراو بوون.. رەنگیان بۆربوو جامەکانیان تاریك بوو.. سوارمانیان کردو بردمانیان بۆ(سەماوە).. هەربۆ ئەو مەعەسکەرەی کەچوار مانگ لەوەوبەر بردمانیان‌و جێ‌نەبوو لەوێ گلمان بدەنەوە.. کەگەڕاندمانیانەوە بۆسەماوە هەرسجنی تیا مابوو.. لەقاتی سەرەوەو لەپەنجەرەی غورفەکانەوە کۆمەڵێ کچی گەنج‌و جوان‌و جاهێڵ سەریان دەرکردبووە دەرەوەو دەستاین بۆمان هەڵئەبڕی.. وەك ئەوەی پێمان بڵێن ئێمەیش ماوین..

ماوەی حەوت رۆژ لەسەماوە هێشتمانیانەوە.. حەمامیان بۆمان گەرم کردو سابون‌و تایتیان بۆمان هاوردو وتیان ئەبێ خۆتان بشۆن‌و ئەو زەلامەی سەرو ریشی زۆربوو تەراشیان بۆیان کردو ئەو حەوت رۆژە زۆر خزمەتیان کرد ئەیانووت.. بۆئەوەی کەچوونەوە نەڵێن خزمەت نەکراوین.. بڕوامان پێیان ناکرد کەوتیان بەرتان ئەدەین.. لەئەخیر رۆژی سەماوەدا کامێرایانهێناورەسمیان ئەگرد.. بەزۆر ژنە گەنجەکانیان ئەبردو ئەیانووت ئەبێ هەڵپەڕن‌و مۆسیقایان هاوردبوو وەك سینەما بەزۆر هەڵمانیان ئەپەڕان‌و رەسمیان ئەگرد، هەر کردمانیانە سینەما.. چوار ژنیان ئەوەستان‌و عابایەکی ژنانەیان هێنابوو بەزۆر ژنێکی تریان ئەخستە ناو عاباکەوەو ئەبوو ئەو چوار ژنەی تر جۆلانی پێ‌بکەن‌و رەسمیان ئەگرد..

ئیتر نازانم بۆچیان بوو.. انشاء الله ئەگەر ئەم زاڵمە روخا ئەو فلیمانەتان دەست ئەکەوێت‌و سەیری کەن بزانن چۆن کردمانیانە مەخسەرە.. کێ ئەڵێ بۆئەوەیان نەبووە بڵێن سجنەکان ئاوها دڵیان خۆش بووەو لەسجندا هەڵپەڕیوون.. یان بۆ ئەوەیان بوو حەیایی کوردی پێ‌بەرن..

وەرز گۆڕابوو پایز بوو ئەوکاتەو سەرمایش بوو سوار سەیارەی بان گیراومانیان کردو هاوردمانیانەوە بۆتۆبزاوا.. لەقاعەیەکی چۆڵ دامانیان گرد.. زۆر تینوومان بوو.. بەژنێکم ووت بەخوائەمە ئەو شوێنەیە کەیەکەم جار هاوردمانیانە ئێرەو بۆڕیەکی ئاو لای ئەو قاعەیەی ترە بابچین هەنێ ئاو بێنین.. چووین‌و لەپەنجەرەکەیشەوە سەیرمان کرد ئەو قاعەیە پڕی خەڵك بوو هەمووی خەوتبوو.. یەك دووجار بانگم کرد.. ژنێکیان بەخەبەرهات‌و لەپەنجەرەکەوە کەوتینە قسەکردن لەگەڵیاو پێم ووت کەئێمە لە(نوگرە)وە هاتووینەوەو ئەڵێن بەرمان ئەدەن.. باس‌و بەسەرهاتی خۆمانم بۆباس کرد بەکورتی‌و لەوم پرسی ئێوە لەکەیەوە لێرەن‌و خەڵك کوێن.. قسەکەم تەواو نەکرد.. بۆنەگبەتی عەسکەرێك لەقسەکانمان بەئاگا هاتبوو هات‌و بەجنوێدان ئێمەی دایەپێش‌و نەیهێشت بزانم ئەوان خەڵکی کوێن‌و لەکەیەوە لەوێن.. ئێمەی بردەوە قاعەکەی خۆمان‌و چوو بەئامرەکەی ووت کەئێمە چووینەتە دیار ئەو سجنانەی‌ترو قسەمان لەگەڵیاندا کردووە..

ئامرەکە هات‌و بەتوڕەی‌و دوای کۆمەڵێ جنوێدان گشتمانی لەقاعەکە دەرکردەوەو خستمانیەوە ناو سەیارەکان‌و دەرگای سەیارەکەیان لێمان داخستەوە.. تابەیانی لەناو سەیارەکان بووین‌و ئیتر تەواو ترسام‌و ووتم بەخوا باوکم تازە بەرنابین‌و ئەوەتا ئەو قاعەیە پڕی خەڵکە.. ژنەکانی تریش گشتیان خەتای منیان ئەگرد.. ئەیانووت ئاخر ئەگەر تۆنەچوویتایەتە ئەوێ بۆوایان پێمان ئەکرد..

سەعات پێنجی بەیانی سەیارەکان کەوتنەڕێ‌و هاوردمانیانەوە لەعەربەت دامانیان بەزاند لە(قاطعی جێش شەعبی‌یەکە) ئەوەی هەڵەبجە بوو جیامانیان کردەوەو ئەوەی کەلاری بوو بەجیاو سەرلەنوێ ناومانیان

نوسیەوەو.. خستمانیانە ناو سەیارەی کۆستەرەوەو ئەوانیان برد بەرەو هەڵەبجەی تازەو ئێمەیش بەرەو گەرمیان.. هاوردمانیانەوە لەم (صمودە) مەقەرێکی لێبوو لەوێ بەکەفالەت بەرمانیاندا..

کەهاتمەوە ناو ئەو خزمو کەس و کارەی کەئەنفال نەکرابوون لەوێ زانیم کە حوسێنی کوڕەگەورەم کەلەگەڵ ڕانەمەڕەکە بوو گیراوەو تائێستا هەربێ سەرو شوێنەو مێردەکەشم هەر بەو شێوەیە تیاچووە..

**کەمنیان لەریزەکە دەرکردو خستمیانە ریزی ئەختیارەکانەوە دوان لەمناڵەکان توند خۆیان نوساندبوو بەپێمەوەو چمکی شەرواڵەکەمیان رادەکێشاو ئەیانووت (باوە مەڕۆ، جێمان مەهێڵە)..**

# شەمزین عەلی رەشید

لەدایك بووی ساڵی ١٩٣٣ گوندی- سەرچنار- ناوچەی شێخ بزێنی

مێژووی دێیەکەمان زۆر کۆنەو لەبیرەوەری باووباپیری ئێمەشدا هەر ئاوەدان بووەو چەندین پشتمان لێرە ژیاون.. سەرچاوەی بژێوی ژیانی



خەڵکەکەیش مەڕداریو دەغڵودانو زەرعات کردن بووە..

شوێنی دێیەکەمان لەبناری خاڵخاڵانەو ئەکەوێتە ناوەڕاستی (سلێمانی- کەرکوكو کۆیە- چەمچەماڵەوە) ناوچەیەکی دڵگیرەو خەڵکەکەیشی گەرچی نەوەی چەند بنەماڵەیەك بووین، بەلام

ئەوەندە پشت بوو هەر پێکەوە ژیابووین لێرە، هەمووی وەك خزمو کەس‌وکاری یەکتریمان لێهاتبوو..

خەڵکەکەی هەمووی حاڵی باش بوو دەوڵەمەند بووین‌و گشتمان مەڕومالاّتی باشمان هەبوو.. من لەساڵی ١٩٥٤ ژنم هێناو هەردوای ئەوە لەماڵە باب جیابوومەوەو کەوتمە سەر ژیان‌و حاڵی خۆم‌و بەماوەیەکی کەم بوومە ماڵێکی تەواو،دێیەکەمان بەبەرو بووم بوو.. لەساڵی ١٩٦٣ (ساڵی بەعسیەکە) عارەب پاپەتی هاتن دایانە سەر ناوچەکەداو تالاّنیان ئەکرد.. بەخوا ئەم دێیەی تۆ ئەیبینی (گسکیان لێدا) هەرچی هەبوو بردیان‌و فەرهوودیان کرد.. جل‌وجۆری ژنیشیان برد.. ئاڵتون‌و پارەو هەرچی کەل‌وپەلی ناوماڵ‌و مەڕومالاّت بوو بردیان‌و دوایی ئاگریشیان لەئاوایی بەردا.. ئێ ئەبوایا لەدوای ئەوە ئەم دێیە وێرانەیە هەر ئاوەدان نەکرایەتەوەو نەبونیایەتەوە ماڵ.. بەلاّم چونکە ناوچەکەو فەلاحەت‌و زەرعاتمان باش بوو هەروا چەند ساڵێ دوای ئەوە واماڵمان دروست کردەوە، وەك ئەوەی هیچمان بەسەر نەهاتبێ..!!

ئەو چەند ساڵەی دواتریش کەحەرەس قەومی هەبوو لەگەڵ جەیشدا ئەهاتنە سەر دێیەکان.. ئێمە لەو بەلاّیە بەدور بووین.. دێیەکەمان دورە دەست بوو کەمتر ئەهاتنە ناوچەکەی ئێمە، بۆیە بێخەم بووین..

دوای ئەوەی شۆڕشەکە تێك چوو تائەو ماوەیەی شۆڕش دروست بووەوە جاش‌وجەیش ئەهاتنە سەرمان بۆ راوروت‌و تالاّنی‌و حکومەت زەختی لێمان ئەکرد کەئەبێ ببینە چەکداڕ.. خواکردی ئەوەنەی پێنەچوو پێشمەرگە دایەوە شاخدا ئیتر حکومەت ئەو زەختەی لەسەر ئێمە نەما چونکە دێیەکەمان شوێنەکەی باش‌و دورەدەست بوو، هەربۆیە بەم دوای‌یە ماڵی زۆر لەپێشمەرگەکان هاتبوونە دێیەکەی ئێمەو بۆئەوانیش هەر ئەمین بوو..!

حکومەت رێگەی نادا ئازووقەمان لەشارەکانەوە بۆبێت ئەوە هەندێ ژیانمانی ناخۆش کردبوو هەرچەندە ئێمە بەروبومی خۆمان هەبوو بەلاّم

شەکرو چاو رۆنەکە ئەبوو لەشارەوە بەدەستی بخەین بۆئەوەیان کەمێك کەوتبووینە هیلاکەت.. ئەگینا پێویستمان بەشار نەبوو.. ئاوو کارەبا و مەکتەب و هەموو شتێکمان هەبوو، بۆخۆمان حکومەتێك بووین.. ئەوەندە ساڵەی شەڕی ئێران و عێراق بوو ئێمە وەك ئەوەی لەم ولاّتە نەبین سەغڵەتیمان نەبینی.. قلە قلە کۆپتەرو تەیارە ئەهاتنە سەر ناوچەکە بەلاّم لەترسی ئەوەی پێشمەرگە نەیانخاتە خوارەوە ئەوەندە بەرز ئەبوونەوە مەترسیان نەدەما..

بەلاّم ترسی گەورەمان ئەوەبوو ئاگامان لەوەزعی ناوچەکانیتر هەبوو ئەمان زانی دێهاتە نزیکەو جادەکانی روخاندووەو ناوچە سنوورییەکانی روخاندووەو لەهەر دێیەکدا شەڕبێ یان لەنزیکی هەر دێیەکدا لەسەر جادەکان تەقەببێ حکومەت ئەڵێن قوات ئەبات و دێیەکە ئەروخێنێ، ئەمانەمان ئەبیست و خەمی ئەو خەڵکەمان بوو..

تامەترسیەکە گەیشتە ئەوەی کەهەرچی پێشمەرگە هەبوو لەناوچەکەمان هەمووی رۆی بۆئەو سەرە.. ئەو کاتە تەواو هەستم بەمەترسی‌یەکە کرد دیارە وەزعەکە گەلێ خراپە ئەگینا پێشمەرگە ئەم ناوچەیەی چۆڵ ناکرد.. بەهۆی رادیۆوە ئاگامان لەدەنگ و باسەکان هەبوو کەحکومەت هێزێکی زۆر گەورەی بردۆتە سەر ناوچەکانی سەرکردایەتی لەشارباژێڕ.. لەهەڵەدن و سەرگەڵوو بەرگەڵوو.. ماوەیەك مقاوەمەی باش کرا.. بەلاّم براچەك و تفاقی حکومەت لەکێشا نەبوو.!! پێشمەرگەکان گەڕانەوە.. پێوەیان دیاربوو کەخراپ تێك شکاون.. باسی وەزعەکەیان گێڕایەوە موچوڕکە بەلەشتدا دەهات.. زەبرو زەنگی ئەمجارەی حکومەت گەلێ بێ‌ئەندازە بووە.. ئەیانووت بەهەموو چەکێك لەمەدەنی داوە لەگوندنشینەکان و دەستی لەکەس نەپاراستووە.. وتیان (کیمیایی تەقاندووە)و شارێکی لەشارەزوور بەیەکجار کاول کردووە.. وتیان بەشۆفڵ خانووەکان ئەروخێنێ و هەرچی رەزو باخ هەیە سوتاندویەتی و چاوگەی ئاووکانیاوەکان پڕدەکاتەوەو ئەشکەوتەکانی تەقاندوەتەووە.. ئەمانەو زۆری تریش..

ئیتر بەیەکجاری ترس و دڵەراوکێ تینی پێگرتین.. سەیری ئەو ئاواییە جوانەو مەڕومالآت و مڵک ومالی خەڵکەکەم ئەکرد، راکەراک و تالآنی یەکەی ساڵ بەعسیەکەم ئەهاتەوە بەرچاو..

زۆر کەمی پێچوو هەروا چەند رۆژێك بوو هەواڵی ئەوە بڵاو بوو بووەوە کەدەوروبەری شاربازێر وێران کراوە.. کەچی وتیان وا هەموو ناوچەی قەرەداغیش کاول کرا.. وەك ئاگری بەر رەشەبا وابوو، روی بکردایەتە هەر شوێنێ (جێوە جێ) هەمووی ئەسوتان.. لەوێش وتیان کیمیایی داوە لەقەراخ و خەڵکی زۆری کوشتووە.. ئیتر هیچ چارەیەك نەماو کورد واتەنی (دۆم بەدانیشتن ماڵی وێرانە) دەبوو مشورێکی خۆمان بخۆین و بزانین چیبکەین..

ئەو ماڵە پێشمەرگانەی لەدێیەکە بوون، کەوتنە ئەوەی باربکەن.. دیار بوو ئەوان لەئێمە باشتر ئەیانزانی تازە کارلە کارترازاوە.. هەندێ لەناو خۆماندا مشاوەرەمان کردو توشی سەرگەردانی و سەر لێشێوانی هاتبووین.. وتمان رەنگە حکومەت ئەو جەیشە زۆرەی بردبووی بۆسەر سەرکردایەتی کەئەیگەڕێنێتەوە بەسەر هەرناوچەیەکدا بچن وێرانی دەکەن و دڵخۆمان بەوە ئەدایەوە والەناوچەی قەراخ و گەرمیانەوە گەڕاونەتەوەو هەرچییەك ببێت بۆئەو ناوچەیەو زەرەری بۆناوچەکەی ئێمە نابێت..!!

خەڵك شپرزەی پێوە دیارە، هەندێ خەڵکی ناوچەی قەراخ و بەشێك پێشمەرگەیان پەڕیبونەوە بۆبەری خاڵخالآن هاتنە ناوچەکەی ئێمەو ئەوەی ئەوان ئەیان گێڕایەوە، ناگێڕدرێتەوە.. کەخەڵکی دێیەکانیان و ژن و منالێ چیبەسەر هاتووە.. ئەو کیمیاییە ئەو خەڵکەی چۆن سوتاندووە، هەندێکی کوێر کردووە! ئیتر مەرگە ساتێك باسیان ئەکرد، ئێمە زووتر شتی وامان نەبیستبوو..

هەروا چەند رۆژێکی پێچوو پێشمەرگەو خەڵکی پەڕەوازەی گەرمیانیش گەیشتنە لامان و باس و بەسەرهاتی خۆیان گێڕایەوەو باسی زۆری هێزەکانیان کرد کەچۆن تەوقی هەموو ناوچەکەیان کردووەو چۆن سەرلوتە

شاخ و قوتەو سەر ڕێوبانەکانیان گرتووەو زۆر بەزەحمەت مەگەر دەربازت بێت و ئەشیان ووت چەند لەسەر زەوی جەیش و جاش مەترسیان هەبوو دەئەوەندە کۆپتەر لەئاسمانەوە بووەتە بەلاّ بۆگیان ئەو خەڵکە.. هەرچەندە قەناعەتی تەواومان لای خۆمان دروست کردبوو کەئیتر لەگەرمیانەوە جەیشەکە ئەگەڕێتەوە ناو عارەبسان و نایەنە سەر ئێمە.. بەلاّم کەئەو خەڵکەی گەرمیان و قەراخ بەو شێوەیە باسی وەزعی ناوچەکانیان کرد.. خەریك بوو بتۆقین.. بیرم لەوە ئەکردەوە باشە ئەگەر بمانەوێ رابکەین و نەکەویتە بەردەستی ئەم زاڵمە.. بۆکوێ بچین.؟. رێگای شارەکان ئەگریتە بەر، ئەوە بەپێی خۆت ئەچیتە ناو ئاگرەکەوە.. لەدێدا ئەمێنیتەوە هەر وەی.. سەری خۆت و ماڵ ومناڵ هەڵئەگری و ئەیدەیتە ئەو کێوانەدا بەدوو رۆژ کۆپتەر لەهەر کوێیەك بیت ئەتدۆزێتەوە.. ئاخر خۆ زەلام سەڵتەیش نەبووین بۆخۆت لەو هەردەو هەڵەتانەیا خۆت بشاریتەوە.. تالافاوەکە ئەروات.. بەو هەموو ژن و مناڵەوە روو لەکوێ ئەکەیت.. من لەساڵی ١٩٧٤یش ژنێکی ترم هێنابوو بەرەی دووژن و کوڕو کوڕەزاو براو برازاو ئەو هەموو قەومەی ئاوایی روو لەکوێ بکەین؟..

ووتی ووتی لەدێیەکەدا پەیدا بوو بوو کە برۆین و رووبکەینە ئەو موجەمەع و شارانەی نزیکن و بەدزیەوە شەو خۆمان بگەیەنینە ئەوێ بزانین خواچی ئەکات..؟ هەرکەسە لەئاستی خۆیەوە کەوتبووە کۆکردنەوەی ماڵ و خۆئامادەکردن.. پێشمەرگەکان ئەمە مەرگ و ژیانەو ئێمە بەرگری ئەکەین و ئەتانپارێزین.. جگە لەپێشمەرگەکانی ناوچەکەی خۆمان بەشێك پێشمەرگەی قەراخ و گەرمیانیش هاتبوونە ناوچەکەو هێزی پشتگیری و سەربازی فیرارو خەڵك زۆر بوو بۆخۆیشی تفەنگی هەبوو، هەمووی هەر وتیان تامردن بەرگری دەکەین و نایەڵین جەیش بێتە ناوچەکە.. ئێ زووتر زۆرجار حکومەت پەلاماری دێهاتەکانی ئەداو بەخوا جاری وابوو دێیەك (دە) پێشمەرگەی تیابوو حکومەت دوو رۆژ پەلاماری ئەدا بۆی ناگیرا.. ئەم هەموو پێشمەرگەیە شەڕ بکەن حکومەت بەشەش مانگ ناتوانێ بێتە

سەرمان.. بەم قسانە ماینەوە، خۆئەگەر وانەبوایا زوو ئەمانتوانی خۆمان بگەیەنینە تەق تەق و کۆیەو چەمچەماڵ و تەکیەو دووکان لەهەموو لایەکەوە موجەمەعێك، شارێك نزیك هەبوو کەخۆمانی پێبگەیەنین.. بەڵام دەنگ‌وباس گەرمە، ئەڵێن ئەو قواتەی بردبوویە گەرمیان و ئەوەنەی تریشی هێناوەو لەهەر چوارلاوە پەلاماری قەڵاسێوکەو شێخ بزێنی و شوان ئەدات.. سەعات بەسەعات خەبەری خراپتر ئەهات.. قواتەکە واگەیشتۆتە فلانە شوێن.. کیمیایی ئەتەقێنێ.. عەرز عەرز ئەناتە دێیەکانەوە. نازانم بڵێم چیان ناووت.. ئەو خەڵکەیان بەجارێ تۆقاندبوو هەر بەهات هاتێ هەموو رای‌ئەکرد، ئیتر بەرگەی چی و پاراستنی‌چی.؟. قورکرابووە سەرمانداو وەك نێچیر بۆراوچی کەوتبووینە تەختی..

ئێوارە بەر لەخۆر ئاوابوون کەمانگی رەمەزان بوو لەئاوایی لای مزگەوتەکە دانیشتبووین هەموو خەمبارو بێتاقەت و ترس و بێزاری لەسیمای هەریەك لەو زەلامانەی ئاوایی‌دا بەدی ئەکرا.. کاتێکمان زانی دەنگی تەیارە پەیا بوو.. لەترسا بلاوەمان لێکرد وتمان نەوەك قەرەباڵغی ببینێ و رەمی بکات.. بەبان ئاوای‌دا رەت بوون قافڵەیە تەیارە بوون وابزانم هەشت دانەبوو بەدوای یەکەوە ریزیان بەستا بوو.. تێپەرین لەئاوای ئێمەو چوونە سەر ئاسمانی گۆپتەپەو عەسکەرو هەیدەر بەگ.. هەندێ خولانەوەو زرمەیان لێبەرزەوە بوو.. قاژەو شریقەی هات.. چەند جارێك لەسەریەك زرمەیان هات و رەمی خۆیان کرد.. دووکەڵ بەرز بووەو رەنگیان جۆراو جۆر بوو سپی و زەردباو رەش و شین..

لەدورەوە دوکەڵەکان دیاربوون تێکەڵبەیەك دەبوون ئەوەندە دیمەنێ جوانی هەبوو ئەگەر دوکەڵی رەمی کردن نەبوایا پیاو قەستی ئەکرد هەر تەماشای بکات ئەوەندە بەجوانی بایان ئەخوارد بەناویەکدا.. بەڵام وەك ئەوەی ئەو دووکەڵە لەناو جەرگی خۆتەوە هەستێ ئاوا لام ناخۆش بوو ئەمزانی ئەوە نیشانەی خوێن و نەگبەتی خەڵکی گۆپتەپە بوو.. وتم بەخوا ئێستا داری بەسەر بەردیەوە نەهێشتووە.. بەڵام زۆربەی خەڵکەکە لەو قەراخ

چەمو دارانە هەواریان دروست کردبوو بەوە ئەمووت ئینشائەڵا خەسارەی گیانی نەداوەو خەڵکەکە لەچەمن و هەر لەخانووی چۆڵی داوە..

مـن چـوزانم ئەمـە کیمیاییـەو بەهـەوادا ئەچێتـە هـەموو کـون و کەلەبەرێکـەوەو پێـش ئـەوەی لـەئاوایی بـدات داوێتـی لەزێیەکـەو لەقـەراخ چەمەکـەو ئـەوجا لـەئاوای داوەو قـوڕی کـردوە بەسـەر ئـەو عالەمـەیاو گۆپتەپەی خلاس کردووە.. لەترسی کۆپتەر نەمان ئەتوانی بچین بەهاواری گۆپتەپـەوە.. شـەو خـەڵك چـوون و هاتنـەوە خەبـەریان هـاوردەوە گۆپتەپـە چیبەسەر هاتووەو کیمیایی کردوە بەسەریانداو ئیبادەیان کردووە ئەوانەی چـوون و هاتنـەوە وەك شـێتیان لێهـاتبوو لـەتاوا وڕوکـاس بـوو بـوون.. حەپەسـابوون.. ترسـابوون.. ئـەیانووت هـەروا خەڵکـەو لـەبن ئـەو دارو دیوارانەدا لاڵ وپاڵ کەوتووە.. حەیوان و قەل و مریشكو تـەیرو توریش وەك گەڵای دار هەڵوەری بێت لەوناوە کەوتوون و وشك بونەتەوە..

بەجارێ تۆقین و هێز لەبەدەنماندا نەما، وتمان بەخوا سـبەینێ لەگـەڵ فـەجردا دێنـە سـەرمان و والەئێمـەش دەکەن.. هەرکەسـە لەئاسـتی خۆیـەوە کەوتینـە پێچانـەوەی خـواردن و هـەندێ جـل و جـۆرو بڕیارمـاندا بەشـەو هـەڵێین.. واهێشـتا ئێمـە ئاوایمـان چـۆڵ نـەکرد بـوو لایتـی سـەیارەمان لەتەکیەوە بینی وەك قافڵە بەدوای یەکدا هـاتن ئیتر زانیمان ئەوە هەمووی جەیشـەو واکەوتنـە ڕێ و دێنـە سەرمان.. چونکە زووتـر لەهـەر شـوێنێکەوە بەلاچەی روناکی دەرکەوتایا حکومەت دەیدایە بـەرتۆپ.. چ جـای ئـەوەی ئـەتووت چراخانـە وەك ئـەوە وابـوو شـارێك ڕێبکـاتو ئـەو سـەریارانەی لەتەکیۆوە ئەهاتن ئاوابوو..

بەپەلە هەریەکـەو بـای کۆڵێك شـتمان دابـە کۆڵمـانداو بـەرەو چەمەکـەی (توتەقەڵ) کەلەنێوان جەلەمۆردو توتەقـەڵ و سـەرچنار دابوو کەوتینـە ڕێ.. هەندێ تەرەکتـەرمان هـەبوو لـەئاوایدا ئـەوانیش پڕکـران لەئەشـیاو بـەرەو چەمەکە چووین.. چەمێکی گەورە بوو (چڕبوو) خۆمان لەوێ شاردەوە.. ئەو هەموو ژن و مناڵەی ئاوای لـەبن ئەو دارو بـەردو بنکـەڵوەزو ژێـر ئـەو کونـە

تەیارانەدا کەزووتر سەربازە فیرارەکان بۆخۆیان دروستیان کردبوو.. لەو شوێنانە خۆمان ماتکرد.. بەلاّم هەرزرمەی تۆپ دێت.. کەرۆژیش بووەوە ئیتر گورەی کۆپتەر لەگوێمان نەبڕایەوەو وەجبەلەدوای وەجبە ئەهاتن‌و ئەچوون‌و دەنگی رەمی کردنیان ئەهات.. زۆر ئەترساین‌و لەحاڵەتێکی زۆر خراپدا بووین.. لەو جۆرە حاڵەتانەدا ئینسان خۆی لەناو تەق‌و تۆقەکە بوایا خۆشتر بوو.. ئێمە خۆمان لەو شوێنە بووینایا واکۆپتەرەکان رەمیان لێنەکرد ئەوەندەی ئەوە ناخۆش نەبوو کەدەنگ‌و باسی ناوچەکەمان نازانی‌و تەنها گوێمان لەدەنگی تۆپ‌و گورەی کۆپتەرو رەمی کردنەکەی بوو..

نازانم ئەو رۆژە چۆن لەئێمە رۆیی ئازاری ترسەکەمان لەئازاری مردن زیاتر بوو.. تەواو خۆرئاوا نەبوو بوو لەچەمەکە هاتینە دەرەوە دڵمان خەریك بوو شەق بەرێت خەبەرمان لەناوچەکە نەمابوو.. ئەبێ ئەمرۆ حکومەت چیکردبێ.. ئەبێ ئەو سەیارانەی شەو چیبوو بێتن‌و گەیشتبێتنە کوێ.. ئەبێ کوژراو بریندارەکانی گۆپتەپەیان چیلێ کردبێت.. هەواڵمان بۆهات وتیان جەیش ئەمدیومانی تائاغجەلەرو تەکیە گرتووەو نێوانی ئێمەو تەق تەق جەیشی لێنی‌یە جاشیان داناوەو گوایە وتویانە گەر خەڵکەکە بێن ئەیانپەڕێنینەوە بۆتەق تەق و بەری هەولێر، جاشەکان جەماعەتی موستەشار (بورهان شوانی) بوون..

خەڵکی گوندی توتەقەڵیش هەر لەچەمەکەی تەنیشتمانەوە بوون تێکەڵ بەیەك بووین‌و چووینە گوندی (گرد خەبەر) بەکەرو بارو بەپێ‌و بەکۆڵ‌و بارەوەو تەرەکتەرەکانیشمان پێیە.. بەخەڵکی (گردخەبەر)مان گووت گوایە (بورهان شوانی) جوابی ناردوە کەبێن‌و لێرەوە بیەرێنەوە هاوکاریان دەکەم.. ئەوان وتیان ئێمە شتی وامان نەبیستووەو وانی‌یە گەر ئەم هەواڵە وابوایا خێرە بەسەر ئێمەدا دێت بۆ ئێوەو ئێمە نایبیستین..!

هەواڵ وا بووبیّ و وانەبووبیّ ئێمە هیچ ڕێگا چارەیەکی ترمان لەبەردەمدا نەماوە تەنها ئەوە نەبیّ کەئەم شەو خۆمان بگەیەنینە تەق تەق.. ئەگینا بەیانی جەیش ئەگات پێمان و (وارووێخمان) دەرئەکات..

خەڵکی ئەو سیّ دێیە هەموومان پێکەوە کەوتینە ڕێ ئەوەی نەخۆش و کەم ئەندام و بیّ توانا بوو سواری تەرەکتەرەکانمان کرد، نۆتەرەکتەری ئەو سیّ دێیەمان پیّ یەو باقی یەکەیشی بەپیّ و گشتمان بەقافڵەیەك ملمان ناو کەوتینە ڕێ بەرەو تەق تەق، وانزیکەی سەعات ٢ی شەوە.. شەوی چوار لەسەر پێنجی مانگی پێنج بەو ڕێگایەدا هەڵنیشتین کەبچین بەرەو تەق تەق کەگەیشتینە نزیك گوندی (قامیشە) لەراست (قودرەتە) هێشتا هەردونیا تاریك بوو فەجری نەدابوو.. کاتێکمان زانی بانگیان لێمان کرد (راوەستن).. بەکوردی بانگیان کرد.. زانیمان کەجاشن نەك عەسکەری..

ئێمە نۆ تەرەکتەر بەو تاریکە شەوەو ئەو قافڵە زۆرەی ژن و منداڵ ئەو سیّ دیّ یە.. غەڵبە غەڵب و دەنگی تەرەکتەرەکان بەو شەوە ساردە ڕۆژە ڕێیەك ئەڕۆیی.. قابیلە چۆن نازانن ئەوە خەڵکەو ئەیەویّ دزەبکات.؟. چۆن پێشمان ناگرن..؟

کەلێمان هاتنە پێشەوە تەماشامان کرد جاش بوون و جەماعەتی (بورهان شوانی) بوون.. تەرەکتەرەکانمان کوژاندەوە.. پێمانیان ووت بۆکویّ ئەچن بەم نیوە شەوە..؟ وتمان ئەچین بۆناو حکومەت..! گەرچی جاشیش هەر چەکداری حکومەت بوون و هاوکاری بوون بەلاّم چونکە هاوزمان خۆمان بوون کەمترلێیان ئەترساین..

جاشەکان وتیان بەوخوایە هەمووتان ئەگرن، ئەم هەموو ژن و منداڵە بۆکویّ ئەبەن.. خەڵکەکە هەمووی حەپەسا.. ئومێدمان بەوە هەبوو شەوەو خۆمان بگەیەنینە نزیك تەق تەق و دەمەو بەیان خۆمان بکەینە ئەو ماڵانەدا هەمووی ناسیاو بوو.. کەچی جاشەکان ئومێدبڕمانیان کرد.. پێمانیان ئەوت بگەڕێنەوە لەو هەردەو هەڵەتانەی خۆتان، خۆتان بشارنەوە.. ئێمە لەترسا ئەژنۆمان شکابوو کەسمان نەمان ئەتوانی بگەڕێینەوە، دیار بوو جاشەکان

ئاگایان لەو وەزعەی (گۆپتەپە) نەبوو ئەگەر ئەوەیان بزانیایا چۆن پێمانیان ئەوت بگەڕێنەوە بۆدێیەکان خۆتان..؟

ئێمە هەر سووربووین لەسەر ئەوەی بچین بەرەو ناو حکومەت باشترەو دلوامان لەجاشەکان کرد ئێوە ئەگەر راست ئەکەن و خەمی ئێمەتانە.. ئێمە تەنها (٩) زەلاممان لەگەڵە موالیدی عەسکەرین و سەربازی فیرارن.. ئێوە ئەو نۆکەسەمان بۆبگرنە خۆتان.. باقی‌یەکەی لەسەر خۆمان قابیلە حکومەت چی‌لەم هەموو ژن‌ومناڵە ئەکات..؟ خوا هەڵناگرێ زۆر پیاوانە ئەو نۆ زەلامەیان لێمان وەرگرت و هەر بەبەرچاوی خۆمانەوە ناردیانیانە ناو ئەو جاشانەی لەسەر گردێ بەرز حەرەس بوون، بەئێمەشیان ووت کەیفی خۆتانە ئەڕۆن ئەگەڕێنەوە بەلأم بەقسەی ئێمە بکەن ناچن بۆناو حکومەت..

قسەی جاشەکان دڵمانی خستە مشکیلەوە، بچین، بگەڕێینەوە.. هەندێ مشاوەرەمان لەناو خۆماندا کردو واقەرارماندا تابەیانی لێرە بمێنینەوە، کەرۆژ هەڵهات ئەوسا تەگبیرێکی خۆمان بکەین.. بەیانی لەگەڵ بەیاندا جەیشەکە هاتە سەرمانداو چواردەورمانیان گردو خڕمانیان کردەوەو بردمانیانە دیار ئاوای (قامیشە) زابتێك هات بەئەقڵم (تورکمان)بوو.. یەکەیەکە (ژن، پیاو، مناڵ) دەیانبردە ئەو عەردەو لەبەردەم زابتەکەدا گیانی ئەگەڕان و چی‌پێبوایا لێیان دەسەند.. ژن و مناڵ خەرێك بوو زیرەبکەین..

بڕوابکە مستیلەیان لەپەنجەی ژنەکانمان داکەن.. دوگمەو دۆلاب، گۆبەرۆك بەسوخمەیا دورابوو بەچاوی خۆم بینیم کەدەزووی سوخمەی ژنەکەیان هەڵوەشان و بردیان.. رووت‌وقوتمانیان کردەوەو هیچیان بەو خەڵکە نە هێشت..

ئەو نۆزەلامە نەبێ کەدامانە دەستی جاشەکان ئیتر سەرپاك خەڵکی ئەو سێ‌دێیە ئەوەی پێکەوە بووین هەموومانیان بەو نۆتەرەکتەرەو کۆمەڵێ سەیارەی عەسکەری خۆیان کەئەوەیان تەنها عەسکەری تیابوو بردمانیان بۆ تەق تەق.. تەرەکتەرەکان زووتر پڕکرا بوون لەئەشیاو خۆمان بەپێ

دەڕۆیشتین.. ئەوان هەرچی شت هەبوو فڕێیان دایە خوارەوەو هەموو ئەو خەڵکەیان کردە ئەو نۆ تەرەکتەرەوە..

لەتەق تەق بردمانیانە (دەواجنەکە)و هەندێکیشمانیان بردە خانوویەکی زراعە هەرلەو نزیکە بوو، لەوێ سجنمانیان کرد عەسکەریەکی زۆر دەورمانی گرتبوو، ئیستخبارات و ئەمنیش هاتن کەوتنە ناونوس کردنمان.. عایلە عایلە بەجیا ناومانیان دەنوسی و پێمانیان ئەوت ئەتانبەین لەکەرکوک موجەمەعتان بۆئەکرێت..

ئەمووت باشە ئەگەر موجەمەعمان بۆئەکرێت ئەی بۆچی بەسجنی ئەمان بەن.. ئەی وابەسجنی ئەمانبەن ئەگەر موجەمەعمان بۆئەکەن بۆتالانمانیان کرد، ئەوان گوارەی گوێی ژنەکانیشیان داکەند.. هەرخۆم دڵی خۆمم ئەدایەوە بەڵکو راست بکەن و بمانخەنە موجەمەعەوەو ئەو زابتە بۆخۆی ئاڵتون و پارەکانی بردبێ و ئەمری حکومەت نەبووبێ..

بەوەیا ئەمووت رەنگە راست بکەن و لەکەرکوک نیشتەجێمان بکەن چونکە بیستبوومان و بینیبویشمان کەعەرەبی زۆریان هێنا بوو بۆکەرکوک و گەڕەك گەڕەك بۆیانیان دروست ئەکرد.. تۆبڵێی ئێمەیش بەرن بۆکەرکوک و ئاوا گەرەکمان بۆبکەن.. ئەگەر وایە خوابکات هەموو خەڵك دێیەکە لەگەرەکێك بین و هاوسێ بین باشترە.. خەمم بوو ئەمووت نەمانکەن بەهاوسێی ماڵەعەرەبێك.. ئێمەو ئەوان تەبیعەتمان زۆر لەیەك جیاوازە.. یان ماڵێ شاری هاوسێمان بێت ناخۆشەو رەنگە تارادێت لەگەڵماندا تەواو بێزار بێت، ئێمە فێری ژیانی لادێ بووین و بەشێك لەوژن و مناڵە شاریان هەرنەدی بوو..

دڵی مناڵەکانم ئەدایەوە.. خێزان و کوڕوکچەم و کورەزا دە دوانزە کەسم لەگەڵ بوو.. ئەترسان و منال ئەگریا ئەمووت مەگرین ئەوەتا ئەڵێن ئەتانبەینە کەرکوک و لەوێ نیشتەجێمان ئەکەن و ماڵ دونیا قیمەتی نییەو خوا ئەکا سەر سەلامەت ئەبێ لەجێی ماڵ ئەبێتەوە..

تامەغریب لەوێ هێشتمانیانەوەو هەر لەبەر خۆمەوە لێکم ئەدایەوە ئەبێ چیمان لێبکەن.. زۆر دڵم لای ئەو هەموو ژن و منالآنە بوو باشە ئەوان چی گوناهێکیان هەیە تابەو دەردە ببرێن ئاخر منالی ساوا هێشتا نەژیاوە تابڵێین باجی ژیان ئەداتەوە.. ئەو منالآنەی خۆمم ئەبینی قاژەی جەرگم ئەهات بۆیان، هەردوو خێزانەکەم بچوکەکەیان ٦منالی هەبوو ئەوی تریشیان و کورێکم و بوکێکم بەسێ منالەوەو کچێکم بەمنالێکەوەو زاواکەم و هەموو خزمم و کەسم بوون جاکێ مابوو بگیرێت..

دەمەو مەغریب سەیارەی عەسکەریان هاوردو بەپێی ئەو ناونوسینە خێزان خێزان ناویان ئەخوێندەوەو خستمانیانە سەیارەکانەوە.. تاهەموو سەیارەکانیان پرکردو کۆمەڵێ سەیارەی عەسکەری لەپێش و پاش قافلەکەوەو هەر سەیارەی عەسکەرێك و دووانیش بەدیارمانەوە حیمایەبوون.. بۆمنالێ ئەیوێرا ورتەیەك لەدەمی دەرچێ وەك سەگ هار پیاهەڵئەپژان و تێیان ئەسرەوان.. رۆیشت بەرەو کەرکوك و کەرکوکی تێپەڕان و لایان نەدا، گەرچی زووتریش قەناعەتی تەواوم بەقسەکانیان نەبوو، بەلآم کەلەکەرکوك لایان نەداو تێپەڕین ئیتر تەواو ئومێد بڕبووم و تێگەیشتم وەزعەکەمان گەلێ خراپەو بۆناو عارەبسانمان ئەنێرن..

چاوەڕوانی ئەوەوئەکرد ئەمە نەفی کردنی ئەم میللەتە بێت و لەشارێکی گەرمی دوور ژیانێکی پڕغوربەت بەسەربەرین، چاوەروانی ئەوەشم ئەکرد ئەمە حکومەتە بمان خاتە سجنەوەو ماوەیەك بمانهێڵێتەوەو دوای بەرمان بدات و بکەوینە سەرجادە بەسواڵ و سەدەقەی خەڵك بژین..! بەلآم قەد چاوەڕوانی ئەوەم نەئەکردو بەخەیاڵیش نەمئەتوانی بیهێنمە پێش چاوی خۆم کەلەگەڵ ژن و منالەکاندا لەیەکتریمان جیابکەنەوەو کچە جوان و جاهێلەکانمان بەجیا سجن بکەن و دوای بیان گوازنەوەو قەت چاومان پێیان نەکەوێتەوە.. سەدجۆر دالغەم لێئەدا کەرەنگە وامان لێبکەن بەلآم ئەوەی کەبینیمان و بەسەرمانیاندا هێنا قەت بڕوام ناکرد لەدنیادا زاڵمێك هەبێت

زەمیری ڕێگای بدات ئاوا بەسەر ئەو خەڵکەدا بهێنێ.. خەڵك چەند زاڵم بێت دەستی تێناچێت والەدوژمنیشی بکات وائەوان بەسەر ئێمەیان هێنا..

شەو بوو گەیشتینە مەعەسکەرێك لە(تۆبزاوا) لەوێ تەماشام کرد چی حەشاماتێك هەستاوە، ئەو مەعەسکەرە کەجێگای دروست کردنی شارێکی تیائەبووەوە پڕکرابوو لەژن و مناڵ و ڕەنگە بڵێم کەسی تری ناگرد..

هەر لەدەرگای مەعەسکەرەکە ئەتیان کردە ژورەوە لەسەیارەکان داتیان ئەبەزان.. ئەوەندەی خەڵك لێبوو رەشی ئەکردەوە (دەرزیت هەڵدایا بەزەوی نەدەکەوت) ئەتووت ڕۆژی حەشرەو قیامەت هەستاوە لەپەنجالاوە خەڵکیان ڕیز ئەکردو خێرا خێرا بارئەکران لەسەیارەو لەوێش نەئەمان و ئەیانیان برد..

هەریەکەم سەعات بردمانیانە بەردەم قاوشێك کۆمەڵێ کاتب دانیشتبوون و ناویان ئەنوسی، عارەب بوون و هەریەکی کوردێکیش لەتەنیشتیەوە بوو پرسیارەکانی کابرای کاتبی ئەکردە کوردی و وەڵامەکانی ئێمەی بۆئەو ئەکردەوە عەرەبی و لەسەر دەفتەر نفوسەکەت و هەندێ جاریش هەربە تەقدیر خۆیان تەمەنیان بۆئەو خەڵکە دائەناو بەپێی تەمەن جیامانیان کردەوەو هەموو خەڵکەکەیان کرد بەچوار سنفەوە.. کوڕی گەنج بەجیا ئەنوسراو قاعەیان جیابوو، کچی گەنج بەجیاو پیرێژن و پیرەمێردەکان پێکەوەو ژن و منالیش پێکەوەو بەچوار فیرقە خەڵکیان دابەش ئەکردە سەر ئەو قاعانەدا، نازانم بڵێم چەند قاعەی لێبوو.. زۆر زۆر بوون و هەریەکەیان ڕەنگە بەلای کەمەوە (٥٠٠) کەسی گرتبێ..!

من خۆم هەرئەو شەوە لەهەموو عایلەکەم جیاکرامەوەو ئەوانیش هەریەکەو بەپێی ئەو سنفەی دانرابوو جیاکرانەوە.. کەمنیان لەریزەکە دەرکردو خستمیانە ڕیزی ئەختیارەکانەوە دوان لەمناڵەکان توند خۆیان نوساندبوو بەپێمەوەو چمکی شەرواڵەکەمیان ڕادەکێشاو ئەیانووت (باوە مەڕۆ، جێمان مەهێڵە)..

ئێستاش و تائەو ڕۆژەی لوتم ئەدا لەبەردی ئەلحەد ئەو دەنگەی مناڵەکانم لەگوێمدا ئەزرنگێتەوەو ئەو دیمەنەم لەبەرچاو لاناچێ..

ئێمە ڕەزیل و بێدەسەلات بووین و ویستم بچەمێمەوە ماچێکی مناڵەکانم بکەمو دەستە بچوکەکانیان لەشەڕواڵەکەم بکەمەوەو بڵێم بچنە لای دایکتان.. کەسەرم چەمانەوە عەسکەرێکیان قۆناغە تفەنگێکی دایە ناوشانمداو بەرچاوم تاریك بوو مناڵەکانم زیڕانیان.. کردیە پەلمداو رامیکێشایە لای ئەختیارەکانەوە، دەسەلات نەبوو ئەبێ قبوڵی کەی.. مناڵەکانیان بردو ئێمەشیان برد چاوم پێیانەوە بوو ئەوانیان کردە چی‌قاعەیەکەوەو بەئومێدی ئەوە بووم لەپەنجەرەی قاعەکەوە چاوم پێیانەوە بێت..

ئێمەشیان خستە قاعەیەکەوە هاوشانی قاعەکەی ئەوان و دووشەو دوو ڕۆژ هێشتمانیانەوە. ئەم دوو شەوو دوو ڕۆژە من هەر دەستم بەشیشی پەنجەرەکەوە بوو لەپەنجەرەی قاعەکەی ئەوانم ئەڕوانی و چەند جارێك بەدیانم کردو ئاگر لەجەرگم بەرئەبوو ئەوەتا ئاگری جەرگی بەدەشتەوە نی‌یە ئەگینا تینی ئەو ئاگرە زۆر بەگڕترە..

ئەو دووشەو دووڕۆژە وڕوکاس بووم تەنها چاوم بەقاعەکەی مناڵەکانەوە بوو ئیتر نازانم چۆن هەستاین و چۆن دانیشتین.. چیان داپێمان و چیان پێمان ووت..

هەریەکەم ڕۆژ کەلەوێ بووین ئاگامان لێبوو کەچۆن گەنجەکانیان باڵبەست ئەکردو ئەیانیان خستەناو سەیارەی بچوك بچوکەوە وەك (ئسعاف) وابوون.. ئەیانیان بردو ئیتر هەتا ئێستا هەر ئەو بردنە بوو.. ئینجا کامی وانەبوو ئەو هەموو ژن و مناڵ و کچەعازەبەی کەلە(تۆبزاوا) لەئێمە جیاکرانەوە، بۆتائێستا کەس هەواڵێکیان ئەزانێ.. مەگەر خواو سەدام بزانن..!

دوای ئەو دووشەو ڕۆژە.. دەرکی قاعەیان لەئێمەیش کردەوەو بەریز بەدوای یەکدا بۆناو کۆمەڵێ سەیارە بەڕێمانیان کرد.. بەو برسێتی و

تینوێتی‌یە خستمانیانە ناو ئەو سەیارانەوە هەرپیشاین لەگەرما خنکاین لەتینوا قورگمان وشك بووبوو بەڵام هیچ دەسەڵاتێکت نی‌یەو ئەبێ قایل بی‌مەگەر مەرگ بێت و ئەو رزگارت کات لەدەستیان.. تازە مەسیری تۆ لای ئەوان بوو..

لەتۆبزاوا دەرمانیان کردو بێ‌ئەوەی ئاگامان لەیەکتری بێ‌و یان ئەوان چاویان پێوەبێت بەیەکجاری لەماڵ‌و منداڵ دابڕاین.. ئێستا چەند بەئاسانی ئەیگێڕینەوە.. بەخوا تەنها خوا خۆی هێشتمانیەوەو بەرگەی ئەو دابڕانەمان گرد.. هەر رۆیی‌و لەتۆبزاوا دورکەوتینەوە.. هەر رۆیی‌و تادور ئەکەوتەوە وەك ئەوەی لەناو دڵمەوە شتێ راکێشی‌و بەستراببێتە دەرگای قاعەکەو منداڵەکانمەوە ئاوابوو، ئازاری ناگێڕدرێتەوە.. کەخستمانیانە رێ دوای خۆر کەوتنی بەیانی بوو واخۆریش ئاوابوو هەر نەگەیشتین.. هەر رۆیی‌و رێگاکە کۆتایی نەبوو.. شەوبوو جگەلە لایتی سەیارەکانی خۆمان هیچی‌تر دیار نەبوو وردە وردە هەستم کرد سەیارەکان لەقیرلایان داوەو بەسەر خۆڵدا ئەڕۆن.. سەیارەکان وەستان‌و هەندێ لەعەسکەریەکان کەوتنە گەڕان.. لەناو خۆیاندا ورتە ورتیان بوو ئەهاتن‌و ئەچوون‌و تەماشای ئێمەیان ئەکرد.. قەناعەتم وابووکە بزانە لەچەمەو شێوێك ئەگەڕێن‌و هەموومان ئەکوژن‌و فرێمان ئەدەنە ناوێوە..

یەك لەسەیارەی حیمایەکان رۆیی‌و قەدەرێکی پێ‌چوو گەڕایەوە ئەمانیش بەدوای‌دا کەوتنەوە رێ.. دیار بوو رێگەیان بزر کردبوو.. گەڕانەوە سەرجادەی قیرو قەدەرێکی‌تر رۆیشت.. هەندێ گڵۆپ دەرکەوتن لەدورەوە ئەدرەوشانەوە، بردمانمیان بەرەو گڵۆپەکان.. تۆزێ لەشوێنێکی بەرز بوو.. دیوارێکی بەرز دیار بوو زۆر بەرز بوو سەیارەکان بەرەو ئەوێ چوون‌و دەرگایەکی گەورەی هەبوو یەکە یەکە هەموو سەیارەکان چوونە ژورەوە.. لەناوەوە بینایەکی گەلێ گەورە بوو وەك قەڵا دروست کرابوو.. حەوشەیەکی گەورەی هەبوو.. نەیانهێشت لەناو سەیارەکان دابەزین، ئەو شەوە تابەیانی لەناو سەیارەکان ماینەوە.. بەڵام هەموو هیلاك‌و تینوین‌و

واخەریکە گیانمان دەرئەچیْ.. درۆنی‌یە ئەگەر بڵێم خەڵك هەبوو ئەو شەوە میزەکەی خۆی کردە ناو پێڵاوەکەیەوەو لەتینوا خواردیەوە تانەخنکێت..

بەیانی کەخوا رۆژی کردەوە.. ئەو کاتە سەیرمان کرد ئەمە چی‌شوێنێکە.. ئەتووت لەناو مەنجەڵ داین لەئاسمان زیاتر هیچ شوێنیْ دیار نەبوو..

بیناکە لەناوەوە هەمووی غورفەی درێژ درێژ بوو رویان کردبوو لەحەوشەکەی‌و بەدەوری یەکەوەو دووقات لەسەر یەك دروست کرابوو..

هەمووی پری خەڵك بوو.. ئێمەیشیان کردە ئەو قاوشانەوە.. هیلاکی ئاوین، ئاوێکیان داپێمان وەك ژەهر مار وابوو هەبوو یەکسەر ئەرشایەوە ئاوەکە ئەوەندە تاڵ بوو.. هەبوو مانگیْ ئەبوو لەویْ بوو ئەو زۆر بەپەرۆشەوە هەواڵی وەزعی کوردستانی لەئێمە ئەپرسی‌و زۆر خەمی بوو کەباسی وەزعەکەو خۆمانمان بۆکرد لەسیمایا ئەتبینی کەبارەکەی قورس تردەبوو..

ئێمەش پرسیاری وەزعی ئەوانمان لەناو سجنەکە کرد پێش هەمووی وتمان ئێرە کویْیە وتیان (نوگرە)یە باسی ئەو برسێتی‌و تینوێتی‌یەی کرد کەلە(نوگرە) چەشتویانەو رۆژانە چۆن خەڵکیان لیْمردوەو مردوەکان خراونەتە بەرسەگ..

هەر هاروشێت بووم لەتاوا، هەمووی چەند سەعاتێك بوو گەیشتبووین بەقەدەر مەینەتی‌و عەزابی هەموو ماڵ روخان‌و گرتن‌و جیاکردنەوەی جەرگەکانمان، لەو سەعاتەی نوگرەدا دڵم تەنگ بوو خەمو خەفەتم خوارد..

شوێنەکەیشی هەردیار بوو کاتیْ دروست کراوە بۆسجن ئێرە هەڵبژێردراوەو بەدروست کردنەکەشی‌یەوە دیار بوو کەبۆ سجنی کەسانێکە بیانەویْ بەخەفەتەوە بمرێت.. لەئاسمانێکی لێڵ زیاتر هیچ دیارنەبوو.. ئیتر خۆو شانس بوو قاعەی وای بوو چوار سەد کەسیان تیْکردبوو هەبوو سیْسەدو هەبوو کەمتریش.. ئێمە لەقاعەیەکدا بووین زۆری تیابوو هەمووی وەك لاشە بەسەریەکدا ئەکەوتین ئەبوو بەنۆرە قاچ راکێشی‌و بەنۆرە بخەوین لەبەر ئەوە

جێگامان نابووەوە، ئەوەیش هەر جۆرێك لەتەعزیب بوو ئەگینا قاعە هەبوو کەسی تیانەبوو..!

ئیتر وەزعێکی خراپمان بەسەر هات.. حاڵەتی زۆر خراپمان بینی.. خەڵکمان بینی زۆر رەزیل بوون بەخوا هەبوو وای لێهاتبوو خۆی پیس دەکرد.. هەبوو بۆگەنی کردبوو، کرم دای لێی هەتا مرد.. باس و بەسەرهاتی (نوگرە) ناگێڕدرێتەوە.. کابرایەکی لێبوو هەردوو قاچی لەئەژنۆیەوە نەبوو ئاخر نازانم ئەوە چیتاوان و گوناهێکی هەبوو بەقنگە خشکێ هات و چۆی ئەکرد.. کابرایەکی تری لێبوو ناوی (حسێن عەبدوڵڵا)بوو خەڵکی گوندی (چوقلیجە)بوو ناوچەی شێخ بزێنی چەند ساڵ پێش ئەنفال توشی (شەلەل)بوو لەماڵەوە کەوتبوو ئەویشیان گەیاند بووە (نوگرە) حکومەت هیچ جیاوازی لەنێوان ساغ و شێت و کەم ئەندام و گەورەو بچوکدا نەکردبوو هەرچی دەست کەوتبوو هێنابووی..

لەوێش گشتمان وەك یەك هیلاك بووین برسی و تینوو بووین، رەزالەتمان بینی.. بەهەزار حاڵ چۆڕێ ئاوت بەردەکەوت بای ئەوە نەبوو تاسبەی ئاوی ترت بۆدەهێنن بەشت بکات.. ئەمڕۆ خەریك بوو کوێربی لەتینووا ئەوەندە ئاوەت دەست دەکەوت کەتاسبەینێ بەهەمان شێوە تینوو بییتەوە..

نانیش نەبوو بەخوا تام و بۆی خواردنمان لەبیر چوو بووەوە.. تەنها رۆژی سەمونێکی رەقیان ئەداپێمان وەك بەرد رەق بوو.. جاری وابوو ئاوەکەیشمان پێوەخەسار ئەکرد ئەچووین ئەمانکردە ناو ئەو قوتووە ئاوەوە تابخوسێت.. ئاوهاش هەر ئیستفادەی نەبوو ناچار ئەمان کوتا و وەك ئارد ئەمانخوارد..

زۆر کەس لەتینواو لەبرسا مردن.. ئەگەر ئاوا بێحورمەتیان بەرامبەر بەتەرمەکانمان نەکردایاو نەیانخستایەتە بەردەمی سەگ.. مردنمان بەرزگار بوون ئەزانی.. بەلام خەمی گەورەمان سەرباری ئەو حاڵە.. مردن بوو چونکە گەورەترین عەزاب بۆئێمە ئەوەبوو کەلاشەکەمان سەگ بیخوات و بەردەوام ئەپاڕاینەوە خوایە قەبرمان بەنسیب بکەی..

دەور دوو مانگ لەویَ سجن بووین ڕۆژێك لیژنەیەك هاتو کەوتنە ناو خەڵکەکەو ئەوەی کەوەزعی زۆر خراپ بوو زۆر نەخۆش و پەککەوتەو لەگیانەلأدا بوون، ناوی ئەوانەیان نوسی و خستیانیانە سەیارەوەو بردیانیان.. لەخۆمانەوە هەریەکی قسەیەکمان ئەکرد.. یەکیَ ئەیووت بەخوا ئینشائەلأ بەریان ئەدەن و ئەیانبەنەوە، خۆئەگەر ئێمە بشمرین ئەوان هەواڵێکمان ئەبەنەوەو ئەڵێن واهان لەناو عارەبسان.. یەکیَ ئەیووت ئەیانخەنە ناو (شەتەوە). یەکیَ ئەیووت ئەمانە زۆر نەخۆشن و ئەیانبەن تەلەبەو مەلەبە لەسەریان دەرس ئەخوێنن.. هەریەکەو قسەیەکی ئەکرد..

دوای ئەوەی ئەو وەجبەیەیان لێمان برد وەجبەیەکیان هینایە جێگایان وتیان لە(دوبز)ەوە هاوردمانیان ژن و منالَ بوون و بەجیا سجن بوون نەیان ئەهێشت تێکەلَ یەکتری بین..

ڕۆژانە خەڵکمان لێئەمردو هەندیَ چۆلَ ئەبوو لەپڕ وەجبەیەکی تریان ئەهێناو قاعەکەیان پڕئەکردەوە.. هەبوو ئەیووت دوومانگە سجنم نازانم لەکویَ بوومە تەنها ئەزانم مەعەسکەر بووەو ئیتر هیچی تری لێنازانم.. ئەوانەیان ئەهێنا بۆلامان.. هەموویان بەوشنوەیەو لەشوێنی وادا سجن بوون کەدورە شارەکان بووەو یان لەقەلأ یاخود لەمەعەسکەرەکاندا بوون..

ئیتر بەو شێوەیەو بەهەزار دەردەسەری و ڕەزالەت ماینەوە تادەمەو پایز بوو چوار مانگ ئەبوو ئێمە گیرابووین وەجبەیەکیان هێنا دیاربوو ئەمانە لەرێوە گیرابوون هێنرا بوون بۆ(نوگرە) چونکە بەرەنگو ڕوو جل و بەرگەکانیاندا دیار بوو کەتازە گیراون و کەل و پەل و قاپ و قاچاخ و ئەشیای ماڵ و بەتانی و شتیان پیَ بوو.. قسەمان لەگەڵیاندا کرد، وتیان هەڵەبجەین و واشەش مانگە لەئێران بووین و هەر لەکاتی کیمیاییەکەوە ڕامان کردە ئێراندا، بەلأم لەئۆردوگاکانی ئێران بووین حکومەت عافواتی دابوو بەسەیارەی ئێرانی هاوردمانیان تاحدودو لەوێش سەیارەی عێراقی وەرمانیان گردو پێمانیان ووت ئەتانبەین لەهەڵبجەی تازە زەوی و خانووتان ئەدەینیَ و لەدایرەکانیش هەمووتان دائەمەزرێنین.. کەچی واهاوردمانیان بۆئێرە.. کەتەماشای ئێمەیان دەکردو بەرەنگ و ڕوومانداا دیار بوو چیعەزابێکمان چەشتووەو ئێمەش باسی ژیانی (نوگرە)مان بۆیان کرد

بەجارێ تۆقین و ئەوجا خۆزگەیان ئەخواست هەر لەهەڵەبجە بەکیمیایی یەکە نەجاتیان بوایا.. زۆر خەڵکی باش بوون، کەلوپەلی خواردنیان پێبوو بەزەییان بەئێمەدا ئەهاتەوە.. کەمێك خواردنیان داپێمان درۆنی یە بڵێم بەژیانم خواردنی واخۆشم نەخواردبوو ئیتر نازانم هی ئەوە بوو ماوەی چوار مانگ بوو لەسەمون زیاتر هیچمان نەخوارد بوو چی بوو..!

هەروا سێ و چوار رۆژبوو هەڵەبجەیەکانیان هاورد بوو رۆژی دوو تەنکەر ئاویان بۆمان هێنا، لەوە ئەچوو یەکێکیان دەرمانیان تێکردبێ چونکە ئەو قاعانەی لەوتەنکەرە ئاویان خواردەوە توشی نەخۆشی یەکی سەیر بوون.. ئیڵنجیان ئەداو ئەرشانەوەو ئەمردن و چاویان پەنجەیەك زیاتر ئەچووە قوڵداو رەشای تیاناماو هەر سپێنەکەی ئەمایەوە.. خۆم بینیومەو لەتەنیشت خۆمەوە خەڵك هەبوو ئەرشایەوەو بەو شێوەیە مرد.. لەیەك شەودا سی کەس بەو شێوەیە مردن و لەناوماندا قسەیەکیان بڵاوکردەوە، وتیان ئەم نەخۆشی یە بەبۆنەی هەڵەبجەیەکانەوەیەو لەئێرانەوە هاوردیانە.. نازانم بەرقێیان کرد چی بوو قایمقامەکەی (سەلمان) هات بۆلامان هاتە ناو حەوشەکەی (قەڵاکەی نوگرە)و لەگەڵ زابتەکاندا هەندێ هاتن و چوون، قایمقامەکە گەڕایەوە دوای ئەوە دوو سەیارە هاتن دکتۆر بوون لەقەزای (سەلمان)ەوە هاتبوون هەندێ (موغەزییان) بۆمان کرد.. بەلام لەوە ئەچوو موغەزییەکەیش هەر دەرمانی تێکرابێت چونکە هەبوو هیچ عەیبی نەبوو کەموغەزیەکەیان بۆکرد ئەویش ئێڵنجی ئەداو ئەرشایەوەو ئەمرد.. ئیتر بەوەیا بۆمان دەرکەوت کەتەنکەری ئاوەکەیش دەرمانیان تێ کردووەو موغەزیەکانیش هەر دەرمانیان تێ کردبوو.. چونکە ئەویش زۆری کوشت، تامانگی یانزەماینەوەو نازانم چۆن خوا نەمانی کوشت.. رۆژێك هاتن و کەوتنە ناومان هەندێ ناوی تریان نوسی و منیش بەر ئەو ناونوسینە کەوتم نەمان ئەزانی بۆچی یە.. ئەوانەی ناویان نوسرا بوو بانگمانیان کردە حەوشەکەوەو سواری سەیارەمانیان کردو هێنامانیانەوە بۆ(سەماوە) پێنج رۆژ زۆر خزمەتمانیان کرد.. لەخەستەخانەیەکی چۆڵ دامانیان نابوو.. پێمانیان ئەوت ئەوانەی پێش ئێوە بەردراون، شێوەی ئینسانیان لەرووبڕابوو خەڵك لێیان ترساوە.. ئێوە خزمەت ئەکەین و حەمامتان بۆ

ئەکەین ئەو سائەتانبەینەوە.. سەرو ریشمانیان تاشیو حەمامیان بۆمان کردو جۆرەها خواردنیان داپێمان..

دوای ئەو پێنج رۆژە هاوردمانیانەوە بۆ(تۆبزاوا) خستمانیانە ناو قاعەیەکەوە.. هەستم ئەکرد قاعەکانی سەرەوە خەڵکی تیابوو جلیکوردی لەبەریان بوو.. دور بوون لەئێمەوە ئیشیان پێیان ئەکرد. کەئەکەوتنە بەرچاوم وەك ئەوە وابوو کەبراکەی خۆم بێت شێوەی زۆر لەو ئەچوو.. شەوێك لەتۆبزاوا هێشتمانیانەوە ئەو هەموو دیمەنە ئەهاتنەوە بەرچاوم کەشەش مانگ لەوەو پێش بینیبوم لەوە ئەچوو ئەم زاڵمە هەر بۆئەوە هاوردبێتمانیانەوە تۆبزاوا تاخەفەتو مەراقی زیاتر بخۆینو کوڕوکچەکانمان بیربکەوێتەوە..

یەکە یەکە مناڵەکانم ئەهاتەوە بەرچاو دەنگی ئەو دوو کوڕە بچوکەم کەشەرواڵکەمیان گرتبوو ئەیانووت باوە جێمان مەهێڵە ئەهاتەوە بەرگوێم.. پشتم شوێنی قۆناغە تفەنگەکە ئەیبریسکانەوە.. ئازار بەناخمدا ئەچووە خوارەوە، باش بوو بەیانی خستمانیانە ناو سەیارەکانو بەرەو کەرکوكو لەوێوە بەرەو چەمچەماڵ هاوردمانیانو لایان نەداو بەرمو سلێمانی رۆیشت.. لەوێ سەرلەنوێ ناومانیان نوسیو وەرەقەیەکیان بۆمان کردو گەڕاندمانیانەوە بۆچەمچەماڵو لەقایمقامیەتی چەمچەماڵ بەکەفالەت بەرمانیاندا..

تاراپەڕینەکە هەر لەم ماڵو ئەو ماڵدا داڵدەمیان ئەداو هەر رۆژە لەماڵە ناسیاوێك بووم چونکە خۆم کەسم نەمابوو.. کەراپەڕینەکە بوو دوای خەڵکەکە رای کرد بۆئێران.. من رام نەکرد بۆئێران هاتمەوە بۆئەم دێیەو دەستم کردەوە بەدروستکردنەوەی کولبەیەكو تاماوەیەکی زۆر کەس لەم ناوچەیە نەبوو بەتاقی تەنیا ئەژیام، دواتر خەڵکەکەیش لێی هاتەوەو لەوکاتەوە هەر لێرە ئەژیم.. بەلاَم بڕوا بکە رۆژانە دڵم سەغڵەت ئەبێ.. رۆژانە ئەنفالەکەم بیرئەکەوێتەوە..

بەردەوامیش چاوم بەو رێگایەوەیە بەڵکو هەواڵێك لەو ئازیزانەوە بێتو خوابکات تائێستا مابن..

وەك گورگ چۆن بنیشێتە ناو مەڕ، ئاوا کەوتنە ناومان و منالەکانیان لێمان سەند.. هەرشێت بووین لەتاوا.. ئاخر زاڵمی بگاتە ئەو شێوەیە بێن لەناو سجندا دات بنێ و لەناو سجنیش منالەکەت لەباوەشت بفڕێنن..

# نەسرین مەجید کەریم

**لە دایکبوی ساڵی ۱۹۵۲گوندی عەلی مستەفا- ناوچەی قادر کەرەم**

چونکە فکری منالی تیژە، ئێستاش هەر لە بیرمەو قەتیش لەبیرم ناچێتەوە، کەمن ئەو کاتە ۱۰بۆ ۱۱ساڵان بووم، دایكو باوکم ئەترسانو لەئاوایدا باس ئەکرا کە ئەڵێن (عارەب) داوێتی بەسەر ئاوایەکانی ئەو ناوچەیەداو (فەرهوود)ی کردووە.. گەرچی ئەوەندە کەلوپەلی ناوماڵیشمان نەبوو.. خەڵك ئەو جا



فەقیر بوو.. هەرئەوەندەی هەبوو پێی بژیو پێی بخواتو پێی بخەوێ. مەڕوماڵات کەم بوو.. بەڵام هەموو شتێکیش هەر ئەوە بوو.. ئەگەر کەمیش بوبێ. بۆ ئەو کاتە زۆر زۆر بوو..

دایانە سەر ئاوایەکەی ئێمەشدا، خەڵك لەترسا رامان کردو دێیەکەمان چۆڵ کرد.. عارەبی پێ پەتی هاتن هەرچی هەبوو ئەیان برد، مەڕومالآت کەل و پەلی ناومالٚ.. قەل‌ومریشك.. هێزە رۆن.. هەرچی هەبوو بردیان‌و ئاگریان ئەنا بەماڵەکانیشەوە. (گسکیان لێدا) تالآنمانیان کرد.. ئەو چەند رۆژەی کەهاتن بۆ تالآنی و وەك رەوە کوللە رویان لەهەرشوێنێ بکردایە.. خەڵك بۆ شوێنێکی تر رایان دەکرد.. زستانیش بوو پەت پەتی یەخراو وەسەرمان داهات.. وەخوا مالٚ هەوی ئەو کاتە منالٚیان لە سەرما رەق بویەوە. لەبرسا مرد.. لەژێر کەلۆەزدا فەوتیا.. ئەو کاتەش وەزعێ خراو وەسەر ئەم کوردەداهات.. ئێستاش خەڵك وە ساڵ (بەعسی‌یەکە) یان ساڵ (راکە راکەکە) ناوی ئەوەن.. موچوڕکە وەلەشما دێت..!

سەرلەنوێ بەهەزار هیلاکەت دەبێ مالٚ دروست بکەیتەوە.. دێیەکانی ئێمەش واریداتمان لەسەر مەڕداری‌و فەلاحەت بوو.. ئەو وەختە وەك ئێستاش نەبوو، فەلاحەت هیلاکی بوو بەگاجووت دەغڵو دانمان ئەکردو بەدەس ئەمان دوریەوە.. بۆیە ژیانی گەنجێتی ئەو سەردە مەی ئێمە هەمووی هەر دەردە سەری بوو.. ئەو کاتەش شووم کردبە (غازی‌عەزیز بابا) کەخەڵکی گوندی سۆران– ناوچەی جەباری بوو.. ئەو گوندەش وەك ئاوای خۆمان وابوو.. ژیانیش لەوێ هەروەك ژیانی لای خۆمان‌و رەنگە بڵێم قورس تریش بوو..

سەرباری ئەو ژیانە پڕ چەرمە سەریەمان بەردەوام لەترس‌و دڵە راوکێدا ئەژیاین‌و ترسی ئەوەمان هەبوو حکومەت پەلامارمان بدات.. چونکە زوو زوو یان بەجەیش ئەیدایە سەرناوچەکاندا یان (تەیارە) تازە پەیا بووبوو ئەهات‌و رەمی ئەکرد..

من کاتێ شووم کرد ئەو کاتە ماوەیەك بوو دنیا کەمێ ئارامەوە بووبوو. من نازانم ئەیان ووت حکومەت‌و مەلا موستەفا رێکەوتنە کەئیتر شەڕنەکەن‌و حکومەت حەقبداتە کوردو ئیتر نە عارەببداتە سەرماندا فەرهودمان بکات‌و نەتەیارەش رەمی بکات.. بەلآم ئەوەندەی پێ نەچوو، وەزعەکە خراپ بوەوە،

ئەو کاتە ئەیان ووت رەیسی عێراق باشە بەڵام صەدام دەرهەق بەکورد زۆر خراپە.. ئیتر نازانم ئەو صەدامەی ئەو جایش هەرئەم زاڵمەی ئێستا بوو یان ئەویش هەر ناوی صەدام بوو.. رێکەوتنەکە تێك چوو. جارێکی تر ڕاکەڕاکێ دروست بوو.. هەمیسان جەیش پەلاماری دێیەکانی دایەوە.. ئەو جارەش ئاوایمان چۆڵ کردەوە.. من تازە (حامیلە) بووم وزگم بەنۆبەرەکەم پڕبوو.. ئیتر بزانە ئەوەکەیە.. ئەم کوردە لەو کاتەوە بەشی هەرڕاکە راكەو پەت پەتی بووە.. بەخوا رۆژێ خۆشمان بووبێ دەرۆژ بەترس و مەینەتیەوە ژیانمان بردۆتە سەر.. من لەوەتەی خۆم ناسی بوەوە هەر ئەترساین لەحکومەت و جەیش، ئێستا ئەڵێن لەووڵاتانە حکومەت و جەیش خزمەتی خەڵکەکەی خۆیان ئەکەن و ئاوو کارەبا و خەستەخانە ئەبەن بۆ دێیەکانیان.. ناشوکری خوانەبێ ئەوەی ئێمەش تەیارەو جەیش و جاشی بۆمان ئەنارد.. ئیتر براکە من ساڵوماڵ نازانم شەڕ ئێران و عێراق هەڵگیرسا بوو قلەقلە پێشمەرگە پەیدا بو.. ئیتر بەبۆنەی پێشمەرگەوە تۆزێ حەساینەوە چونکە تا پێششمەرگە پەیدا نەبوو بوو هەرجارنەجارێ جاش ئەهاتن و ئاوایان ئەڕوتانەوە.. یاجەیش ئەهات نازانم بڵێم چیان پێمان ناکرد.

دوای مامە ریشە پەیدابوو ئیتر ئیسراحەتمان کرد، نەجەیش نەجاش بەخوا عەلی کۆپتەریش نەیەوێرا بێتە سەرمان.. تۆزێ ژیانمان باش بوو کەوتینەوە سەرخۆمان.. کەوتینەوە ماڵ داری.. ئەم مەکینەو دەڕاسەو شتانە پەیدا بوو. کەوتینە خۆشییەکەوە مەگەرتازە هەر ئاخی بۆ هەڵکێشین..

من نازانم بۆچی حکومەت حەزی نەئەکرد، ئێمە لەماڵ خۆماندا بەخۆشی بژین.. نازانم ئەم زاڵمە خوا خەلقی کردبوو بۆ ئەوەی نەیەڵێ کورد بحەسێتەوە چی.. ئیتر وەزعەکە گۆڕا..(ریشە) کوژرا.. حوکومەت پەلاماری دێ کانیدا.. کۆپتەر شوانی ئەکوشت.. خەڵك ئەچوو بۆ شار لەسەر جادەئەیان گرد. جەیش و جاش بە مدەرەعەو دەبابەوە ئەهاتنە سەرمان

خۆیان کردە ئاوایدا جەماعەت (حەسیب و عدنان) بوون، ئەوان هەردووکیان مستە شاروبوون و هەردوکیان خەڵکی ناوچەکەی خۆمان بوون ئەوان بەرلەجەیشەکە ئەهاتنە دێیەکان و قسەیان لەگەڵ خەڵکدا ئەکرد کەخۆیان بدەن بەدەستەوە لەبەرئەوەی کەخۆیان خەڵکی مەنتیقەکەی خۆمان بوون و ئێمەش بۆئەو رۆژە لێ قەوماو بوین رۆژە رەشمان بوو خواخوامان بوو کەسێك قسەیەکی خێرمان بۆبکات.. ئەو دوومستەشارە کوڕی ئاوایەکانی خۆمان بوون قەناعەتمان پێیان هەبوو کە دیفاعمان لێ بکەن عەدنان زوتر لەگوندی گۆلەمەو سلقی ئەفرۆشت و بووبوە مستەشارو حەسیبیش خەڵك محمود پەریزا بوو) کەهاتنە ئاوایی پێمانیان وت بچن زەلامەکانتان بهێننەوە ئێمە (عافواتمان) بۆیان وەرگرتووە ئەیانبەین (٥) رۆژ لەلەیلان ئەبن و ئەیانهێنینەوە.

ئێمەش لەسەر سیقەی ئەوان هەریەکەو چوین لەو کونە تەیارەو کەلۆزانەی کەزەلامەکان خۆیان لێ حەشار دابوو هێنایانمانەوەو تەسلیم بەمستەشارەکانمان کرد.. کەچووین بەشوێنیان دا ئەیانووت نایەینەوە خۆمان نادەین بەدەستەوە بابمان کوژن.. بەلاَم کەوتمان هێشتا جەیش نەهاتۆتە ئاوای و حساوەکە وایەو حسیب و عەدنان هاتوون ئیتر گشت زەلام ئاوای هاتەوەو بەو دەردەچوون.

کاتێ لەدێیەکەش دەرچووین بەرەو سەرجادەی محمود پەریزا هەموو خەڵك ئاوای بووین بەژن و منداڵ و زەلام و مەڕو ماڵات ئاوایشمان دابووەپێش.. یەك عەسکەرێ چییە لەگەڵ مان نەبوو تەنها جاشەکان نەبێ.. بەلاَم کۆپتەر بەئاسمانەوە وەك (رەوەکوللە) دێت و دەچێت کاتێ گەیشتینە سەرجادە تەماشامان کرد لە (بەین قۆچەلی و محمود پەریزا) دونیایە عەسکەری لێیەو سەرجادەوبان هەمو قوتەبەرزەکان و ئەوردەشت و دەرەیان هەمووی گرتووە.. خەڵك ئاوایەکانی تریش لەویا خڕکراونەتەوە... هەروا خەڵك بوو دابوویانە پێش و ئەیانهاورد.. هەبوو وەکەروبار، هەبوو وەتەرەکتەر، هەبوو وەسەیارەو وەپێ گشت ئەو

خەڵکـەیان خڕکـردەوە.. ئـەتووت ڕۆژی حەشـرە.. خەڵکەکــە واق وڕمــابوو نــەمان ئــەزانی چیـیــەو بۆوامــان لێ ئەکــەن.. ناشــکوری خوانــەبێ بــووە بارانێکیش هەر مەپرسە.. وشکایی لەبەدەنمان نەما.. نازانم چۆن باسی کەم کەئەو خەڵکەچی بەسەر هات لەژێر ئەو لێزمەی بارانەدا کۆمەڵێ سەیارەی ئیڤای عەسکەرییان هێنابوو.. هەموو زەلامەکانیان تێکـردو بەحیمایـەوە خسـتیانە ڕێ.. نـەمان ئـەوێرا دەم هەڵبێنینــەوە ئـەمانوت ئـەمان کـوژن.. یەکەیەکە پیاوەکانیـان برد.. منـاڵ زیـڕە زیـڕی تێکـەوت ئـەگریان بـەدوای باوکیاندا.. ئەوانیان برد تاسەعات (٤) ئێمەشیان لەو هەردەیــە هێشـتەوە بارانیش بوو سەعات (٤) زیل عەسکەریان هاوردو بەقۆناغە تفەنگ کەوتنە سەرو گوێ لاکمان‌و بەزۆر بارمانیان کرد.. زیلەکان بەرزبوون نەپەیژە هەبوو نەهیچ لەتاو ئەوەی لێدانی زۆرت بەرنەکەوێ خۆمان هەڵئەگژان بەقەدیەوەو سوار ئەبووین.. جوندیـەکان پـەلی منداڵیـان ئـەگردو بۆ ناو ئیڤاکـان هـەڵیان ئەدا.. پڕیان کـرد.. بەوشێوەیە بارمانیـان کـرد لـەڕیز سەیارەکان ئەوەسـتا تاهـەموو ئـەو خەڵکـەیان بـارکرد.. نـازانم بڵێـم چـەنێ بـوو.. هەرسـەیارەی عەسـکەرێکیان دوان لەدەرگاکەوە بەتفەنگـەوە حیمایـەمان بـوون.. ئـەتووت گورگـن بـۆ منداڵیٔەیوێرا سـەربەرز بکاتـەوە. تێیـان ئەسرەوان.. خـەریك بـوو بتۆقـین ئـەبێ بـۆ کوێمـان بـەرن.. سـەر بـەو جادانـە هـەمووی عەسـکەر گرتبووی.. لەئاسمانیشەوە کۆپتەر بەسەرماندا ئەهات‌و ئەچوو حیمایەمانی ئـەکرد.. قافڵەیــەکی زۆر زۆر بویــن چــەنێکی ژن‌و منــاڵی تیـابوو ئەوەنــە ســەیارەش مــەڕو مــاڵات‌و ئــەوەی لەماڵــەکانماندا بەکــەڵك ئــەهات بـەتالانیهاوردبوویان.. بـەخوا هـەربۆ ئـەوەی ناموسـی کـورد بـەرن ئیڤـای عەسکەری هەبوو چەندین شـەڕواڵی ژنیان پێوە هەڵواسی بوو.. لەناو ئەو سەیارانەدا خەریك بوو زراومان بچێت نەمان ئەزانی بۆچی وامان لێئەکەن‌و بۆ کوێمان ئەبەن.. ئەم حکومەتـە چـەند جارێکیتر ماڵ وێرانـی کردبویـن‌و ئاوایەکانمانی سوتانبوو چەند راکە راکێکی ترمـان بەسـەرا هـاتبوو. بـەڵام ئەمجارە جیاواز بـوو لەهـەموو جارەکـان. زەلامـەکانمانیان بـردوو ئاوایـان

سوتان و ماڵیان تالآن کردو خۆشمان ئەبەن..! مەگەر خوا سەر لەم زاڵمە دەرکات وەتەمای چی‌بوو..

ئێوارەبەر لەخۆرئاوابوون گەیاندمانیانە چەمچەماڵ هەرلەبان مەقانەوە مدەرەعەو سەیارەی عەسکەری سەرداپۆشراو نازانم ئەیانوت حەرەس جموری بوو چی‌بوو ئەو سەر ڕێگایانەیان گشتگرتبوو.. کۆپتەریش چوار ئەرۆی چوار ئەهات.. کەگەیشتینە چەمچەماڵ بردمانیانە ناولیواکەی چەمچەماڵەوە.. حەشامات دوونیا لەوێ بوو بەخوا درۆنی‌یە ئەگەر بڵێم وەك شارە مێرووله خەڵك‌و سەیارە بەدوای یەکەوە بوون.. وەجبەیەك خەڵکیان دائەگرت، لەولاوە ئەت بینی خەڵکیان بار ئەکردو.. لەزیل داتیان ئەگردو ئەتیان کردە سەیارەی کۆستەرەوە..

کەئێمەیان گەیاندە چەمچەماڵ لەدەرك لیواکە توشی قافڵەیەکی تری سەیارە بووین هەمووی کۆستەر بوو پڕبوو لەزەلام لەلیواکەی چەمچەماڵەوە بەرەو کەرکوك ئەبران.. ئێمە زەلامەکانی ئاوای خۆمان تیاناسییەوە.. ئەوان ٤سەعات بەرلەخۆمان بەئیڤای عەسکەری بارکریان‌و جاشەکان ئەیان ووت ئەیانبەنە لەیلان‌و دوای (٥) ڕۆژ ئەیان هێننەوە بۆ چەمچەماڵ‌و خۆشیان ئەبەن لەچەمچەماڵ حکومەت ئەرزو خانووتان ئەداتێ‌و لەدایرەکان خەڵکەکە تاعین ئەکەن.. کەچی زەلامی ئاوای خۆمان بینی والەناو لیواکەی چەمچەماڵەوە بەرەو کەرکوك ئەبرێن.. ئیتر زانیمان کەجاشەکان هەرچەندە کورد بوون‌و خەڵکی ناوچەی خۆشمان بوون، بەڵام خیانەتیان لەگەڵماندا کرد.. ئێمە ئەگەر لەسەر وەعدی ئەوان نەبوایە ئەو هەموو گەنجە جوانەمان لەکونەتەیارەو هەردەکان نەئەهێنایەوە.. بەخوا شوێنی واهەبوو بۆ خۆحەشاردان بەهەموو ئەو حکومەتە نادۆزرایەوە، ئێمە چوزانین ئەوان درۆمان لەگەڵ ئەکەن..

هەربەدوای ئەواندا خۆشمانیان خستە سەیارەی کۆستەرەوە بەڵام تادوو سەعات هەرپریان ئەکردو ئەیان هێنایە ڕیزەوە ئەوەندە زۆر بوو.. بەقافڵە خستمانیانە ڕێ نازانم سەعات چەند بوو، بەڵام سەعات (١/١٥ )یەك‌و

چارەکی شەو گەیاندمانیانە مەعەسکەرێکی گەورە هەمووی قاعەقاعە بوو لەوێ چی حەشاماتێك بوو هەرچی بنیادەمی خوا هەیە لەوێ بوو.. دامانیان بەزاند ووتیان ئەمە (تۆپزاوا)یە..

هەربەوشەوە ناومانیان نووسی کەرەنگە بڵێم لەسەد شوێن ناویان ئەنوسی، خەڵکەکە ئەوەنە زۆر بوو ئاوایش هێشتا سەعاتێ لەریز رامانیان گرد تابەرمان کەوت ناومانیان نووسی و تەحقیقیان ئەکرد. پرسیاری ژمارەی خێزان و ئیشی پیاوەکەتوو دێیەکە چەند ماڵ بوو، کێت پێشمەرگە بووە و کێت فیرار بووەو کۆمەڵێ پرسیاری تریش، بەلام پێشمەرگەو فیرارت هەبوایە یان ناهەرهەمووی وەك یەك بوو وەك یەك گیرا بووین و یەك چارەنووسمان هەبوو..

لەوناونوسینە کەکابرایەکی عەرەب دانیشتبوو ئەیپرسی و کوردێکیش تەرجوومانی بوو، کەسیان جیانەکردەوەو دوای ناونوسینەکە ئەوەی کەخێزان بوو پێکەوە بوون بردمانیان بۆ ناوقاعەکان، بەلام قاعەی چی. بەوخوایە هەرقاعەیەکی دێیەکی ئەگرت ئەمەندە درێژ بوو. بەلام هەمووی پری خەڵك بوو.. ئێمەشیان ترجانە ئەو قاعەیەوە هەمووی بەسەر یەکدا کەوتبوو.. رێگەت نەبوو پابنێیتە سەرزەوی هەرچۆنێ پێت دانایە بەرلاشەی خەڵك دەکەوت.. بەلام ئەوزاڵمانە گوێیان لەوە نەبوو هەربەپاڵ ئێمەشیان فرێدیە ناویانەوە.. بەونیوەشەوە هەمووی هیلاك. هێز لەبەردەنمان نەمابوو لەترسا قورگمان ووشك بووبوو خەریك بوو کوێر ئەبووین بۆ قومێ ئاو.. برسێتیش تینی بۆ هاوردبووین، ئێمە خۆمان باشتر بووین بەلام منالٚ چی لەترساو لەتینواو لەبرسا زیرپوزاری تێکەوتبوو.. ئەو شەوەمان تابەیانی بەلورە لور بەرێ کرد.. بڕواناکەم کەس خەوچوبێتەچاوی.. بەیانی رۆژ بووە ئەو جالەپەنجەرەی قاعەکانەوە سەیرمان ئەکرد چ حەشاماتێ لەوێیە، نازانم ئەم هەموو خەڵکەیان لەکوێ وەهاورد بوو. من تائەو رۆژە بڕوام ناکرد کورد ئەوەندە زۆر بێت.. ئەو ساحەگەورەیە هەمووی رەشی ئەکردەوە، نازانم بڵێم چەند ریز قاعەیش بەدوای یەکدا دروست کرابوون.. پەیتا پەیتا بەزیل

عەسکەری و بەکۆستەرومونشەئە خەڵکی تریان ئەهاوردو هەڵیان ئەرشت.. ناتوانم ئەو وەزعە، ئەودیمەنە بخەمە پێش چاوتان کەچۆن کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکیان ئەهێناو وەك رەشەوڵاخ ئەیان بردو بەقامچی ریزیانیان ئەکردو ئەیانخستنە قاعەوە.. ئەتبینیوا جوندیەك لەپڕ بەقۆناغە تفەنگ ئەکەوتە سەرو گوێلاکی خەڵك، یان ئەتدی والەگەنجەکانیان ئەدا، کورە هەزار شت.. منالْت ئەدی بەپەل راکێشان بەدەست جوندیەوە.. ئەتبینی واژنێ پەلامار قاچ عەسکەرێك ئەدات کەمناڵەکەی جیانەکاتەوە.. عەسکەرەکە شەقی لەژنەکە ئەدا.. یاقۆناغە تفەنگی ئەدایە سەر ژنەکەوئەکەوت.. ئەبورایەوەو ئەویش پەلی مناڵەکەی رادەکێشاو ئەیخستە ناو کۆمەڵێکی ترەوە..! زۆر شتت ئەدی کەقەد ناتوانیت وەك خۆی بیگێڕیتەوە..

ئەورۆژەی یەکەم تائێوارە دەیان حالەتی لەوجۆرەو خراپتر بەبەر چاومانەوە دووبارە ئەبونەوە.. ریزێ سەیارە خۆیان ئەکرد بەژوراو خەڵکیان دائەگرت.. قافڵەیەك سەیارە ئەهات خەڵکی بارئەکرد.. وەك گەراجی لێ هاتبوو.. نازانم لەپای چی وایان بەم خەڵکە ئەکرد.. هەرلەپەنجەرەکەوە ئەماندیوا لەشوێنێ گەنج ئەخەنە سەیارەوەو ئەیبەن. لەشوێنێ بەس کەنیشکەکەیە.. شوێنی تەنها پیرەمێرد.. ئیتر رۆژە رەشێ بوو قەد لەدونیا نەبووە نا.. ئێمە لەناو قاعەکانەوە خۆزگەمان بەوانەی دەرەوە ئەبرد.. بەس نەبێ ئەوان لەدەرەوەن.. ئەشمان بینی ئەوانەی دەرەوەوالێیان ئەکرێتە قاعەوەو لێیان بار ئەکرێ. هەرچەندە کەس نەی ئەزانی بۆکوێیان ئەبەن.. بەلآم ئەشمان زانی کەبۆ بەردان نی‌یە.. چونکە ئەگەر بۆبەردانە ئەی بۆچی گرتومانیانن.. ئێمە ئەمان زانی ئەم حکومەتە زاڵمە. ئەو ئەیەوێت میللەتەکە گشتی بفەوتێنێ، ئەمان ووت بەخوا رەنگەبیان بەن و بیانخەنە شەتەوە.. بەلآم هەرخۆزگەمان بەوان ئەخوارد گەر بۆ مردنیش بێ خۆلەپێش ئێمەوە ئەمرن.. ئێمە وادوو رۆژ بوو گیرابووین، چۆڕێ ئاو بەسەر زمانمانا نەچوو بوو تیکەیە نانیان نەدا پێمان خەریك بوو منالْ هاروشێت بێ لەتینوان و لەبرسان، خۆشمان لەمنالْ خراپترمان بەسەر هاتبوو.. تاعەسرێ درەنگ

هاتن هەریەکی هەندێ نان و شۆربایاندا پێمان ئەوەندەمان برسی بوو وایەلاماری نانەکەمان ئەدا ئەتوت لەژیانمانا خواردنی وامان نەخواردوە.. کەمێ هۆشمان هاتەوە.. منالێ تۆزێ هێوەر بوونەوە.. بەڵام والەپەنجەرەوە ئاگامان لێیە چی بەو خەڵکە ئەکەن.. پەنجەرەکان یەکی بەبالآی زەلامێ درێژو باریك بوون و قاعەکان پەنجەرەی زۆری تیا بوو.. ئیتر لەوێوە هەر سەیری ئەو خەڵکەی دەرەوەمان ئەکرد.. ئێمە چونکە زەلامەکانمان لێمان جیاکرا بوونەوە. لەناو ئەو خەڵکەی دەشتەوە هەر چاومان ئەگێرا بەڵکو ئەمە خوایە لەناو ئەو عالەمەیا زەلامەکان ئاوای ئێمەشی تیابێت و بیان بینینەوە.. هەرچەندە خۆئەگەر بشمان بینینایە نەئێمەئەمان توانی بچین بۆلای ئەوان و نەئەوانیش ئەیان توانی بێن بۆلای ئێمە.. بەڵام هەرسەبوریەکی گەورەبوو ئەگەر چاومان بەیەك بکەوتایەتەوە

ئەو رۆژەمان بەو حاڵەوە بەرێ کرد، شەوهاتن لەقاعەکەی ئێمە زەلامە گەنجەکانیان هەمووی دەرکردو خستیانیانە دەرەوەو نازانم بۆ کوێ بردیانن چونکە شەوبوو.. یاخوا ئەوەی ئەو شەوە بەسەر ئێمە هات بەسەر گاوریشدا نەیات.. کەزەلامەکانیان ئەبرد منالێ چۆن پەل باوکی رائەکێشاو ئەیقیژان باوە جێمان مەهێڵە.. زریکەی منالو قیژەی ژن ئاسمانی کەرکرد.. بەڵام لەولێقەومانەدا کێ فریات ئەکەوێ..!

شەو دوای ئەوەش هاتن کەوتنە ناومان هەرچی منالی تیابوو بردیان.. وەك گورگ چۆن بنیشێتە ناو مەڕ، ئاوا کەوتنە ناومان و منالەکانیان لێمان سەند.. هەرشێت بووین لەتاوا.. ئاخر زاڵمی بگاتە ئەو شێوەیە بێن لەناو سجندا دات بنێ و لەناو سجنیش منالەکەت لەباوەشت بفڕێنن.. ئەمە چ گاورسانیەك بوو.. مەگەر لەدنیا بەس سەدام کردبێتی..!

زریکەی منال و هاواریان دنیای ئەلەرزان.. بەخوا لەتاوا وەك چۆلەکەی سەربڕاو هەڵئەبەزینەوە کەمنالەکانیان لێمان سەند.. منالێ خۆی ئەنووسانە ژێر دەست و پامانەوە.. بەڵام ئەو زاڵمانە رەحم خوا لەدڵیانا نەبوو.. خەڵك

ئاوا لەحەیوانیش ناکات.. بەخوا ئەوەندە بەرق و بەقێزەوە پەل منالْیان ئەگرت و فرێیان ئەدا(قەت ئاوا مشکە تۆپیومان فرێ نەداوە).

ئەوەندە بەبێ ئەهەمیەت سەیرمانیان ئەکرد.. منالْەکانیان برد.. بەلاْم هەر گوێ مان لەزریکەو هاواریان بوو.. تابەیانی لەتاوا خۆمان ئەدا بەدیوارەکاندا هەرهارو شێت بووین.. حەزمان ئەکرد بمرین و عەزابی زیاتر نەبینین.. بەخوا ژنی وامان لابوو لەتاو جەرگەکەی درۆنی یە گەر بلێم تابەیانی دەجار بوراوەتەوە.. من خۆم(٥) منالْم پێبوو لێمان سەندو خۆشم(حامیلە بووم و مانگ خۆم بوو).لەتاو ئازاری منالْەکان و ئازاری گیانم خەریك بوو رۆحم دەرچێت.. ئەو شەوە تابەیانی، نوزاینەوە.. پاڕاینەوە.. نازانم خوانابووی لەدڵیان، نازانم قەرارەکە گۆرا.. نازانم یان هەربۆ تەعزیبدانمان بوو شەو منالْەکانیان لێمان جیاکردەوە.. بەیانی منالْە کانیان هاوردەوەو کردیانەوە ناوقاعەکانەوە.. منالْ چی منالْ.. گشتی وەك مریشك ئاوە رووت کراو وابوو ئەوەندە هەڵلەرزی بوون.. چاویان ئەتووت خوێت تێ کردوە.. بەحالْ هەناسەیان دەرئەچوو ئەوەندە نووزابوونەوە.. هەڵئە لەرزین.. تومەس شەو بەتەنکەر لەقاعەکە ئاویان کردووە بەسەریاندا..نازانم خوا چۆن ئەوەی قبوولْ کرد.. منالْ ئاوها گووناهی چی‌یەبەوەدەردەی بەریت.. نیوەی هەرشێت بوو لەتاوا.. توشی نەخۆشی پەرکەم هات..

ئەو رۆژە تائێوارە هەرنوزانەوەو ژێر نەبوونەوە..خۆرئاواجارێکی تر ئەوبەرازانە دەرك قاعەیان لێمان کردەوە، خەریك بوو زراومان بچێت. بانگمانیان کردە دەرەوە یەك دوو ریز سەیارەیان وەستانبوو. هەرلەدەرك قاعەکە کەوتنە جیا کردنەوەمان. دوو شەو پێشتر زەلامە گەنجەکانیان برد بوو، لەوێش پیرێژن و پیرەمێردەکانیان لەئێمە جیاکردەوەو خستمانیانە ناوکۆمەڵێ سەیارەی سەرداپۆشراوەوە (موقەپەت) بوون.. بردمانیان.. لەوێ چەند دایك و کچ، باوك و منداڵ.. ژن و پیاو لەیەك دابڕان.. ئێمەشیان خستە ناو قافڵەیەکی ترەوەو بەرێمانیان کرد.. زۆرمان پێنەچوو رەنگە هەر سەعاتە رێیە شتێ زیاتر بوایە.. راوەستان و لەمەعەسکەرێکی تردا

دامانیـان گـرد ئـەویش وەك تۆپـزاوا تەلبـەندو سـاحەیەکی گـەڵێ گـەورەو کۆمـەڵێ قاعـەبوو نـازانم حکومـەت زووتـر ئـەم قاعانـەی بۆچـی دروسـت کردبـوو.. لەوەئـەچێ هـەربۆ کـورد دروسـتی کردبـێ.. دامانیـان بـەزاندو ریزمانیـان کـردو جـارێکی ترکەوتنـەوە ناونوسـینمان.. لـەناوماندا هـەبوو (وتووریـا) بـوو پرسـیاری لەعەسـکەرەکان ئـەکرد.. زانیمـان کەئـەم شـوێنە (دوبز)ە.

کردمانیانـە نـاو ئـەو قاعانـەوە، هەرقاعـەی رەنگـە بڵـم (٣٠٠) ژن ئـەبووین بێجگـە لـەمناڵ.. جێگامـان زۆر سـەغڵەت بـوو هـەموو وەك مـەڕو بـزن بەسـەر یـەکدا کـەوتبوین.. تائـەو کاتـەش مناڵـەکان لەترسـی ئـەو شـەوەی جیاکرابوونەوەو ئاو کرابووە ژێریان، هەربەرەنیسکیان ئەداو هەڵئەلەرزین.. وەرە بیهێنەرە بەرچاو خۆت لـەماوەی(٥) رۆژدا ماڵت بسـوتێنن و پیاوەکـەت لـەخۆت جیـا بکەنـەوەو کەنیشـکە گەنجـەکان بەبـەرچاو خۆمانـەوە بـەرن و خۆشـت بەوشـێوەیە بخەنـە قاعەیەکـەوە وەك جـەنازە بەسـەر یـەکدا کەوتبووین.. ئیتروەرە بەرگەی ئەو هەموو ئازارە بگرە.. بەخوا ئەڵێن (پشیلە حەوت رۆحە) بەلاّم وانی‌یە ئێمە حەت رۆح بووین کەنەمردین..

هەریەکەم رۆژهاتن لەقاعەکەی خۆماندا دوو کەسیان دانا کەسەرو کاری نان خواردنمان بکات، دیـار بـوو ئەمانـە دووبـز بـەرەحم تربـوون لەوانـەی تۆبزاوە.. رۆژانـە خواردنیـان بۆمـان ئـەهێناو رۆژی دووجـار رێگایـان ئـەدا بچینە سەرئاو.. هەندێ وەزعمان لەپێشوتر باشتر بوو.. بەلاّم باشییەکەی وەك ئـەوە وابـوو تـۆ تینـووت بێـت و کەوتبێتیتـە هیلاکـەت کـەجامێ ئـاوی گەرمیشت دەست کەوێت هەربـەلای تـۆوە زۆرە.. ئـەوەی ئێمـەش وابـوو.. چونکـە (٣٠٠) خـێزان لەقاعەیـەکدا هەریـەکی بەکۆمـەڵێ مناڵـەوەو رۆژی دووجار دوو لەتەسەموون و تـۆزێ شـۆربات بدەنـێ.. بەلاّم باشیەکەی ئەوە بوو لەچاو تۆبزاوادا باش بووین.. ئەگینا هـەر رۆژێکمـان مردنـێ بـوو.. مـن تـەواو کەوتبوومـە هیلاکـەت گەیشـتبوومە حاڵـەتی منـاڵ بـوون و ژان ئەمیگرت و ئەبورامەوە وەرە لـەناو ئـەو هـەموو ژن و مناڵـەدا کـەجێ نـەبوو

لەشوێنەکەی خۆت پێراکێشی منداڵت ببێ.. بێ هیچ پەڕۆو پاتاڵێ، کورە هەر پارچە پەڕۆیەك نەبوو بیخەیتە ژێر خۆت. نازانم بڵێم چی وەزعێك بوو.. یەك دوو رۆژ بەو حاڵەوە مامەوە بەڵام بەرۆح زیندوو بووم گیانم ئەدا..(١١) پانزە رۆژ بوو بردبومانیانە (دوبز) منداڵم بوو.. هەر پانزە رۆژ بوو لەئاوای خۆمان نەمابووین چونکە(٤) رۆژ لەتۆبزاوا هێشتمانیانەوە..

کەمناڵەکەم بوو هیچ نەبوو(بە بەرد) ناوکیمان بڕی.. ئەوەنە زاڵم بوون کەرتەمووسێکیان نەئەدا پێمان سوور ئەیانزانی چەند ژنی دووگیانی تیایەو منداڵی ئەبێت.. ئەوەنەش بێ شەرەف بوون عەسکەرەکان ئەهاتن لەپەنجەرەکانەوە سەیرمانیان ئەکردو گاڵتەیان پێمان ئەکرد..

منداڵەکەم کوڕبوو هەریەکەم رۆژ ووتم خوای کرد نەمردین و ماین ناوی ئەنێم (هەژار). ئیتر خۆم بەو نەخۆشیەوەو بەووەزعە خراپەوە نازانم بڵێم چۆن ژیاین.. باس ناکرێ نابەخوا کەس ناتوانێ وەك خۆی بۆتان بگێڕێتەوە.. یەك ساڵ دانیشن باستان بۆبکەم بەسەر هات و پەت پەتی ئەنفال تەواو نابێ... ئەزانی چی نەخۆشیەکی خراپ لەناو ئەو خەڵکەدا بڵاو بووەوە.. هەمووومان هەر گەڕوگوول بووین.. منداڵ گشتی گیانی ئەبوە زام.. تووشی رشانەوەو سکچوون بوون.. هەموو ووشك بوونەوەو هەرئێسقانەکەیان مابوو..

رۆژوا هەبوو (١٠) منداڵ ئەمرد لەوقاعەیەی ئێمە لەپەنجەرەکەوە بەحەرەسەکانمان ئەووت و ئەهاتن ئەیان برد.. ئیتر نەمان ئەزانی چیان لێ ئەکەن.. ئازارو پەت پەتی ناوزیندان گێڕانەوەی تەواو نابێ.. ژن هەبوو ئەمرد دوو منداڵی کۆرپەی لەدوای خۆی جێ ئەما لەوقاعەیەدا ئەتووت پەڕەسێلکەن ئەوەندە گوناهبوون.. کەس نەبوو هەر(میزێکیان) پێ بکات.. تابەودەردەوە ئەوانیش ئەمردن.. دەیان نمونەی لەوەخراپترمان بینی...

کەگیرا بووین مانگی رەمەزان بوو بەو حاڵەمانەوە زۆرکەس رۆژوی ئەگرد، ئەوەندە زاڵم بوون لەگەڵمان لەرەمەزاندا خواردنیان کەم ئەدا پێمان.. یان ئەهاتنە دیار پەنجەرە،کەوبەگلاس چایان بەبەر چاو ئەو هەموو ژن و

منداڵەوە ئەخواردەوە یان پسکیتیان ئەخواردو (کامی کامیان) بەمناڵەکان ئەکرد.. بەخوا کەبۆنی ئەو چایە ئەهاتە سەرماندا قاژەی جەرگمان ئەهات بۆچای.. دەوەرە هەرچی حەزو خۆزگەت هەیە لەچایەکدا کۆی کەرەوەو ئەوانیش نەتدەنێ..

ئیتر وەك ئەوە وابوو نۆرەمان گرتبێ بۆ مردن و کەی بەرمان دەکەوێت بمرین و نەمان ئەزانی بۆگیراوین، نەمان ئەزانی بۆچی لێرەین، بۆ نامان کوژن، ئەی بۆبەرمان نادەن.. رۆژێکمان بەساڵێ ئەبرد..

زوو زوو ئەهاتن قافڵەیەکی سەیارەیان ئەهاوردو ئەکەوتنە خەڵك بارکردن. کەس نەی ئەزانی بۆکوێیان ئەبەن.. لەتۆبزاوا کەگەنجەکانیان جیاکردەوەو دەستوو چاویان ئەبەستنەوەو بردیانن خەڵکەکە ئەیان ووت ئەیان بەن بۆ موصڵ.. کەپیرێژن و پیرەمێردەکانیان جیاکردەوەو بردیانیان ئەیان ووت بۆ نووگرەو سەلمانە.. کەکچە جوان و جاهێڵەکانیان جیاکردەوەو بردیانیان خەڵکەکە ئەیان ووت ئەیانبەن ئەیاندەن بە(عەرەب).. بەڵام ئێمەیان هاوردە (دوبز)و دوای ئەهاتن لەوێش خەڵکیان ئەگواستەوە.. یەك دوو جار ووتیان ئەیانبەن بۆ(تکریت). ئیتر مەگەر خوا بزانێ.. لەقاعەکەی تەنیشت ئێمەوە کەهەندێ ناسیاوی تیابوو بردیانن. کەس نەیزانی بۆکوێ بران.. ژنەکەی (مام عبدالله) خەڵکی (مامشە) بوو ناوی (نەبات) بوو، ناسیاوێکی ترمان ژنی (مام رەسوڵ) کەخەڵکی (کانی سارد)ەو ژنەکەی ناوی (عەسلی) بوو. لەناو ئەو خەڵکە بوون کەلای ئێمەوە بران ئیتر هەتا ئێستا هیچ سۆراغێکیان نی‌یە..

بەخوا ئەو چەند مانگەی ئێمە لەوێ بووین هەرلێیان بەکێش ئەکردو تەواو نابوو ئەوەندە زۆر بوو... یەکێ لەوانەی کەخواردنی ئەدا پێمان پیاوێکی گەلێ باش بوو. زۆر بەرەحم بوو تۆزێ (تورکمان نسبەت) بوو کوردیەکەشی تەواو نەبوو ماڵیان لەکەرکوك بوو ئەو ئەهات بۆ لامان هاڵ و هەواڵی کوردستانی بۆ ئەهێنایین.. پرسیار زەلامەکانیان لێ ئەکرد. دیار بوو یان ئەترسا. یان نەی ئەزانی چونکە سەری ئەلەقان و ئەیووت نازانم لەکوێن و بۆ کوێبراون.. ناوی (هادی) بوو چاوی تەواو نەبوو پێیان ئەوت

هادیە کوێر) ئەیووت مەزرەعەم هەیە لەلەیلانو بەزۆر کراوم بەجەیشی شەعبی..

بەوحاڵەوە تا پێنج مانگو بیست رۆژ ماینەوەو رۆژێك سەعات(۹) هەندێك سەیارەی (موقەپەت) هاتن لەبەر دەم قاعەکەی ئێمەدا وەستانو دەرگای قاعەکەیان کردەوەو پێمانیان ووت بەریز وەرن سواری ئەم سەیارانەبن.. ئێمە یەکەم جار کەخراینە ئەو قاعەیەوە گەلێ زۆر بووین بەڵام دوای ئەو پێنج مانگە زۆری لێ مردبوو.. یەکە یەکە خستمانیانە ناو ئەو سەیارانەوە یەکی دەرگایەکی لەناوەڕاستەوە هەبوو کەسوار بووین ئیتر هیچ شوێنێکی لێوە دیار نەبوو.. هەرسەیارەی دەوری (۳۰) کەسی ئەگرد.. دوای ئەوەی بارکراین سەیارەکان کەوتنە رێ. مەگەر خوابزانێ بۆ کوێمان ئەبەن.. سەدجۆر داڵغەمان لێداو ئەمان ووت رەنگە بمانخەنە ناو ئاوەوە.. یان بەشۆفڵ خۆڵ بکەن بەسەرماندا بەزیندوێتی.. دڵخۆشیمان بەوەئەدایەوە بەڵکو ئەمە خوایە بمانبەن بۆلای زەلامەکانمانو بەیەکتر بگەینەوە.. دەسا ئەگەر هەرلە سجنیش بین قەیناکە بەڵام پێکەوە بین.. ئەمووت ئەگەر وابێ ئێستا لەرێوە ئەم مناڵەم کەلەسجن لەدایك بوو ئەنێمە باوەشی باوکی باتێر تێر لەباوەشی بگرێت بێ نازی ئەم چەند مانگەی بکێشێ.. کورە هەزار خەیاڵمان ئەکردو سەیارەکانیش هەر رێگا ئەکەن بێ ئەوەی ئێمە بزانین بۆ کوێ ئەچێ.. بێ ئەوەی هیچ هەرەشەمان لێ بکەن کەنابێ کەس قسەبکات.. هەرکەسەو لەجێی خۆیەوە (حەپەسا بووین) کەس لەگەڵ کەس وورتەی نەئەهات تەنانەت مناڵیش چرکەی لەخۆی بڕی بوو.. تەنها یەك عەسکەری بەرگ مغاویری تفەنگ بەدەست لەناو دەرگای سەیارەکە بەپێوە بەرامبەرمان راوەستا بوو.. لەوە ئەچوو ئەویش نەزانێ بۆ کوێمان ئەبەن ئەویش وەك ئێمە بێدەنگ بوو، کێ ئەڵێ ئەویش لەوکاتەیا خەیاڵی لای ژنو مناڵو دایكو کەسووکاری نەبوو.. لەناکاو سەیارەکەمان وەستا.. ئەو وەستانە هەموومانی بەئاگا هێنایەوەو گشتمان لەیەکتر رادەماین. وەك ئەوەی ئیتر ئەوە دوادیدارمانەو باتائەتوانین تەماشای یەکتری بکەینو وێنەی یەکتر بەرینە زاکیرەمانەوە.. دیار بوو سەربازەکەی حەرەسەکەمان ئەویش وەستانەکەی بەلاوە نائاسای بوو چونکە دەرگاکەی کردەوەو تەماشایەکی

دەرەوەی کرد.. وەك ئەوەی کەهەرگیز روناکیمان نەبینی بێت هەموومان چاومان بڕیە درزی دەرگاکەو لەدەرەوەمان روانی.. کورسیەکەی من بەرامبەر دەرگاکە بوو لەوماوە کورتەی کەسەربازەکە دەرگاکەی کردەوە. زانیمان کەلەناو شارێکداین و خەڵك زۆر دێت و دەچن و زانیمان کەوڵاتی خۆمانە ژن و منداڵ و زەلام جل و بەرگی کوردیان لەبەر بوو.. کابرایەك بەتەنیشت دەرگای سەیارەکەدا تێپەڕی (پانکەیەکی ئەرزی) بەدەستەوە بوو. کەتەماشام کرد ناسیمەوە (حەمید حاجی مصطفی خەڵکی گووندی عەلی مستەفا بوو) ئەیانمان ناسی.. خۆم پێ نەگیراو وەك ئەوەی کەبمەوێ بانگی بکەم بڵێم ئەوەتا ئێمە ماوین هاوارم کرد (حەمید.. حەمید.. حەمید) لەخۆشیداو لەتاوا قورگم پڕبوو لەگریان موچورکە سەرتاپای لەشمی داگرت.. ئەو قیژەو هاوارەی من بێدەنگی ناو سەیارەکەی شکاندو لەقیژەی ئەوەش دەچوو بانگ بکەم وەرن رزگارمان کەن.. سەربازەکە زۆر بەتوندی دەرگای سەیارەکەی داخستەوەو بەورتەیەکی تورەییەوە ئێمەی بێدەنگ کردەوە.. بەڵام سەراپای گیانم کەوتبووە لەرزین.. خوایە ئێرە ئەبێ کوێ بێت.. خۆزگە (حەمید) گوێی لەبانگەکەی من بووایەو هەواڵی بدایەتە هەموو دۆست و ناسیاو (نەسرین مەجید کریم)م بینی لەناو سەیارەی سجندا بوو.. ئایا خەڵك باوەڕی بە(حەمیدیش) ئەکرد..!

ئیتر سەیارەکان کەوتنە رێ.. زیاتر لەسەعاتێك رێیان کردوو من هەر لەبیر کردنەوەدا بووم کەئەوو شارە کوێ بوو وا(حەمید)ی لێ بوو.. ئەی بۆ کوێمان ئەبەن.. ئەگەر بەرمان دەن ئەی بۆ لەوێ بەرمانیان نەدا.. خوا ئەزانێ چیمان لێ ئەکەن.. خۆزگە ئەگەر ئەشمان کووژن (حەمید) گوێی لەبانگ کردنەکەی من بووایەو بیزانیایە وائەمان بەن ئەمان کوژن..

دوای ئەو ماوەیە رۆشتن جارێکی تر سەیارەکە وەستایەوە.. ئەم جارە نەك هەرمن هەموومان خۆمان حازر کردبوو کەهەر دەرگاکە بکاتەوە چاو بگێڕین و بزانین کێی ترئەبینین.. یان هاوار بکەین تاخەڵك گوێی لەدەنگمانبێ و بزانن ئێمەش کوردین..

ئەمجارە سەربازەکە دەرگاکەی وەك جاری پێشوو نەکردەوە تاتەماشای دەرەوە بکات.. دەرگاکەی کردەوەو دابەزییە خوارەوەو دەرگاکەشی دانەخستەوەو بەئێمەشی ووت دابەزن..

کەدامانیان گرد لەشوێنێك بوو سەیری دەورو بەرمان کرد بەدەشتو دەرو گردەکان زانیمان ناوچەی خۆمانە خەڵك لەدوورەوە ئەهاتو ئەچوو.. سەیارەکان نەفەری جامانە لەسەری تیابوو ئیتر دڵنیا بووین کەناوکووردەو ئەمان ووت لێرە بمان کوژن پێمان خۆشتر بوو لەقاعەکانی (دوبز)

لەوێ زانیمان کە (٥) سەیارە بووینو ووتیان ئێرە (عەربەتە) ناومانیان نووسیو هەریەکی وەرەقەیەکیان بۆمان کرد لەجیاتی (ئیحسا)و خستمانیانە ناو سەیارەی کۆستەرەوە وتیان بەرتان ئەدەین.. بەڵام نەمان ئەزانی لەکوێ بەرمان ئەدەنو لەکوێ بەرمان بدەن باشە چونکە ئێمە کەگیراین ئیتر ئاگامان لەهیچ نەماو نازانین (قەومو قیلە) کەوتونەتە کوێوە.. هاوردمانیان لە(باینجان) بەرەڵامانیان کردو خەڵك باینجان بردمانیانە ماڵەکانی خۆیانو شەو لەوێ ماینەوە.. ئەوان بۆمانیان گێڕایەوە کەچی رووی داوە بەئێمە ئەڵێن (ئەنفال) تائەوکاتە نەمان بیستوە نەشمان ئەزانی ئەنفال یەعنی چیو بۆچی پێمان ئەڵێن ئەنفال..

بەیانی زوو دەنگو باس بڵاو بوەوە کەوەجبەیەك ئەنفالیان هێناوەتەوە بۆباینجان خەڵکی زۆر لەچەمچەماڵەوە هاتبوون بۆسۆراغ کردنو ئیتر ناسیاومان بینیو هاوردماینانەوە بۆ شۆڕش.. کەهاتینەوەو ئەوەی (حەمید حاجی مستەفا)م گێڕایەوە بەوەیا زانیم کەئەوەی دوێنێ (چەمچەماڵ) بووە. چونکە ئەو لەوێ بوو.. کەبەربووین دڵمان خۆش بوو بەڵکوئەمە خوایە کەسو کارو زەلامەکانیشمان بەربووبێتن.. کەچی هیچ ئەسەرێکیان نەبوو.. من برایەکم ناوی لوقمان مەجید کریم لەدایك بوو١٩٦٦ بوو ئەنفال کرابوو.. مێردەکەمو دوو شووبرام صالح عەزیزو علی عەزیزو کۆمەڵێ خزمی ترم تائێستا هیچ هەواڵێکیان نییە.. حاجی صالح یش خۆی نەخۆشی شەکرەی هەبوو.. گورچیلەیەکی نەبوو.. عەمەلیات کرابوو (٢٢) تەقەڵ وەلازگییەوە بوو.. ئەو زاڵمانە بردیانو ئەویش بەو نەخۆشییەوە ئەنفال کرا..

خۆم چەندینجار لاشەی مردووەکانم بینیوە بەدەم سەگەکانەوە.. هەقە کورد قەت ئەو ڕۆژانەی لەبیرنەچێتەوە..! کەئەم زاڵمە چیبەم کوردە داماوە کرد.!؟

# ئەمین جەلال ئەمین

لەدایك بووی ساڵی ١٩٣٤ گوندی هەیدەر بەگ- ئاغجەلەر

من هەرلەم گوندەی خۆمان لەدایك بووم و چەند پشتمان لێرە بڕاوەتەوەو ژیانمان بەمەڕداری و کشتوکاڵ کردنەوە بردۆتەسەرو سەرچاوەی بژێوی ژیانمان بووە..



گەنجێتی خۆم لەبیرە بەردەوام بەدەشت و دەرو شوان کارەییەوە خەریك بووم.. بەڵام ئەو ژیانەمان زۆر لاخۆش بوو لەگەڵی ڕاهاتبووین..

کاتێ ژنیشم هێنا، ماڵم جیابووەو هەرلەگوندەکەی خۆماندا و وەك باوباپیران و ئەوانەی پێش خۆمان منیش شانم دایەبەر جوتیاری و سەپانی و شوانکارەیی.. ئەوکاتە بوو تازە مەلیك ڕوخابوو..

ئیتر ئەوەندەی پێنەچوو (کۆمەڵە کۆمەڵە) پەیابوو، ئەیانووت ئەچین لەدەربەندی بازیان پێش لەجەیشی عێراق ئەگرین نازانم حکومەت بەتەمای

چیبوو بـەلاّم خـەڵك لەناوچـەكانی تریشـەوە هـاتبووە لای ئێمـەو بەدێهاتـەكاندا ئەگەڕانو داوایان ئەكرد هەرماڵی زەلامێك بنێرێتو بچنە دەربەندەكە.. ئەوكاتە بوو شەڕەكەی دەربەند هەڵگیرساو ئیتر شۆڕش دروست بوو.. لەكاتەوە دێیەكـەی ئێمە بەهۆی نزیكی لەچەمی ڕێزانەوە بەردەوام شـوێنی چەكداری شـۆڕش بـوو. لەتەنیشت دێی عەسكەرەومین..

كـاتێ ئەوساڵەی عارەب هاتو دایانـە سـەر ناوچەكـەیا دێیەكـەی ئێمـەیان هـەمووی تـالاّن كـردو دوای ئاگریـان نایـە ئاواییـەوەو هــەموو ماڵــەكانیان سوتان. ئەوكاتە من تازە ماڵ بوومو هەرچیمان بوو فەرهودیان كرد.. خوای كـورد نەیهێشـت ئەوەنـە حكـوم بكـەن زوو شـەقیان تـێ هـەڵدراو میللــەت نەجاتی بوو لەدەستیان..

لەدوای ئــەوەوە شەڕوشـۆڕ ناوچەكـەمانی زوو زوو دەگرتـەوەو هـەندێجار تـەیارەو هــەندێجار جـەیشو حــەرەس قـەومی ئەهاتنـە سـەرمان بـەلاّم (سامانلێخستبوو) لەگـەڵ ئـەو وەزعـەدا ئـەهاتنو كەوتینـەوە ئیشوكـاری خۆمانو بێكێشەو بێقڕە ژیانی خۆمان ئەگوزەراندو دێیەكەیش هەمووی هەر قەومو قیلەی یەكتربووینو زۆرمان بەسەریەكەوە هەبوو.. تا ئاوانـەوەی شۆڕش بێخـەم بووین بـەلاّم ئەو سـاڵەی شۆڕشـەكە نـەماو شـەڕ كەوتـەوە ناوچەكە جارێكیتر لێمان قەومایەوە.. كەشۆڕشەكەیش لەناو چوو، جاش زۆربـوو بـوو حكومـەت ئـەیكردە سـەرمان تالاّنمانیـان ئـەكردو زۆر ئـەمانیان چەوساندەوە..

بەلاّم باش بـوو ئەوەنــەی نـەخایاند كەپێشـمەرگە پـەیا بـووەوە ئیـتر ئێمـە ترسمان نەما، ئومێدمان لادروست بووەوە.. دوایی كەشەڕی عێراقو ئێران هەڵگیرسا، عێراق سەرقاڵ بوو بەشەڕەوە نەئەپەرژایە سەر ئێمە.. ئەو ماوەیە كـورد حەسایەوە.. خـەڵك لەشـارەكان ئەترسا باریـان ئەكرد بـۆ دێیـەكانو گەنجـەكان لەترسـی ئـەوەی كەئـەیانیان گـردو ئـەیانیان نـارد بۆشـەڕەكان

ئەوانیش بۆخۆیان ئەهاتنە ئەم ناوچانەی کەدور بوون لەحکومەتەوە.. ئێمە هەرچەندێ لەئاغجەلەرەوە نزیك بووین بەلاّم چەمی ڕێزان کەمەڵبەندی شۆڕشەکەبوو زۆر لێمانەوە نزیك بوو بەهۆی ئەوەوە حکومەت نەیئەوێرا بەئاسانی بێتە سەرمان.. زۆرجار جاش ئەهاتو جێش ئەهاتو کۆپتەریش ئەهات بەلاّم پێشمەرگە بەرەنگاریان ئەبونەوەو حکومەت ئەشکا.. لەبەر ئەوە ئێمە ترسی حکومەتمان نەمابوو..

دێیەکەیشمان تەواو قەرەباڵەغ بوو بوو، بەتایبەت ئەو ماوەیەی ڕێکەوتن هەبوو لەنێوان شۆڕش‌و حکومەتدا دوای ئەوەی ئەو ڕێکەوتنە تێك چوو.. حکومەت وەك سەگی‌هار کەوتە گیانی ئەو خەڵکە مەدەنی‌یە.. پەلاماری دێهاتەکانیان ئەدا.. تەیارە ئەهات ڕەمی لەژن‌و منالّیش ئەکرد.. جارێك هاتن حکومەت قواتێکی زۆری هێنا بوو لەساڵی ١٩٨٥ ئەها گۆپتەپەی روخان.. ئەوساڵە دێیەکەی ئێمەیشیان سوتان‌و خەڵکەکەیان سەرگەردان کرد..

ماوەیەك بەنیاز نەبووین خانوو ماڵ دروست بکەینەوە، چونکە وەزعەکە تادەهات بەرەو خراپتر دەچوو.. ئەمجارە حکومەت جیاوازی لەنێوان پێشمەرگەو ژن‌و منالّیشدا ناکات.. بەلاّم خۆناشتوانی هەربەو دەشت‌و دەرەوە بیت.. ناچار هەریەکی یەك دوو کولبەیەکمان دروست کردەوە، بەلاّم ڕۆژ بەرۆ ژیانمان بەرەو خراپی دەڕۆیی‌و بارمان گرانتر دەبوو حکومەت ئازوقەکەمانی بڕی‌و لەشارەکانەوە ڕێگای نادا خواردن بێت بۆدێهاتەکان.. خۆیشمان نەمانئەتوانی زۆر هاتوچۆی شارەکان بکەین.. لەڕێگەو بانەکان ئەتیان گرد، یان کۆپتەر بهاتایە لەو سەر ڕێگاو بانانە توشت بوایا ڕەمی ئەکرد..

ماوەیەکی پێچوو ترس‌و دڵەراوکێ هەموو ناوچەکەی گرتەوە.. کەس بەتەمای ژیانی خۆی نەبوو.. ئەیانووت عەلی حسن مەجید هاتۆتە کەرکوك‌و

قواتێکی زۆریشی هێناوەو پەلاماری هەموو دێهاتەکان ئەدات.. چی پێشمەرگەی ناوچەکە بوو هەمووی کەوتنەڕێ بەرەو سەرکردایەتی.. ئێمە زۆر ئەترساین و یەخەیانمان ئەگرد بۆبەجێمان دەهێڵن؟.. ئەی کێ بەرگریمان لێبکات؟.. ئەوان ئەیانووت کەهەڕەشە بۆئەم ناوچانە نی یەو دڵمانیان ئەدایەوە کەهیچ مەترسی یەك بۆسەر دێیەکانی ئەم ناوچەیە نی یەو حکومەت پەلاماری سەرکردایەتی ئەدات.. ئەوان ڕۆیشتن و هەواڵمان ئەزانی کە شەڕەکان دەستی پێکردوەو ڕۆژانە دەیان وەجبە کۆپتەرمان ئەبینی ئەچوون و ئەگەڕانەوەو بەشەویش کەدونیا کپ دەبوو گوێمان لەزرمەی تۆپ دەبوو..
هەندێجار کەپێشمەرگەیەکیش دەگەڕایەوە هەواڵی دەهێنایەوە کەحکومەت بەهەموو جۆرە چەکێکەوە پەلاماری ناوچەکەی داوەو دەستی لەژن و منالْ نەپاراستوەو ژیانی گوندنشینەکان لەمەترسی دایە.. ئیتر ئێمە زیاتر ئەترساین.. چونکە گوندەکانی ئەوسەرە هەمووی ناوچەی شاخاوی سەخت بوون کەژیانی ئەوان کەوتبێتە مەترسی یەوە.. ئەوە دێهاتەکانی ئێمە هەربەئاسانی داگیر ئەکرێت.. ماوەیەکی کەمی پێچوو رادیۆی عێراق بلاْوی کردەوە کە(بارەگاکانی سەرکردایەتی و هەموو ناوچەکە گیراوەو هێزەکانیان لەخۆئامادەکردندان بۆقۆناغێکی تازەتر بۆتێك شکاندنی شۆڕش)..
پێشمەرگەکانی ئەم ناوچەیش کەچوو بوون بۆشەڕی بەرگری گەڕانەوە بەتێك شکاوی و شپرزەیی.. ئیتر زانیمان ئەوە کۆتایی هەموو شتێکە.. باسیان ئەکرد کەحکومەت چەکی کیمیایی بەکارهێناوەو خەڵکی زۆری کوشتوەو ئەیانووت (هەڵەبجە) هەمووی وێران کراوە.. هەرچی خەڵکی شارەکەیە بەکیمیایی مردوون.. تائەو کاتە ئەوەی ئێمە بیستبوومان هەر ئەوە بووە بەتەیارەو تۆپ لەخەڵك دراوە.. کەچی ئێستا وابەکیمیایی لێمان ئەدەن، خوایەگیان رووڵەکوێ بکەین؟.. هیچ دەسەڵاتێکیشمان نەبوو تەنها

ئومێدمان قاپی خوابوو.. ئیتر زانیمان کەپێشمەرگەیش ناتوانێ بەرگەی حکومەت بگرێو ناتوانن خۆیان بپارێزن ئیتر بەچی دیفاع لەئێمەیش بکەن..!!

هەندێ لەو پێشمەرگەو فەرماندانەی ناوچەکە زووتر ماڵەکانیان لەگوندەکانی ناوچەکەی ئێمە بوو، چونکە شوێنێکی دوورە دەست بوونو ئەمین بوون.. ئەوان کەوتنە ماڵ بارکردنی خۆیان، ئەوە ئەوەندەیتر خەڵکەکەی تۆقان دیارە دەستیان لەهەموو شت بەرداوەو بەتەمای هیچ نین بۆیە خۆیان ماڵەکانیان دەگوازنەوە.. ئاخر ئەوان شەڕەکانی ئەو ژوورەو زەبرو زەنگو هێزەکانی حکومەتیان بینیبوو، نەهەقیان نەبوو گەر ترسابێتین.. ئەوان بینیبویان کەئەو چەکی کیمیاییە چۆن نەك هەرئینسان چۆن ئاژەڵو تەیروتوری ئاسمانیشی خنکاند بوو.. لەوە بوو بوونەوە کەبڕوایان وابێ بەچەکی دەستی پێشمەرگە بەرگەی ئەو هێزە زەبەلاحەو ئەو جۆرە چەکە کوشوندەیە بگرن..

هەروا چەند رۆژێکی پێچوو هێشتا لەترسو نائومێدی داینو چاوەڕێین بزانین دونیا بەرەو کوێ ئەچێتو وەزعەکە ئەگاتە چی.. خەبەرهات وتیان کیمیایی داوە لەقەراخو ئەو دێهاتانەیشی هەموو رامالیوەو خەڵکەکەی هەمووی گرتووەو بردویانێتی..

دەبوو بیرێك لەخۆمان بکەینەوەو مشورێکی ژیانی ئەو هەموو ژنو منالانە بخۆین.. ناکرا هەروا چاوەڕێی قەدەر بین.. بەلام توشی سەرگەردانی بوو بووینو کەس ئەقڵی بەهیچدا ناشکا.. بەهەر کەسێکت ئەوت ئەو لەتۆ خراپتر بوو.. هەمووی هەر ئەیووت رۆژە رەشەو کوڕ ئەو کوڕەیە خۆی رزگار بکات..

ئەمجارە وەزعەکە خراپ بوو ئێمە بەبیرەوەریمان سێجار دێهاتەکانمان سوتابوونو تالان کرابوون بەلام ئەمجارە دەنگو باسەکان وایە خۆیشمان

فەرهود ئەکەن‌و هەربەوە وازناهێنن ماڵمان کاول بکەن‌و هیچ دەرگایەك شك نەبەی..!!

هێشتا ئێمە خۆمان یەك لای نەکردبۆوە، پێشمەرگەی گەرمیان گەیشتنە لای ئێمەو ژن‌و منداڵ‌و سەربازی فیرارو ئەو خەڵکە پەرتە وازەی کەخۆیان رزگار کردبوو بەشەو دزەیان کردبوو لەبازنەی جەیشەکە دەرچوو بوون‌و خۆیان گەیاندە دێیەکانی ئێمەو هەرماڵەی چەندین کەس کەوتە سەرمان، ئەوانیش لێقەوماو بوون‌و پەنایان بۆدێیەکانی ئێمە هێنابوو.. سەرباری ئەو وەزعەی خۆمان ئەمانیش هاتن‌و بوونە باربەسەر مانەوە.. چیان ئەگێرایەوە!؟ چیان دی‌بوو؟! باس‌و بەسەر هاتی دێیەکانی گەرمیانیان کرد چۆن روخێنراون‌و خەڵك تووشی چی بەلآیەك بووە!! ئەیانووت کەس نەماوە هەمووی گیراو جەیشەکە لەکێش دانی‌یەو وەك لافاو وایە!!

ئیتر کەئەوان هاتن ئاوایمان لەترسا چۆڵ کردوو چووینە (چەمی کۆرمۆر)و(دەراوی عەسکەر) شوێنێ باش بوون بۆخۆشاردنەوەو زووتر کونەتەیارەو شوێنی خۆشاردنەوەمان دروست کردبوو.. ئیتر لەوێ کۆپتەر نەیئەدۆزیەوەو کۆپتەر ئەهاتە سەر دێهاتەکان‌و لەئاوای ئەدا نەو چەم‌و کەلۆەزانە جێی شك نەبوو.. بەلآم چی لەدێیەك ئەکەیت هەمووی هەر رەوبکات‌و خۆی بکاتە چەمێکدا..؟

چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە هێشتا هەواڵی ئەوەنەهاتبوو کەئەمجارە پەلاماری ناوچەکەی ئێمە ئەدات‌و چواردەوری ناوچەکە نەگیرابوو.. بەلآم ئەمانزانی دوای گەرمیان نۆرەی ئێمەیە.. کۆپتەریش زیادی کردبوو ئەتووت واشەن رۆژی چەندجار بەسەر ئاسمانی ناوچەکەدا ئەهاتن‌و ئەچوون.. بیرمان لەوە کردەوە بەرلەوەی جەیش بێت‌و لەدێیەکاندا بمان گرن. خۆمان بچین‌و خۆمان بکەینە شارەکاندا یان خۆمان بدەینە دەستەوە.. گەرچی ئەمانزانی ئەویش هەر مەسیرمان تیاچوونە.. چونکە زووتر خەڵك

تاک‌و تەرا لەڕێی شاردا ئەگیرا بێ سەرو شوێن ئەکرا.. ئەی ئێستا ئەو هەموو خەڵکە بەیەکەوە رووبکەینە شارەکان هەرئەمان گرن‌و تیا ئەچین!. حاڵەتەکە بۆئێمە زۆر قورس بوو.. خوایە گیان چاوەڕێ بکەین‌و تادێن‌و لێرە ئەمانگرن، یان خۆمان بەرەو پیری مەرگ بچین؟! نەمان ئەزانی کامیان هەڵبژێرین، هەرچۆنێك بوایا چوونەکەمان رووەو شارەکان، تروسکایەکی تیا بوو بەڵام مانەوەمان لەم هەردەو چەم‌و دۆڵانەو لەژێر رەحمی ئەو هەموو تۆپ باران‌و جەیش‌و کۆپتەرانەدا هەرتیا چوون بوو، بۆیە ئەو رێگایەمان هەڵبژارد کەشەو بکەوینە رێ‌و هەرچۆنێك بێت خۆمان بکەینە شارەکانداو لەماڵ خزم‌و ناسیاودا خۆمان بشارینەوە خوا گەورەیە..

بەڵام پێشمەرگە وتیان ئێمە مقاوەمەت ئەکەین‌و تاپێمان بکرێت بەرگریتان لێ ئەکەین‌و ناهێڵین جەیش بێتە ناوچەکە..

ئێمە دەسەڵاتمان نەبوو ناچار ماینەوە بەڵام بەرگری چی‌ئەکرێت ئەو واهەموو ناوچەکانی تری کاول کردو بەرگریش نەکرا.. لای‌ئێمە بەچی بەرگری ئەکرێ‌و چی‌بەرگەی ئەو جەیشە زۆرە ئەگرێت.. چی‌بەرگەی کیمیایی ئەگرێت.. ئەو ئەڵێن (ئەچێتە ناو باوە)و لەگەڵ هەناسەداندا ئەچێتە ناو لەشتەوەو ئەتکوژێ هەرچەندە پێشمەرگە هەندێ رێنمایمانیان کردبوو کەگەر کیمیایی تەقی لەنزیکی ئاوبن باشە یان پەرۆی تەڕ بەخۆتاندا بدەن بەڵام ئەم عالەمە لەکوێ هەمووی ئەگاتە نزیك ئاو- یان لەوکاتەدا پەرۆی تەڕ لەکوێ حازر ئەبێ؟..

ماینەوەو رۆژ لەدوای رۆژ ترسەکەمان زیادی ئەکردو دەنگ‌و باسی خراپتر ئەبوو.. تاوتیان حکومەت لەچەمچەماڵ‌و قەرەنجیرو تەق تەق‌و کۆیەو دووکان‌و ئاغجەلەرو لەهەموو لایەکەوە جەیشی خڕکردوەو دەوری ناوچەکەمانی گرتووەو رێگای دەرباز بوونی بڕیووەو لەئاسمانیشەوە بەکۆپتەرو لەخواریش جەیش‌و جاش دێنە سەرمان.. بەڵام لەسەرە

مەرگیشدا ئینسان ئومێد بڕنابێ.. کەکەوتە ئاویشەوە (دەست بۆ کەفی سەر ئاوەکە ئەبات) ئێمەیش هەرچەندە تەواو دڵنیا بووین ئەرزو ئاسمانیشمان لێ گیراوە، بەلاَم هەر بەئومێدی ئەوەبووین خۆمان رزگار بکەین..

ئێوارە بوو هێشتا سوپا دەستی بەپەلامارەکانی نەکردبوو.. کۆمەڵێ تەیارە هاتنە ئاسمانی ناوچەکە ئێمە ئەوکاتە لەنێوان گوندی (گۆپتەپەو بۆڵقامیش) لە(قەلاَنیکاین) بووین، تەیارەکان دووجار سوڕانەوەو دوانیان چوونە سەر ئاسمانی عەسکەرو ئەوەکانیان لەئاسمانی گۆپتەپەو سەر ئاوەکەی (زێ) ئەسوڕانەوە.. ئاگامان لێبوو دەستیان کرد بەرەمی کردن.. قریشکەو لورەی قومبەلەکان زۆر جیاواز بوون لەرەمی کردنەکانی جاران.. لەشەستەکانەوە ئێمە بەردەوام رەمی تەیارەو کۆپتەرمان ئەبینی، بەلاَم هیچ جارێکیان دەنگی وەك ئەمجارە نەبوو.. تەقینەوەکەیشی دەنگی گەورەتر بوو، دوو کەڵەکەیشی جیاواز بوو هەندێکی زەردباو هەندێکی شین.. قریشکەو هاواری خەڵکی گۆپتەپە گەیشتە لای ئێمە.. زۆر کەسیش لەوچەمانەبوو بووە هاتوو هاواریان.. دەنگی خەڵکەکە بەئاسانی ئەگەیشتە ئێمە.. گوێمان لێبوو کەئەیانووت (کیمیایی تەقان).. تەیارەکانی بان عەسکەریش رەمیان کرد.. ئێمە بەپەلە بەتانیمان تەڕ کردو دامان بەبان سەروچاوماندا.. بایەکە بەرەو ئێمە ئەهاتو کەمێك بۆنی پەیدا بوو گیانمان بەو بەتانی‌یە تەڕانە بوو.. لەجیاتی دەستو ئەژنۆمان هەستم ئەکرد دڵم لەترسا ئەلەرزی.. ژنو منداڵ زیرەی تێکەوتو قیژەو هاواریان بوو، ئەترسان.. هەقیان بوو بترسن، رۆژە رەش بوو، هەقیان بوو بگرین ئەو قومبەلە گەورانە بۆگیانی ژنو منداڵ بوو..

لەدێیەکانی ترو لەوچەم هەردانەوە هەروا خەڵك بوو رای ئەکردو بەلاَم سەرمان لێشێوا بوو نەمان ئەزانی روولەکوێ بکەین کۆمەڵێ لەچەمەوە ئەگەڕایەوە.. وەجبەیەك بەرەو چەم ئەڕۆی.. سەرگەردان بووین.. لەنزیك

عەسکەر کۆمەڵێ خەڵکی پەرتەوازەی دێیەکان یەکمان گرتو چاومان پێوە بوو لەهەموو لایەکەوە لایت سەیارە بەرەو ناوچەکەی ئێمە دێت.. زانیمان ئەوە جەیشەو حەرەکەتیان دەستی پێکرد.. ئێمە زۆربەی زۆری خەڵکی ئاوایەکەی خۆمانو هەندێ خەڵکی (مایلەو سۆتکە)و خەڵکی پەرەوازەی ئەو چەمانەی گۆپتەپەیش گەیشتنە لامان.. هەموومان پێکەوە رێگامان دایەبەر بەرەو (چەمی رەزان)و وتمان لەوێوە ئەپەڕینەوەو خۆمان ئەکەین بە(گۆپاڵە)دا.. گەڵێ زۆر بووین ژنو منداڵو پیرو پەککەوتە هەریەکی کۆڵێ نانو جلو بەرگ بەکۆڵمانەوەو بەرەو پیری مەرگ ئەچین.. منداڵ نەیئەتوانی رێگا بکات.. هاتوهاواری ژنو منداڵ قاژەی ئەخستە جەرگتەوە.. منداڵ چوار پێنج ساڵە بەوشەوە بەو شاخو هەڵەتانەدا ئەبوو بەپێ رێگا ببڕێت.. بەدەستی دایکو باوکەوە پەلکێش ئەکرا.. هەر رێگاکەی ئەو شەوەو دەردەسەری ئەو هەموو ژنو منداڵە لەوشەوەدا گاوری موسوڵمان ئەکرد!! ئەوەندەمان پەت پەتی بەسەر هاتو ئەوەندە منداڵ خزاو سەرو چاوی بووە زامو ئەوەندە لەکەنو کۆسپ بەر بووینەوەو چارەمان نەبوو، دەبوو رێگا بکەی تابەر لەبەیان خۆمان بگەیننە شوێنێ.. چونکە ئەمانزانی بەیانی لەگەڵ بەیاندا کۆپتەر چیئەکاتو جەیشوجاش ئەکەوتە ئەو هەردەو هەڵەتانەو نایەڵن تەیر دەربازی بێتو هەموومان ئەگرنو دورنییە لەشیوێکدا کیمیایی نەکەن بان بەهەمووماندا.. بەدرێژایی ئەو شەوە کەئێمە رێگامان ئەبڕیی، لەبان شاخەکانەوە چاومان لێبوو لەهەموو قوڵەکانەوە لایتی سەیارە بەدوای یەکدا رێزیان بەستبوو.. هەر بەلایتی ئەو سەیارانە لەگەورەیو زۆری جەیشەکە حاڵی ئەبوویتو ئەتزانی کەکەس دەربازی نابێت لەدەستیان..

ئەم کوردە بەردەوام ژیانی راکە راکو پەتپەتی بووە بەڵام قەت کارەساتی وەك ئەوساڵەی بەسەرنەهاتووە بەخوا ئەو شەوە سەگو پشیلەکانی ئاوایش

کەوتبوونە شوێنمان.. ئەوانیش لەسیمای ئێمەدا هەستیان بەورۆژە رەشە کردبوو، دورو نزیك هەربەدوامانەوە بوونو ئەیان لوران..
دەمەو بەیان لەنێوان (سەروچاوەو گۆپاڵە)دا کەوتینە ناو جەیشەوە.. چوار دەورمانیان گردو هەموومانیان خڕکردەوەو هەرچی کەلوپەلو کوڵەکانمان هەبوو هەموویان لێمان سەند.. ئامرێکی لێبوو خۆی یەکەیەکە گیانی هەموو زەلامەکان گەڕاو دەستی ئەکرد بەباخەڵتدا بۆپارەو ئاڵتون ئەگەڕان.. عەسکەریەکانیش یەکەیەکە ئەوجلو جۆرەیان پشکنیو هەرچی شتێ باش بوایا جیایان ئەکردەوە بۆخۆیانو بەخوا سەعاتی دەستیشیان دائەکەند.. هیچیان پێمان نەهێشت.. خەڵکێکی زۆر بووین خێزان واهەبوو سەرپاك گیرابوون.. ژنێکی دێیەکەی خۆمان خۆیو (دە) منالی پێبوو گەورەکەیان حەڤدە ساڵان بوو تامناڵە بەر مەمکانەکەیان هەموویان هەرگیران..
هەرلە گۆپاڵە رامانیان وەستان تاکۆمەڵێ زیلی عەسکەریان هێنا، هەموومانیان بارکردو هەر سەیارەی دووعەسکەری بەتفەنگەوە کەوتنە تەکمانو لەپێش قافڵەکەوە هەندێ حیمایەو لەدواوە هەندێ حیمایە بەرەو سلێمانی بەرێمانیان کرد.. لەتاسلوجە لایاندا بەرەو پیرەمەگرون.. ئیتر هەر بەجارێ تۆقینو وتمان بەخوا رەنگە بمانبەن بمانکەنە ناو (ئاوەکەی دووکانەوە).. چونکە زووتر خەڵك قسەی ئەکرد، ئەیانووت قەراخو گەرمیانیان بردووەو ئەڵێن ئەیاندەنە دەم (شەتەوە).. تەواو ئەترسامو کوڵەی جەرگم ئەهات بۆ ئەو هەموو مناڵانە ئاخر گوناهیان چیە ئێستا ئەیانخەنە ناو ئەو (بەحرەوە) هەر ئەگریام لەتاواو ئەوخەڵکەیش هەمووی هەر ئەگریا.. لەگریان زیاتر هیچ شتێ نەبوو ترسەکەمانی پێدەربڕین..
سەیارەکان رۆیشتنو لە(سوسێ) لایاندا، قەلایەکی عەسکەریی گەورەی لێبوو، خستمانیانە ناو ئەو قەلایەوە، تائێوارە لەوێ هێشتمانیانەوەو لەبەری دووکانەوە هەرخەڵکیان هاوردو تێکەڵ ئێمەیان کرد.. تامەغەریب

ئەو قەلآیەیان هەمووی پڕکرد.. نازانم وائێمە خوا سەری لێمان تێکداو خۆمان هاتینە ناو جەیشەکەوە، ئەم خەڵکەی تریان بۆوا بەئاسانی ئەگردو ئەیانیان هاورد.. یان ئەوانیش وەك ئێمە سەرگەردان بوو بوون..

تائێوارە هیچیان نەدا پێمان‌و لەتینوا خەریك بوو بخنکێین، بەو تینوێتی‌و برسێتی‌یە دوای مەغریب سەیارەیان هێناو کەوتنە بارکردنی ئەو خەڵکە بەقافڵەیەکی زۆر گەورە هەموومانیان گواستەوە بەرەو سلێمانی.. دیاربوو کەبردمانیان بۆ(سوسێ)و شەو خستمانیانە رێ بەرەو سلێمانی بۆئەوە بوو بەرۆژ نەمانبەنە ناو سلێمانی‌یەوەو خەڵك ئەو حەشاماتە نەبینێ کەئەو هەموو ژن‌و منالە کۆرپەیە گیراوە.. هەر شەو گەیاندمانیانە سلێمانی بردمانیانە دایەرەی ئەمن یەکەیەکەو بەشێوەی خێزان ناومانیان نوسی‌و بارمانیان کردەوەو دەمەو بەیان بوو بەرەو کەرکوك بەرێمانیان خست.. نیشەکەیان گەلێ پەلەبوو تابەبەرچاوی خەڵکەوە نەمانبەن شەو گواستانیانەوەو هێشتا بەیانی نەدابوو دونیا هەر تاریك بوو کەخستمانیانە رێ.. ئیتر نازانم چەند سەعات بەرێوە بووین چێشتەنگاو گەیشتینە (تۆبزاوا).

دونیایەك خەڵك لەتۆبزاوا بوون بڕوابکەن کەتەماشای ئەو حەشاماتەی تۆبزاوات ئەکرد، ئەتووت یەك کوردێکی‌تر لەرووی دونیایا نەماوەو هەمووی والێرەیە.. ناو ئەو مەعەسکەرە هەمووی هەر رەشی ئەکردەوە.. غەڵبە غەڵب‌و هات‌وهاواری ئەو خەڵکە بەسەر گوڕەو نەڕەی ئەو هەموو سەیارەیەدا زاڵ بوو بوو.. بڵێم قیژەو هاواری منالْ ئەگەیشتە (کەشکەلانی فەلەك)..

تائەوێ ئێمە خەڵکی ئاوای پێکەوە بووین.. من خۆم‌و خێزانەکەم‌و بوکەکەم‌و سێ‌کوڕم‌و چوار کوڕەزا پێکەوە بووین‌و قەوم‌و قیلەی ئاوایش هەموومان لەزیلەکان دامانیان گرد.. قەرەباڵغی تۆبزاوا لەکێشدا نەبوو

دەرزیت هەڵدایا بەرزەوی نەدەکەت، وەجبە وەجبە ئەو خەڵکەی لەسەیارەدایان ئەگرد ریز ئەکران بۆناونوسین.. لەکۆمەڵێ شوێن دانیشتبوون ناویان ئەنوسی.. هەریەکی کوردێکیش تەرجومەی ناونوسەکە بوو.. ئەگەر هەویەت پێبوایا ئەوە لەسەر هەوێکەتو گەر ئەوەی پێی نەبوایا بەمەزەندەی خۆیان تەمەنیان بۆدا ئەنا.. لەو ناونوس کردنەدا بڕیاری جیاکردنەوەیان ئەدا.. وەجبەی ژنومناڵ بەجیاو زەلامی گەنج بەجیاو پیروپەککەوتە بەجیاو کچە عازەبو جاهێڵەکانیش بەجیا.. ئەو خەڵکە ئەکران بەچوار بەشەوەو هەربەشەی بۆئەو شوێنەی بۆی تەرخان کرابوو ئەیانخستە ڕێ.. هەربەشەی چەند قاوشێکیان بۆتەرخان کردبوو..

گەرچی هەمووومان هەر سجن بووین بەڵام تائەوێ خاوەنی ناموسەکەی خۆمان بووین.. بەڵام لەتۆبزاواو لەوجیاکردنەوەیەوە ئیتر ناموسەکەمان لەدەست چوو.. کەبەزۆر کچەکانیان جیاکردەوە.. واتئەزانی دەماری دڵت رائەکێشن، کاتێ کچێك خۆی ئەدایە مل دەستو پێی دایكوباوكداو نەیئەویست بەتەنها بڕواتو عەسکەرەکان ئەیانکردە پەلیداو بەپاڵ ئەیان برد.. هاتوهاوارو هەواڵی کەس سودی نەبوو.. زۆر کەس خۆی ئەدایە سەردەستو پێی عەسکەرەکان، تاکچەکانمان نەبەن بەڵام ئەوان رەحمی خوا لەدڵیاندا نەبوو بەقۆناغە تفەنگ ئەکەوتنە سەرو گوێلاکت.. بەقامچیو تێهەڵدان وەڵامیان ئەدایەوە..

لەو ناونوسینو جیاکردنەوەیەدا من کوڕەکانمیان لەگەڵ گەنجەکاندا جیاکردەوەو بوکەکەمو مناڵە وردەکانیش بەجیاو خۆیشم لەگەڵ پیرەژنو پیرەمێردەکانی تردا بەجیا خستمانیانە ناو قاوشێکەوە هەمووی وەك ئێمە ئەختیار بوو.. هەمووی وەك ئێمە جەرگی سوتابوو.. هەمووی وەك ئێمە شەرەفەکەیان کەوتبووە بەردەم ئەو چەقەڵو گورگانە..

هەر بەبەرچاوی خۆمانەوە گەنجەکانیان قۆڵ بەست کردو بەپشتوێن‌و جامانەکانی خۆیان دەستیانیان لەپشتەوە دەبەستەوەو چاویانیان دەبەستەوەو ئەیانخستنە ناو سەیارەی (موقەپەتەوە)و بردیانیان.. ئیتر هەرئەو بردنەبوو ئاوەڵ ئاو رۆیشتن‌و تائێستا کەس هەواڵێکیان نازانێ..

کچە جوان‌و جاهێڵەکانیش کەس نەیزانی بۆکوێیان بردو چیان بەسەردا هاورد، تەنها ئەوەندە ئەزانین تاتۆبزاوا هەمووومان پێکەوە بووین‌و لەوێ جیاکراینەوە..

ژن‌و منالەکانیان بارکرد بۆ(دوبز) بەڵام پێش ئەوەی کەبیان بەن شەوێك منالەکانیشیان لەدایکیان سەند ئەتووت کارو بەرخن لەبەر مەڕ هەڵی ئەگرن.. ئەو هەموو مناڵە جوانانەیان بەزۆر لەباوەشی دایکیان دابڕی.. بووە (رۆژە حەشرێك) مەگەر خوابۆ خۆی بزانێت.. ژن هەر هاروشێت بوون لەتاوا.. قیژەیان گەیشتە لای خوا.. ئەوەندە لالأنەوە، ئەوەندە هاواریان کرد. خوا گەیشتە فریایان‌و دوای چەند سەعاتێك منالەکانیان دابوەوە پێیان.. ئێمە بێ دەسەڵات بووین‌و ئەوانیش زاڵم بوون.. ئەگەر دەسەڵاتمان هەبوایا ئەیانتوانی ئەو لادمان لێ دابڕن‌و بەبەرچاوی خۆمانەوە ناموسەکەمان بەرن..

لەقاعەکەدا هێشتمانیانەوەو سەرمان نابوو بەپەنجەرەکانەوە تەماشای خەڵکەکەمان ئەکرد، لەسەعاتێکدا دەیان سەیارەی مونشەئەو زیل‌و کۆستەر خۆیان ئەکرد بەژورداو ژن‌و منالیان دائەگردو وەك ئێمە هەر لەحەوشەی مەعەسکەرەکەدا جیائەکرانەوە ئەخرانە قاعەی جیاجیاوە.. لەپەنجەرەکەوە هەرچاومان پێوە بوو چۆن لەهەموو وەجبەکاندا هەرلەوێوە گەنجەکانیان جیائەکردەوەو جلەکانیان لەبەریان دائەکەندو تەنها کراس‌و شەرواڵێکیان لەبەریان دەهێشتەوەو دەست‌و چاویانیان دەبەستەوەو ئەیانیان خستە ناو سەیارەوەو ئەیانیان برد، ئیتر مەگەر تەنها خواو سەدام بزانن چیان

بەسەریاندا هێنا.. چونکە تائێستا کەس هیچ هەواڵێکیان نازانی و هیچ ئاسەوارێکیان دەرنەکەوت..

بەخوا بەقەدەر بەرزی خانوویەک زیاتر جل وبەرگی گەنجەکانیان هەڵدابووەوە.. هەروەجبەیەکیش ئەهات و چاوی بەو جلوبەرگانە ئەکەوت ئیتر بەیەکجاری نائومێد ئەبوو، چونکە ئەو جلانە نیشانەی مەرگ بوون..

دوای شەورۆژێک بەیانی خۆر کەوتن هاتن دەرکی قاعەکەیان لێمان کردەوەو بانگمانیان کردە دەرەوە.. ئێمە ئەمانزانی کەئەمانگوازنەوە چونکە زوو زوو وەجبەکانیان ئەگواستەوەو سجن تازەیان ئەهێنا.. بەڵام نەمانئەزانی بۆکوێمان ئەبەن.. کۆمەڵێ سەیارەی (مونشەئەی) درێژیان هێنابوو تەپانمانیانە ناو ئەو سەیارانەوەو بەریزو بەدوای یەکدا کەوتنە رێ.. لەبەیانی خۆرکەوتنەوە بەرێوە بووین دوای نوێژی عیشا گەیاندمانیانە شوێنێك لەبیابانێکدا جگە لەئاسمانێکی ناشرین هیچی تردیار نەبوو.. لەهەندێ گڵۆپ زیاتر کەوەک بڵێی لەسەر گردێك ئەدرەوشانەوە.. ئیتر هەمووی هەر تاریک و لێڵ بوو..

لەرێگەیش زۆر کەوتینە هیلاکەتەوە لەتینوا، چونکە بەیانی کەبارمانیان کرد نەئاوێکیان داپێمان و نەرێگایاندا بچینە سەرئاو.. زۆر پەرێشان بووین لەناو سەیارەکان.. بەقەدەر هەموو رێگاکانی تر سەغڵەتیمان بینی.. هەمووی هەر پیرو پەککەوتەو هیلاك بوون و هێزمان لەبەربڕابوو.. خەم و خەفەتی دابڕانی جەرگەکانیشمان تەواو پەرێشانی کردبووین..

ئەو گڵۆپانە قەڵایەکی گەورە بوو، دەرگایەکی گەورەی هەبوو ئەو مونشەئانە بەئاسانی ئەچوونە ژورەوەو حەوشەی قەڵاکەیش گەلێ گەورە بوو جێگای پەنجا مونشەئە زیاتری تیائەبووەوە.. قەڵاکە خڕبوو دووقات بوو لەسەریەك و ژێرەکەیشی دوای زانیمان کەژێر زەوی یە..

هەر ئەو شەوە لەحەوشەی قەڵاکە دامانیان گرد.. هەمووی قاعەی گەورە گەورە بوو پڕبوون لەخەڵك.. ئێمەیشیان بەناو نوسین و بەژمارە کردە ئەو قاعانەوە.. خەریکە کوێر ئەبین بۆقومێ ئاو.. لەتینوا ئەوەندە سەغڵەت بوو بووین هیچی ترمان لەبیرنەما بوو، تەنها ئاو نەبێ.. لەتینوا بڕوا بکەن گیانم ئەلەرزی..

لەوێیش تابەیانی ئاویان نەداپێمان لەوە ئەچوو ویستبێتیان ئێمە لەتینوا بکوژن و بۆیە بەگوللە نەمانیان کوشت و تابەعەزابەوە بمرین.. نازانم ئەو شەوەمان چۆن لێڕۆیی و ئەو شەوە بۆئەوەندە درێژ بوو بەشی ئەوەی ئەکرد هەموو ژیانی رابردووی تەمەنت بهێنێتەوە پێش چاوی خۆت..

کەرۆژ بووەوە ئەوسا دووتەنکەر ئاو هاتنە ناو حەوشەی قەڵاکەوەو ئاوەکانیان کردە تەنکی یەوەو ئاویان داپێمان بەڵام ئاوی چی وەك ژەهر وابوو.. تاڵ تاڵ، نازانم چۆن ئەو خەڵکەی پێش ئێمەی نەکوشتبوو.. خەڵکی وای تیابوو لەئاوای یەکانی قەراخ و گەرمیان و شارباژێڕ گیرابوون ئەیانووت مانگ زیاترە لێرەین.. نازانم چۆن مابوون و بەرگەی ئەو عەزابەیان گرتبوو.. بەڵام خۆیان ئەیانووت زۆرمان لێمردووەو باسی برسێتی و تونێتی ئەوێیان کردو وتیان کێ بمرێت تەرمەکەی ئەدەنە سەگ.. زۆر حەپەسام کەوایان ووت.. تەرمەکان ئەدەنە سەگ..!؟ ئەمە چی نامەردی یەکە ئەم حکومەتە لەگەڵ ئێمەدا ئەیکات.. بۆئێمە گاورین، ئەی خوا چۆن ئەمە قبوڵ ئەکات..!؟

ئاخر چیمان کردبوو لەژیانمانا چی خراپەیەکمان هەبوو.. لەوەتەی خۆمان ناسیووەتەوە نوێژو رۆژو عیبادەتی خوامان کردوەو وائێستاش کەدەوری هەژدەو نۆزدەی رەمەزان بوو هەر بەرۆژو بووین.. لەپای چی بەمردویش وازمان لێناهێنن و مردوەکانمان بدەنە دەم سەگەوە؟! زۆر بەلامەوە سەیر بوو.. وەتەن و دێ روخان و بردنی ناموسەکەمان و جەرگەکانیشمانم هەموو

لەبیر چووەوە.. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بارەکەمان قورستر دەبوو..!! ڕۆژانە خەڵك لەتینواو لێبرسا ئەمرد.. چەند جارێك ئەمویست کەمردووەکانیان ئەخستە سەرعارەبانەیەکی دەستیو ئەیانبردە دەشتەوە ئەمویست منیش لەگەڵ تەرمەکەیدا بچمو بزانم ڕاستە جەنازەکان سەگ ئەیخوات، زاتم نەکرد بچم..!!

ئاخریەکەی چوومو بەچاوی خۆم ئەو حەقیقەتەم بینی کەکۆمەڵێ سەگی زۆر گەورە لەدەوری قەڵاکە بوون.. کاتێ لاشەی مردوەکان هەروا بەئاستەم ئەمانخستە ژێر لمەکەوە ئەهاتن هەڵیان ئەدایەوەو لاشەکەیان هەڵئەدڕی.. خۆم چەندینجار لاشەی مردوەکانم بینیوە بەدەم سەگەکانەوە.. هەقە کورد قەت ئەو ڕۆژانەی لەبیرنەچێتەوە..! کەئەم زاڵمە چیبەم کوردە داماوە کرد..!؟

هەر بەئارەزوو تینومانیان ئەکرد، برسیمانیان ئەکرد.. جاری وابوو سەمونەکە ئەهاتو دابەشیان نەکرد تاچەند سەعاتێك دوای وادەی خۆیشی.. کەڕۆژانە یەك جارویەك سەمونی ڕەقی عەسکەریان ئەداپێمانو یەك جار ئەیانهێشت بچین لەتەنکیەکان ئاو بهێنین.. ئەویش ئەبوو سەعاتێك نۆرەی بۆبگری.. ئەهاتن لەکاتی نۆرەگرتنەکەدا لێمانیان ئەدا بەقامچی ئەکەوتنە ناو ئەو هەموو پیرەژنو پیرەمێردەو بەحەیزەران ئەمانیان کوتا.. گەر قسەیەکیشت بکردایە ئەتیان بەستە عەموودەوە لەناو حەوشەی قەڵاکەوەو فەلاقەتیان ئەکرد..

چەند کەسیان هەروا کوشت!! چەنێکی لەتینوا لەبرسا مرد ئەوەندەیشی بەخەفەتو عەزابی تەعزیبدانەوە مرد.. بەوخوایە تامن بەربووم تەنها لەو ڕیزە قاعەیەی ئێمە درۆم نەکردبێ ئەیانووت (٥٠٠) کەسی لێمردووە.. ئەوەی کەنەشمردبوو هەر بەڕۆح زیندو بوو هەمووی تووشی نەخۆشی خراپ بوو بوون..

هەندێ شێتی لێبوو کەکاتی خۆی لەدێیەکانی خۆیان گیرابوون لەوێ بوو بوونە مەخسەرە، عەسکەرەکان زۆر عەزابیانیان ئەدا.. جاری وابوو روتیانیان ئەکردەوەو بەناو قاعەکاندا گێڕیانیان ئەدا.. یان لەناو حەوشەکە دوو دوو پشتیانیان ئەکردە یەك و ئەیانیان بەستە یەکترییەوەو خۆیان پێیان پێ‌ئەکەنین..!

**جارێ حەجاجێك هەبوو زاڵم وەك ئەوخوا لەدونیادا دروستی نەکردبوو کەئەو ئەهات هەرچی سجن و عەسکەرو زابتەکانیش خەریك بوو لێی بتۆقن، ئەوانیش لێی ئەترسان دیاربوو مەسول هەموویان بوو.. کەئەو لە(قەلا) بوایا.. نابوو هیچ ئەخۆشێك هاوار لەئازاری بکات و نابوو کەس بگری و نابوو قایم قسەبکەین و ئەبوو ئاگامان لەشێتەکانیش بوایا هاوار نەکەن.. چونکە (حەجاج) بێزار ئەبوو کەبێزاریش بوایا ئەکەوتنە ناو ئەو خەڵکەو هەرچی خوا پێی ناخۆشە ئەوەی دەرحەقمان ئەکرد..**

هەندێ لەحەرەسەکان عەرەبی شیعە بوون و ئەوان دیاربوو ویژدانیان هەبوو لەوەکان باشتر بوون و جاری وابوو دڵمانیان ئەدایەوەو ئەیانووت خواگەورەیەو ئینشائەلا رۆژێ دێت خواهەقتان بکات..

ئێمە ئەمان ئەزانی ئەو شوێنەی کەلێی سجنین کوێیەو لەکوێیە هەرئەو عەرەبە شیعانە پێمانیان ووت کەئێرە (نوگرە)یەو قەلایەکی تایبەتە بەسجن و لەناو (قەزای سەلمانیش قەلایەکی تری واهەیەو ئەویش پڕیەتی لەسجن)و ئەیانووت کۆمەڵێ قەلا هەیەو ئەوانیش پڕکراون.. پێمانیان ئەووت هێشتا ئێوە باشن و چونکە دورە دەستن، وەزعی ئەوانەی (سەلمان) زۆر خراپەو ئەوان بەهەموو شێوەیەك ئەچەوسێنەوە..

ئیتر تاماوەی چوار مانگ و پانزە رۆژ لە(نوگرە) ماینەوەو دوای ئەوە هاتن بەناو قاعەکاندا ئەگەڕان و بەمیزاجی خۆیان لەهەر قاعەیەکدا چەند ناوێکیان

ئەنووسی.. زووتریش دووجاری‌تر ناویان نووسی و دوو وەجبەیان لێمان بردو نەمانزانی بۆکوێیان ئەبەن..

ئەمجارە ناوی منیشی بەرکەوت و دوای شەش حەوت رۆژ هاتنەوە ئەوەی کەناویان نوسی بوو ناوەکەیان دەخوێندەوەو دەیانکردە دەرەوە.. زۆر ئەترساین و حەزمان ئەکرد کەناومانیان نەنوسیایاو باوەك ئەو خەڵکە هێواش هێواش بمردینایە.. کێ ئەڵێ ئێستا نامانبەن و نامانکەنە ناو (بەحرەوە)..

چەند سەیارەیەکیشیان هێناو بارمانیان کردو بردمانیان بۆ(سەماوە) نوێژی مەغریب بوو گەیشتین.. زۆر هیلاك و برسی بووین.. زابتێکی عەرەبی شیعەمان لێ‌پەیدا بوو بووە فریشتە بۆمان و رۆیی لەناوشاردا نانی فڕنی گەرمی بۆمان کڕی و ووتی ئەمە هی‌شەخسی خۆمە نەك حکومەت.. دیاربوو ئەوانیش وەك ئێمە بێزار بوون بەلام نازانم چۆن ئەیانوێرا قسەبکەن.. هەمووی هەر سەعاتێك لە(سەماوە) هێشتمانیانەوە.. دواتر خستمانیانەوە ناو سەیارەکان و هاوردمانیانەوە بۆتۆبزاوا بۆئەو مەعەسکەرەی کەلەگەڵ منداڵەکاندا لەیەکمانیان جیاکردەوە، بڕوابکە کەشەو گەیشتینەوە تۆبزاوا بەقەدەر ئەو چوار مانگ و نیووە خەم و خەفەت و مەراق کەوتە دڵمەوە.. ئەو رۆژەم ئەهاتە بەرچاو کەچۆن کوڕەکان و بوکەکەم و کوڕەزاکانم بەزۆر لێمان جیاکرانەوە چونکە ئەو چەند مانگە لەنوگرە ئەوانمان زۆر لەبیر نەمابوو ئەوەندە عەزابمانیان دابوو بیرکردنەوەشمان نەمابوو.. مەگەر شەوان کەلەگەڵ ئاسماندا دائەنیشتین تابەیانی ئەوکاتانە هەندی‌جار بیرمان دەکەوتەوە کەچۆن بەپاڵ ئەیانیان بردو ئەوانیش هەر ئاوڕیان بۆدواوە ئەدایەوەو سەیری منیان ئەکرد.. کەبینیان من ئەگەریم ئەوانیش دایان لەپڕمەی گریان.. ئەو شەوەی تۆبزاوا کەبەحساب بۆبەردانمان ئەهێننەوە

مـن تابـەیانی هەرلالآمـەوەو فرمێسـکم هەڵرشـت وەك ئـەو سـەعاتە وابـوو کەلەوشوێنەو لەیەکتر دابڕاین..

بەیانی چێشتەنگاو سواری سەیارەکا نمانیان کردموو هێنامانیانەوە بۆسـلێمانی لەدایرەی ( تەواری ) ناونوسمانیان کـردموو هەریەکـە بـە پێی ناوچەکـەی خـۆی جیامانیـان کـردموو ئێمـەیان هێنایـەوە بۆقا یمقامیـەتی چەمچـەماڵو لــەوێ بەکەفالەت بەرمانیاندا.. من کەسم نەمابوو هیچمان نەمابوو لەماڵـە ئاسـیاوێکدا ماوەیەك مامەوەو دوای چوومە ماڵ خزمێـك لـە( ژاراوا ) لەناوچـەی پشـدەر.. دوای ئەوانیشیان گواستەوە بۆ( حاجیئاوا ) تارا پەڕین لەحاجیئاوا بووم لەساڵی ۱۹۹۲وە هاتوومەتەوە ئاوای ( هەیدەربەگ ) بەلاّم هەرچاوم بەڕێوەیە بۆهەواڵی مناڵـەکان.. ڕۆژانە شوێنەکانیان ئـەبینم دێنــەوە بـەرچاوەو تۆبـزاوا دێتـەوە بـەرچاوم.. زۆر بەعەزابەوە ئەژین.. بڕوابکە هەروانەزانم سجنمو ئـازاد بوونـی ئێمـەیش لەگـەڵ چارەنوسی ئەواندایە.. ڕۆڵە لەچاوەڕوانی ناخۆشـترنیە لـەدنیادا.. ئـەو هـەموو پەت پەتیو عەزابەی چەشتمان بەقەدەر عـەزابی چـاوەڕوانی ئـەم چـەند سـاڵە جەرگمی لەت لەت نەکردووە.. ئەوە کچێکیشـم ئـەوەتا لـەو ژورەدا بەسـتراوەتەوە لەئەنفالەکەدا شێت بوو لەتاوا...!

**کورد ئەوەندە حەیای بەخۆیەوە بوو (٥٠) ساڵ لەدێیەك دا بویتا دەرپێیەکی ژنت نەئەبینی بەسەر تەنافی ماڵێکەوە کەچی ئێستا زۆربەی سەیارەکان هەر بۆئەتلك کردنی کورد شەرواڵی ژنەکانیان وەك عەلەم کردبووە دارا...**

# گەردە عەبدول کەریم عەبدول قادر

**لەدایك بووی ساڵی ١٩١٧- کانی ماران- کفری**

ئێمە جافین و کاتی خۆی کۆچەری بوین، ژیانمان بەمەڕداری و گەرمیان و کوێستان و کۆچ و کۆچ بارەوە بردۆتە سەر بۆیە هەر نازانم لەکوێ لەدایك



بووم.. دایکیشم زۆرجار کەبۆمانی ئەگێڕایەوە ئەیووت هەر یەکەتان لەشوێنێ لەدایك بوون و لەناو چادرو لەوکۆچی گەرمیان و کوێستانەدا نازانم کامتان لەگەرمیان و کامتان لەکوێستانیش لەدایك بوون... ئیتر بەبیرەوری منیش سەردەمی منالی و

گەنجیەتیشم هەر کۆچەری بووین‌و نازانم تەمەنم چەند ئەبوو داومیانە بە (قادر رەشید) و کچێکم لێ بوو ناومان نا (ئەختەر) دوای مێردەکەم ئەمری خوای کردو داومیانە بە (احمەد رەشید ئاخ وەیس)و لەلای (کفری) لەئاوای (کانی ماران) نیشتەجێ بوین.. چونکە زوتر ژیانمان بەو کۆچ‌و کۆچباری‌و گەرمیان‌و کوێستانە بردبووە سەر... (کانی ماران) بۆمن ژیانێکی تازەبوو، سەرەتا ناخۆش بوو لام‌و رانەهاتبووم لەگەڵ ئەوەی هەر لەدێیەك دابمێنمەوە... بەڵام ورده ورده لەگەڵ ئەو ژیانەدا راهاتم‌و ماڵمان پێکەوەناو لەخانودا نیشتەجێ بووین، من زووتر بەهەموو تەمەنم رەنگە چوارشەو لەخانودا نەخەوتبم‌و هەر لە (خێوەت‌و رەشماڵ) دا ژیاوم.

ئەم دێیەش خۆش بوو چەم‌و داری بوو (حوجرەی خوێنەواری بوو) پاك‌و تەمیس بوون.. لەچاو ژیانی رابردوی ئێمەدا وەك ژیانی شاری وابوو هەرچەندە لەوێش هەر خەریکی بەخێوکردنی مەڕو ماڵات‌و فەلاحەت کردن بووین بەڵام ئەو ئیش‌و کارانەی ژیانی لادێ بۆمن فرە ئاسان بوو.

فرە بەخۆشی ژیانمان ئەگوزەراندو جگە لەئەختەری کچم کەلەمێردە کۆنەکەم بوو لە(احمەد) یش چوار منداڵم بوو (فاتم‌و مەلیحەو عومەرو عوسمان) ماڵ‌و حاڵمان نابەیەکەوە لەهیچمان کەم نەوی.. تاساڵ هات‌و چوو زەمانە گۆڕا، مەلیك رۆیی شەڕو پشێوی کەوتە ولاتەکەوە... تەیارە پەیابوو ئەهات رەمی ئەکرد لە دێهاتەکان چەم‌و داری ئەسوتان نازانم ساڵ کەی بوو ساڵ (بەعسی‌یەکە) ئەڵێم عارەب هات دایە سەرماندا ئاوایەکانیان تالانکرد هەرچیمان نابووەیەکەوە هەموویان (فەرهود) کرد وەخوا وەخوا گوارەیان لەگوێی ژن داکەندو بردیان هیزە رۆنیان دزی.. مەڕوماڵاتیان گشت تالان کرد حکومەتەکەش لەپشتیان بوو بەئەمری حکومەتەکە هاتن‌و ئەو تالان‌و بڕۆیەیان کرد... بەڵام ئەڵێن (خوا لەسوڵتان مەحمود گەورەترە) ئەوەندەی نەخایاند خوا هەقی ئەو کوردە داماوەی لێ کردنەوە ونەمان‌و تیا چوون... ئیتر ماوەیەکی زۆری پێ چوو تاسەر لەنوێ ماڵمان دروست

کردەوەو بوینــەوە بــەخاوەنی مــەڕو مــاڵات... زۆری پــێ چــوو چونکــە ئــەو زاڵمانە لەبنیان هێنا..!

ئەوە بوو پێشمەرگە پەیابوو شۆڕشەکەی مەلا مستەفا تەشەنەی کرد ئیتر عارەب نەیوێرا بێتە سەرمانو تالآنمان بکات.. ئێمەش ئەو ترسو دڵە راوکێیەمان نەما.. ماوەیەك بەباشی گوزەران پێکەوتەوە تا ئەوساڵەی شۆڕشەکە تێك چوو لە (٧٤) حکومەت هاتەوە دێیەکەمانی سوتانەوە هەرچی هەبوو هەرچیمان نابوەیەکەوە جارێکی تر لەبنیان هێنایەوە... زۆر ناخۆشە تۆ هەرچیت ناوە تەیەکەوەو چەند ساڵە خڕی ئەکەیت زاڵمێك بێتو بیسوتێنێ.. ئەوەندە کاری لێم کردبوو ئەوکاتە خۆزگەم ئەخواست کاتی خۆی هەر کۆچەری بوینایەو خاوەنی ئەو ماڵو حاڵە نەبوینایە.. خۆ نەخانومان ئەسوتاو نەماڵمان تالآن ئەکرا.. ئەوەی هەمان بوو رەشماڵێكو قاپو قاچاخی نان خواردنو یەك دولبادە شرە بوو... بەڵام کە لەدێ ماڵمان کردو ماینەوە ماڵێکی پڕو پوختەمان هەبوو بەخوا مەگەر ماڵ شا وابوبێ.. هیچمان بۆ دەرنەچوو.. هەموویان سوتان .. نازانم ئەم کوردە بەدبەختە بۆئەبێ بەشی هەر راکە راكو ماڵ وێرانی بێت نەمان ئەزانی چی بکەین ماڵ دروست بکەینەوە کێ ئەڵێ جارێکی تر تەیارە نایاتو نایڕوخێنێ.. ئەیخۆ نــاکرێ هــەر بەودەشــتەوە بــین..! گەڕاینــەوە ســەر کــەلاوەی ماڵــە سوتاوەکانمانو دەستمان کردەوە بەدروست کردنەوەی خانوەکانمان... بەڵام بەنابەدڵییەوە دروستمان کردەوە چونکە مارانگاز بوینو دوجار ماڵمان وێران کرابوو.. ئەمانووت هەربای ئەوە بێت سوکنەی تیابکەین... ئیتر ئەوە بوو شۆڕش تاوایەوەو هەرکەس چووە ماڵی خۆی.. گوێم لەزەلامەکان ئەبوو لەناو خۆیانا باسیان ئەکرد مادام شۆڕش نەما ئەم حکومەتە گشتمان ئەبا بۆناو عارەبو ئەوان ئەهێنێ لەکوردستان نیشتەجێیان ئەکات... جاران لەترسی شۆڕشەکە نەیئەتوانی ئەمەبکات.. ساڵێ دوانی پێچوو خەڵکەکە ترسی تێ کەوتبوو ئەیانوت دێیەکان ئەو حــدودەی گشــتی روخــاندووەو خەڵکەکــەی ئــەهێنێو موجەمــەعیان

بۆئەکات... پیاوەکەم زۆر ئەترساو دایەمە ئەیووت ئەم زاڵمە گشتمان لەدەوریەك خڕئەکاتەوەو هەر کاتێکت زانی پەلامارمان ئەداو گشتمان ئەگرێ.. قسەکانی ئەوەندە بەلامەوە سەیربوو باشە خۆپیاومان نەکوشتووە لەماڵەکەی خۆمان دانیشتبووین‌و بەمەهەرەو مەڕی‌و هەزار هیلاکەت رۆژ ئەبەینە سەر.. بۆوامان لێ دەکات ئەی ئەوە نی‌یە دووجار ماڵی کاول کردین‌و هەرچیمان بوو تالاّنی کرد.. ئیتر چیتری لێمان ئەوێ..!

ساڵ هات‌و چوو پێشمەرگە پەیدابوونەوە عێراق لەگەڵ ئێران بووە شەڕی... ئیتر ئەوەندە نەئەپەرژایە سەر ئێمەو کورد ئەڵێ شەڕێ بێت خێری ئێمەی تیابێ ئەو شەڕەی ئێران خێری ئێمەی تیابوو... ئیترماوەیەکی زۆر حەساینەوە نەجەیش ئەیتوانی بێتە سەرمان‌و نەجاش ئەهات تالاّنمان بکات... قلە قلە کۆپتەرەکە ئەهات بەلاّم لەترسی پێشمەرگە ئەویش خەسارەی نەئەدا... پێشمەرگەیش زۆر بوبوو هۆشێك کەوتبۆوە بەرمان‌و بەپشتیوانی ئەوانەوە کەوتینەوە ماڵداری کردن‌و بوینەوە ماڵێکی پوختە عێراق لەگەڵ پێشمەرگەیش ئاشت بونەوەو ئیتر بەیەکجاری ئومێدمان لادروست بۆوە کە لەمەودوا بۆخۆمان بەبێ خەم ئەژین... بەلاّم براکە ئەوەندەی پێ نەچوو بەینیان تێك چووەوە.. ئەمجارە حکومەت خراپ پەلاماری ئەدا (ئەتوت ماری زامدارە) بەهەموو قوەتی بەر بووە گیان ئەو خەڵکە بێ خەتایەو دەستی لەکەس نایاراست.

دایە سەر ئاوایەکەمان بەجاش‌و جەیش‌و کۆپتەرو دێیەکەمانیان روخان بەدەردێ چوین مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێ چیمان بەسەرهات هەرچی ماڵمان بوو هەمووی لەخانودا سوتاو کرایە ژێر خۆڵەوە ئەوەیشی کەبەکەڵك ئەهات بەتالاّنی بردیان... خۆیشمان ئەوەی رزگاری بوو نەمان ئەزانی چی بکەین... بێ ماڵ‌و حاڵ روو لەکوێ بکەین هەر لەوچەمەی نزیك ئاوای خۆماندا دوای گەڕانەوەی جیشەکە هەوارمان دروست کردەوە... ئیتر هەر ماڵەو لەژێر ئەو چەم‌و دارەداو وەك کونە تەیارە جێی خۆشاردنەوەمان دروست کردەوە بووە ماڵمان ماوەیەکی زۆر لەوێ دا ماینەوە چاوەڕێی

وەزعەکە بوین... ئەگەر خوابکات بەرەو باشی بچێت ئەوە ئەچینەوە لەشوێنی ئاوای ماڵەکانمان ئەمجارەیش دروستی ئەکەینەوە ئەگەر وەزعەکەیش خراپ بێت ئەوە هەر لەناو ئەو چەمو دارانەدا خۆمان پەنا دابوو چاوەڕێی دەرویەکی خوابوین کە لێمانی بکاتەوە بەخوا لە ساڵ کەمتری پێچوو بەسەر روخاندنی ئاوایەکەمان داو هەڵگەرایەوە بەهار، دەنگو باس وابلاوبووەوە ئەمجارە حکومەت هەموو کوردستان کاولو وێران ئەکاتو پێشمەرگە ئەهاتنو ئەیانوت (زەهری کردۆتە بان هەڵەبجە)یا ئەو خەڵکەی گشتی کوشتووە هەر بەجارێ رۆحمان چوو، خوایەگیان رولە کوێ بکەین ئەچی بەرەو شارەکان لەهەر شوێنێ بتگرێ مەگەر خوا بۆخۆی بزانێ چیت لێ ئەکەنو لەیرە ئەمێنیتەوە وا ئەڵێنو ئیتر نازانی چی بکەی لەترسا بەخوا هۆشیشمان لای خۆمان نەمابوو توشی سەر گەردانییەك بوو بوین هەر مەپرسە..

دەنگو باس واباوبوو حکومەت بەهەموو قوەتیەوە پەلاماری ناوچەکانی ئەو ژورەو قەراداغی داوەو یەکەیەکە دێیەکان ئەروخێنێو هەرچی رەزوباخو چەمو دارستان هەیە ئەیسوتێنێ... ئەڵێن کونو کەلەبەری ئەشکەوتەکانیش گەڕاوانو (بنیادەمیان) لێنەهێشتووە... هەموو خەڵکەکەیان گرتووەو ئەڵێن هەر ئەیانخەنە ناو قافڵەی سەیارەوەو ئیتر کەس نازانێ بەرەو کوێیان ئەبەن..

لەناوچەکەی ئێمەش دەمێك بوو تۆپ باران دەستی پێ کردبوو رۆژانە تۆپ ئەیدایە ناو دێهاتەکان داو خەڵکی ئەکوشت کۆپتەر رەمی ئەکرد سەیارەی ئەسوتان... بەڵام کار هەر بەوەوە نەوەستا ئەیانوت لەهەموو لایەکەوە پەلاماری ناوچەکە ئەداتو وەك کێوماڵ رای ئەماڵێو لەهەر چوار لاوە قواتی هێناوە لەکفریو لە نەوجولو قادرکەرەمو لەکەلارو لەسەنگاوو قەراخەوە... کۆپتەریش پەیتا پەیتا قواتی ئەبردو لەسەر شوێنە بەرزو سەر رێگاکان دایان ئەمەزراند... رێگای دەرباز بونمان نەبوو... نەشوێنێ هەبوو

پەنای بۆبەرین نەپەناگایەك داڵدەمان بدات... خۆمان دابووە دەست قەدەرو چاوەڕێی رەحمەتی خوابووین..

یەکێ لەکورەکانم هات و وتی هیچ چارەیەك نەماوە ئەبێ بەدزیەوە خۆمان بگەیەنینە ناو کەلار سواری تەرەکتەرێك بووین و بەرەو کەلار کەوتینە رێ...

رۆژە رەش بوو، خەڵك سەری لێ شێوا بوو.. کۆمەڵێ بەرەو چەم ئەڕۆی کۆمەڵێ لەچەم ئەگەڕایەوە کۆمەڵێ بەرەو شار ئەڕۆی و هەبوو بەرەو چیاکان ئەڕۆی لەترسا ئەو خەڵکە هەر خوارو ژوری ئەکرد..

بەڵام تەیارە لەئاسمانەوە وەك (واشە) ئەهات و ئەچوو.. جارنەجارێ زرمەیەکی گەورە دەهات نازانم تەیارەکە قومبەلە بوو چی بوو بەری ئەدایەوە.

تەیارە بەئاسمانەوە چاودێری هات و چۆی خەڵکەکەی ئەکرد.. قوڕ بەسەر خەڵك بۆهەر لایەك بچویتایە هەر لەناو بازنەی پەلامارەکەی ئەوان دا بووین وەك ئەوە وابوو لەناو مەعەسکەرێکی گەورەدا سجن بین.

لەسەر رێگاکە بەر لەوەی بگەینە کەلار کەوتینە ناو سەربازو جاشەکانەوە.. پێشی ئێمەش خەڵکی زۆریان گرتبوو.. ئەوەی روەو شارەکان چوو بوو هەمووی گیرابوو، ئێمەشیان تێکەڵ ئەو خەڵکە کرد.. هەمووی لەترسا رەنگی مردووی لێ نیشتبوو... هەر کە گیراین ناو کەل و پەل و شتەکانمان گەڕان و هەرچیمان پێ بوو لێمانیان سەند... تەنانەت گیانی خۆیشمان گەڕان و هیچیان پێمان نەهێشت... ئەو خەڵکەی تریشیان واڵێکربوو... کەل و پەلەکانیشمانیان لەولای خۆمانەوە هەڵدابووەو... هەروا خەڵك بوو ئەهات و ئەیانگرد وەك ئێمەیان لێ یان ئەکردو ئەیانیان خستە ناو کۆمەڵەکەی ئێمەوە... قەدەرێکی پی چوو کۆمەڵێ زیلی عەسکەری زۆریان هاوردو گشتمانیان لەو زیلانەدا بارکردو هێنامانیانە (قۆرەتوو)...

(ئۆه قۆرەتوو بەقوڕا چێ) واسەر ئەو عالەمەی خوارد... کەئێمەیان بردە ئەوێ تاچاوت بڕئەکات هەر خەڵك و تەرەکتەرو ئیڤای عەسکەری بوو پەیتا پەیتا خەڵکی تریشیان ئەهاورد، خوا ئاگادارە من نازانم بڵێم گەرمیان و

کوێستانی کوێم نەکردوە، عومرم گەیشتبووە ئەوکاتە ئەوەندە ئومەتم نەبینی بوو کەلەو قۆرەتووە خڕکرابونەوە... دارت هەڵدایە بەر زەوی نەدەکەوت منالْ گشتی لەو ژێر دەستو پایەدا هەر نازانم خوا چۆن لەویٚ روحمانی دەرنەکرد.. سیٚشەوو سیٚ رۆژ ئەو خەڵکە یان لەقۆرەتو هێشتەوەو سەعات بەسەعات بەقافڵەی زیلو تەرەکتەری دیٚیەکان خەڵکی تریان بۆئەهاورد... ئەو سیٚ رۆژە گیانمان بەخواو بەخەڵکی کەلار بوو ئەگینا هەر لەویٚ هەمووی لەبرسا ئەمرد... نازانم ئیتر حکومەت خۆی ریٚی دابوو چۆن بوو.. بەڵام رۆژانە لەکەلارەوە نانیان کۆئەکردەوەو ئەیانهێنا بۆمان.. خەڵکەکە ئەوەندە زۆر بوو بەهەزار پاڵە پەستۆ بای ئەوەنانت دەست ئەکەوت کەلەبرسا نەمری.. ئەویش خەڵکی کەلار بۆمانیان ئەنارد.. حکومەت نانی‌نادا پێمان.. بەجەیشێکی زۆریش تەوقی ناوچەکەیان کردبوو کۆپتەریش لەبان سەرمانەوە ئەهاتو ئەچوو ئەتووت رەسممان ئەگرێت.. سیٚ شەو سیٚ رۆژ لەویا هێشتمانیانەوە لەوە ئەچوو بەنیاز بن هەر لەویٚ بمان کوژن چونکە زۆر توندو تیژ بوون لەگەڵمان دا.. دوای ئەو سیٚ رۆژە سەیارەی عەسکەری‌یان زۆر هێنا ئەم سەرو ئەوسەری نەبوو هێنایانە قۆرەتوو کەوتنە بارکردنی ئەو خەڵکە، رۆژە رەشیٚ بوو رۆڵە یاخوا کەس ئەو رۆژە نەبینیٚ... تا ئەوکاتەی ئەو سەیارانەیان هاورد کەمیٚ ئومێدمان هەبوو کە رەنگە بەرمان دەن.. ئەی قابیلە چی لەو هەموو خەڵکە ئەکەن بەڵام کەسەیارەی عەسکەری‌یان هێناو کەوتنە بارکردنمان ئیتر ئومێدمان نەما وا ئەمانگوازنەوە مەگەر خوا بزانیٚ بۆکویٚ ...!

عەسکەریەکی زۆریان هێنا بوو هەمووی ئەتووت بەرازن بەشەقو تێهەڵدان خەڵکیان بار ئەکرد پیرو پیرەژن وامان بووی ئەبوو دەست بخەیتە ژێر باڵی ئەوسا ئەیتوانی بڕوات بەرێوە ئەو زاڵمانە بەقۆناغە تفەنگ لێیان ئەدا تاباریان ئەکرد باس ناکریٚ چی باس بکەم.. کارێکیان بەو خەڵکە نەکرد بتوانرێت بگێڕدرێتەوە.. چەند ژن دووگیان بوو چەند نەخۆشو پەککەوتە کورە کوێرو شەلو شێتی دیٚیەکانیشیان گشت گرتبوو... بەپەت

پەتی‌یەکی خراپ گشت ئەو خەڵکەیان خستە سەیارەوە خێزان وابوون زۆربوون بەشێکیان بەرسەیارەیەکی تر ئەکەوت چەند هاواریان بکردایە ڕێگایان نادا دابەزێ یان ئەمەکانیان بۆلای ئەوەی تریان سەر خەن چەند کەس هەر لەقۆرەتوو چەند خوشك‌و برا.. کوڕ دایك... ژن‌و مێرد... هەر لە قۆرەتوو لەبارکردنەکەمان لەیەکتر دابڕان... ژن‌و منداڵەکەیان هەڵدا بووە ناو سەیارەیەکەوەو خۆیان ئەخستە سەیارەیەکی ترەوە هەر هارو شێت بووین لەتاوا... بەڵام کێ دەربەستی ئەم کوردە داماوە ئەهات... من خۆم هەر لەبارکردنەکەمان دا دوو کچم لەگەڵ خۆم گیرابوون لەیەکتر دابڕاین‌و یەکترمان نەبینی‌یەوە هەر لەبەیانی‌یەوە خەڵکیان بارکردو خستیانە ڕێ ئێوارەکەی ئێمە بەرکەوتین ئەوەندە خەڵك گیرابوو ڕەنگە بڵێم ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لێیان بار کرد هێشتا نیوەنەبوو درۆنی‌یە ئەگەر بڵێم قافڵەی سەیارەکان ئەوەندە زۆر بوون کەئەو خەڵکەیان گواستەوە سەرێکی گەیشتبووە ناو عەرەبسان دوای‌یەکەی هەر لە قۆرە توو بووە.

ناو سەیارەکەیش ئەوەندەیان تێ‌کردبوو هەمووی وەك لاشە کەو تبووینە سەر یەك داو هەر سەیارەیەکی عەسکەرێك‌و هەندێ سەیارەمان دوو عەسکەر حیمایەی بوون بەتفەنگەوە بەدیار سەر مانەوە بوون ئەملاو ئەولای ڕێگاکانیش هەمووی عەسکەری گرتبووی‌و عەلی کۆپتەریش لەئاسمانەوە ئەهات‌و ئەچوو.

لەو کەل‌و پەلەی کەخەڵکەکە پێی بوو هەر بۆئەوەی حەیای کورد بەرن‌و ناموسمان بشکێنن ئەو زیلە عەسکەریانەی کە خەڵکەکەیان پێ گواستەوە هەندێکیان دەرپێی ژنیان پێوە هەڵواسیبوو لەناو ئێمەدا ئەوە گەلێ عەیب‌و ماشێت بوو، کورد ئەوەندە حەیای بەخۆیەوە بوو (٥٠) ساڵ لەدێیەك دا بویتا دەرپێی‌یەکی ژنت نەئەبینی بەسەر تەنافی ماڵێکەوە ئەبوو بەشەو ئەگەر کوڵمان بکردایە وشکمان ئەکردەوە کەچی ئێستا زۆربەی سەیارەکان هەر بۆئەتك کردنی کورد شەرواڵی ژنەکانیان وەك عەلەم کردبووە دارا... بەخوا لەویا هەریەکی گوللەیەکیان پێوەمان بنایە پێمان خۆشتر بوو لەوە...

لەسەرو سیمای زەلامەکانیشمان دا دیار بوو حەزیان بەمەرگی خۆیان ئەکرد، هەموو سەریان داخستبوو کزومات ئەتووت ئەتکی شەرەفیان کراوە... عەسکەرە عەرەبەکان دیاربوو ئەیانزانی لای کورد ئەوە تەعەدایەکی گەورەیە بۆیە سەیارەکانیان دەرپێی ژنیان پێوە هەڵواسیبوو..

ئێمە شەو بوو گەیشتینە سەربازگەیەکی گەورە لەبەر لایتی سەیارە ئەتووت چراخانە وەك شار وابوو کەلەوێ ئەو هەموو خەڵکەم بینی هەر زراوم چوو خوایە چی بووە وائەو عالەمەیان لێرە خڕکردۆتەوە قۆرەتوو لەچاو ئێرەوە وەك چۆڵەوانی وابوو هەزاران سەیارە بەریز وەستێنرا بوون گشتی پڕ لەخەڵك وەجبە وەجبە نەفەرەکانیان هەڵئەڕشت و بەبەتاڵی ئەگەڕانەوە دیار بوو ئەچونەوە بۆ وەجبەی تر بەخوا رەنگە سەعاتێ زیاتر هەر لەناو سەیارەکە رامانیان گرتبێ تا بەرمان کەوت دامان بەزێنن دامانیان گرد ئەتووت رۆژی حەشرە بەخوا تا ئەورۆژە نەمزانی وە خوا ئەوەندە مەخلوقی هەیە رۆڵە لەحساب نەئەهات جارێ زەلام گەنج ئەوەی ریز کرابوو ئەم سەرو ئەو سەری دیار نەبوو... پیر وپەککەوتە هەر مەپرسە... نازانم چۆن باسی کەم بەخوا کەس ناتوانێ بۆتان باس بکات و بزانێ چەندێ خەڵك لەوێ بوو مەگەر ئەو خوایە خۆی بزانێ...

ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر لەناو ئەو ساحەیە هێشتمانیانەوە بەلاّم رێگات نییە چوار هەنگاو بڕۆی لەبەر خەڵك... تابەیانی هەڵئەلەرزین و ئاخمان هەڵکێشا..

بەیانی کەخوا رۆژی کردەوە ئەوکاتە سەیرت بکردایە ئەو سەرو ئەوسەری نەبوو مەعەسکەرەکە گەلێ گەورە بوو کۆمەڵێ قاعەی درێژ درێژ بەدوای یەك دا دروست کرا بوون بەخوا بڵێم جێگای ئەم (کەلار) ەی تیا ئەبووەوە هەر کە رۆژ بووەوە لەسەد لاوە کەوتنە ناو نوسین و پرسیار کردن... نۆرەی ئێمەش هات و ناومانیان نوسی و خستمانیانە یەکێ لەو

قاعانەوە... قاعەکان زۆر درێژ بوو نازانم بۆ رانە مەڕ کرابوو بۆچی بوو... پەنجەرەی زۆریشی تیابوو...

ئیتر لەپەنجەرەکانەوە سەیری دەرەوەمان ئەکردو چاومان لێ بوو ئەم زاڵمە چی بەو میللەتە دەکرد چۆن کچە عازەبەکانیان جیا ئەکردەوەو ئەوەی کەزۆر جوان‌و جاهێڵ بوو ئەیانخستە ناو سەیارەوەو بردیانیان بڕواناکەم ئەوانیان بۆسجن بردبێ چونکە تەنها کچە زۆر جوانەکانیان برد لەوە ئەچوو بردبێتیان ناموسی کوردیان پێ بەرن..! هەر لە پەنجەرەکەوە چاومان پێوە بوو زەلامی جوان‌و جاهێڵیان لەو ساحەیە جیا ئەکردەوەو بە پشتێوێن‌و جامانەکەی خۆیان دەست‌و چاویان ئەبەستەوەو ئەیانخستنە ناو سەیارەی (موقەپەتەوە)... هەر لەپەنجەرەکانەوە چاومان پێوە بوو کە پەیتا پەیتا قافڵەی تریان ئەهێناو دایانیان ئەگردو سەیارەکان ئەگەڕانەوە بۆ خەڵکی تر... ئەمان بینی کە پەلی گەنجێکیان را ئەکێشاو دایکەکەی خۆی ئەدایە مل دەست‌و پێ‌ی سەربازەکان دا تاکوڕەکەی نەبەن سەربازەکان بەقۆناغە تفەنگ ئەکەوتنە گیانی دایکە قوڕ بەسەرەکەو وایان لێ ئەدا نیوسەعات دوای ئەوەی کوڕەکەشیان بردبوو لەجێ‌ی خۆی نەیئە توانی سەر بەرزکاتەوە.

بەو حاڵەی خۆمانەوە لەناو قاعەکە کەلە هەموو کەس‌و کارو وڵات‌و ئازیزان دابڕاین‌و وەك ئاژەڵ فرێمانیان دا بووە ئەم قاعەیەوە کە هەمووی وەك لاشە کەوتبوونە سەریەك داو نەنانێك نەئاوێك هەر خەریك بوو روحمان دەرچێ..!

بەڵام بەزەیم بەوانەی دەرەوەدا ئەهاتەوە کە بەوشێوەیە سوکایەتیان پێ ئەکراو لەگەڵ هەر لەیەك جیا کردنەوەی خێزانێك دا کەلە پەنجەرەکەوە چاوم لێ بوو، قاژە ئەکەوتەوە جەرگم‌و پەرتەوازەی خێزانەکەی خۆمان ئەهاتەوە بەرچاوم...!

هەر لە پەنجەرەکەوە چاوم لێ بوو پیرە مێردی ریش سپی لەزیلە عەسکەریەکان فڕێیان ئەدایە خوارەوەو جاری وابوو بە ریش رایان ئەکێشا... کابرایەك دیار بوو دەروێش بوو قژی درێژ بوو کە ئەو دیمەنانەی

ئەبینی تفی کردە سەرو چاوی یەکێ لەو سەدان زابتەی لەوێ بوون...
لەپەنجەرەکەوە چاوم لێ بوو بەدوو عەسکەر بەقژ راکێشان بەسەر زەوی‌یەکەدا پەلکێشیان کردو دواتر بەپۆستاڵ دایانە بەر لەقە...!!

سێ‌شەو سێ رۆژی تر لە (تۆبزاوا) هێشتمانیانەوە ئەوەی لەو پەنجەرەیەوە بینیمان کەس لەژیانا نەیبینی‌وە.. یاخوا کەسیش نەیبینێ..

دوای ئەوەی ئەو هەموو پەت پەتی‌یەمان بینی پاشان هاتنە قاعەکانیش لەقاعەکانیش کەوتنە جیاکردنەوەی زەلامە گەنجەکان‌و بردیانیان... ئەویش هەر لەپەنجەرەکەوە چاومان لێ بوو جلەکانیان لەبەریان داکەندو یەکی کراس‌و شەرواڵێکیان لەبەر یان هێشتەوەو دەستیانیان لەپشتەوە بەستەوەو بەجامانەکانی خۆیان چاویشیانیان بەست‌و بەریز خستیانیانە ناو سەیارەی (سەر داپۆشراوەوە) سەیارەکان بچوک‌و سەوز بوون من تا ئەوکاتەو لەو شوێنە ئەو سەیارانەم بینی ئیتر نە زوترو نەئێستاش سەیارەی وام نەبینی‌یەوە ... ئەوانیان بردو ئاوەڵ ئاو رۆیشتن..!!

دواتر هاتن پیرە ژن‌و پیرە مێردەکانیشیان جیاکردەوەو بردمانیان منیش بەتەمەن بووم بەر ئەو وەجبەیە کەوتم‌و لەقاعەکە هێنامیانە دەرەوە ئێمە یشیان سوار سەیارەی (سەر داپۆشراو) کرد.. رەنگی سەیارەکان بۆربوو کە ئەچوینە ناوی‌یەوە ئیتر هیچ شوێنێکت نەنەبینی جامەکانی تاریك بوون...
دوای خۆر کەوتن بەیانی بوو کە خستمانیانە رێ، شەو بوو گەیشتینە شوێنێ لەبیابان.

لەناو سەیارەکە زۆر سەغڵەتیمان بینی تۆ وەرە سیانزە چواردە سەعات لەناو سەیارەیەك بە هەمووی قەپات بێت‌و کونێکی نەبێ بۆ نەفەسیش هەر خنکاین لەگەرماو لەتینوا گیانمان دەرچوو... خوا خوامان بوو رۆحمان دەرچێت‌و نەجاتمان بێت... بەڵام روح لەجێی سەختەو دەرناچێ.

بەخوا رۆڵە ژن بووی لەتینوا میزەکەی خۆی ئەکردە ناو پێڵاوەکەیەوە ئەیخوارد... زۆر رەزا لەتمان بینی.. کەگەیشتینە ئەوێش قەڵایەکی گەڵێ گەورە بوو سەیارەکان چوونە ناو قەڵاکەوە بینایەکی بەرزی دووقات بوو

بەچوار دەوری حەوشەکەدا لەسەر یەك غورفە دروست کرابوو هەمووی رویان لەیەك تری بوو قەڵاکە ئەوەندە گەورەبوو تەنها لەناو حەوشەکەی بەخوا جێگای گەڕەکێکی تیائەبوەوە لێی دروست بکەیت..

غورفەکانیشی زۆر گەورە بوون کەئێمەیان برد خەڵکی تریشی تیابوو ئێمەیان بردە قاتی سەرەوە چونکە غورفەکانی خوارەوە هەمووی پڕکرابوو حەوشەکەیشی جمەی ئەهات بەخوا دوای بۆمان (مەعلوم) بوو ژێر قەڵاکەیش هەمووی ژێر زەوی بوو... دەرگای ژێر زەوییەکەی لای ئێمەوە نەبوو بەڵام خەڵکەکەی ئەیانوت (غەڵبە غەڵب) دێت و رەنگە قاتی ژێرەوەیش پڕی خەڵك بێت ئێمە هیچمان نازانی ماوەیەك بوو لەوێ بووین ئەوسا زانیمان ئەوە (قەڵایەکە لەنزیك سەلمانە) وەزعمان گەلێ خراپ بوو لەوێ خەڵکەکەی گشتی توشی نەخۆشی بوو زۆری لێ مرد بەخوا بەخوا رۆژی راهەبوو ئەهاتن جەنازەی چل پەنجا کەسیان ئەبردە دەرەوە جەنازەکانیان ئەخستە سەر عارەبانەی دەستی و ئەیانبردە دەرەوە، ئیتر نەمانئەزانی بۆکوێیان ئەبەن... ئەوەنە ئەقڵەکەمان فەقیر بوو ئەمانووت رەنگە جەنازەکانمان بنێرنەوە بۆ کەسوکارەکەمان وەك چۆن کاتی خۆی ئەو هەموو جەنازەی عەسکەرانەیان ئەهاوردەوە کەلەشەڕی ئێران و عێراق دا ئەکوژران... خەڵکی وامان لابوو لەهەموو بنەماڵەو خزم و خۆیشی کەسی نەمابوو هەمووی گیرابوو خەمی ئەوەی بوو ئەگەر بمرم و مەیتەکەم بنێرنەوە کەسم نی یە خۆی بکات بەخاوەنی مەگەر خێرەومەن بمنێژن، سەرەتا خەڵك کەمتر ئەمرد تۆزێ گورمان تیامابوو.. عەسکەرییەکان خۆیان ئەهاتن جەنازەکانیان ئەبرد.. بەڵام دوای مردوو ئەوەندە زۆر زۆر بوو عەسکەرەکان لەهەق ناهاتن و ئەو زەلامەی کەهێزی تیما بوو بانگی ئەوانیان ئەکرد کەبچن لەگەڵیان جەنازەکان بەرنە دەرەوەی قەڵاکە. کاتێ چونە دەرەوە گەڕانەوە گێڕایانەوە کە جەنازەکان هەر لەدەرەوەی قەڵاکە ئەخەنە بەر سەگ وتیان کۆمەڵێ سەگی رەشی زۆر گەورەی لێیە، هەریەك و دوو جەنازەکان هەڵ ئەدڕن و هەر ئێسکەکەی ئەهێڵنەوە ئیتر هەر زراومان چوو، رۆڵە تۆقین چ

گاور سانتێی‌یەكە جەنازە بدەنە سەگ تۆبەخوایە ئێستایش كەباسی ئەكەم موچڕكە بەلەشما دێت وەرە وەرە ئەوەندە زاڵم بن جەنازەی مردوو بخەنە بەر سەگ هەی خەجاڵەت لای خوابن ئاخر چی كافرێك لەدنیا وای كردوە... تائەمان لاسای بكەنەوە... بەخوا كەس لەدنیادا وەك ئەم زاڵمە نەبووە... باشە هەر ئەمانی كوشت لەدێ‌یەكەی خۆمان بۆنەمانی كوشت‌و ئاوا سوك‌و رەزیل نەبین... یان هەر لەقۆرەتوو بۆگشتمانی نەخستە ژێر خۆڵەوە كێ رێی لێ گرتبوو لەكێ ئەترسا... یان ئەیوویست بەعەزابەوە بمانكوژێ، جارێ زابتێ رەشی بەرازی لێ بوو ناوی (حەجاج) بوو ئەم حەجاجە زاڵمێك بوو رەحم خوا لە گیانیا نەبوو... لەخواناترسا هەرچی خواپێ‌ی ناخۆش بوو وای ئەكرد.. گیان بەوە بوو هەموو رۆژ ناهات، ئەرۆی‌و حەفتەیەكی پێ‌ئەچوو ئەهاتەوە..

ئێمە لەترس‌و خۆفی خوا لەوەوپێش بەوحاڵەیشمانەوە هەر نوێژو رۆژومان ئەگرد بەلاّم ئەو (حەجاجە) نەیئەهێشت... ئەهات بیبینیایە هەر كەسێ نوێژ ئەكات ئەیدایە بەر قامچی ئەیووت ئێوە خواتان نی‌یە بۆچی نوێژ ئەكەن... ئاخر ئەگەر خوا لەویا هەر دوو چاوی كوێر بكردایە ئەبووە عیبرەت بۆئەوەكانی تریش... كە نەیانئە هێشت نوێژە كەمان بكەین ئێمە هەر رۆژومان ئەگرد... بەلاّم ئەو زاڵمانە نەی ن هێشت ئۆباڵمان بەمل ئەوان خوایە بەقەرز لەسەرمانی نەنوسی ئەو زاڵمانە نەیان ئەهێشت بەرۆژو بین ئێمە رۆژانە یەك قوتویەكی دۆشاو تەماتە ئاویان ئەدا پێمان لەگەڵ یەك سەمونی رەق دا كەزانیان بەرۆژو ئەبین ئاوو سەمونەكەیان لەگەر ماكەی نیوەڕۆدا ئەدا پێمان‌و دوای سەعاتێ ئەهاتن تەفتیشمانیان ئەكرد بەغورفەكان دا ئەگەڕان ئەو كەسەی ئاوو سەمونەكەی هەڵگرتبوو ئەیانزانی بۆئێوارەیەتی ئەیانزانی كەبەرۆژووە ئاوەكەیان ئەرژان‌و سەمونەكەیان لێ‌ی ئەسەندەوە بەو شێوەیە نەهێشتیان نوێژەكەمان بكەین‌و... نە رۆژوەكەیش بگرین ئۆباڵمان بەملی ئەوان..!

من هەتا ئەوکاتەی کەبۆمان دەرکەوت جەنازەکان ئەدەنە سەگ، زوتر حەزم ئەکرد بمرمو ئەمووت بەمردویش بێ بمبەنەوە بۆ وەتەن بەلاَم کەزانیمان جەنازەکانمان دەرد خواردی سەگ ئەدەن ئیتر شەوو رۆژ لەخوا ئەپاڕامەوە خوایە لەم غەریبی‌یە نەمرمو بێ قەبرمان نەکەیت... خوایە بگەڕێمەوە ولاَتەکەی خۆمانو لەوێ گیانم دەرچێو ئەمانەتی یەکەم لەولاَتی خۆمان لێ وەربگرێتەوە..

فەقیر وامان لەگەڵ بوو ئەیووت بەخوا ئەگەر لێرە بمرم لاشەکەیشم سەگ بیخوات بەلاَم خوا هەموو ساڵێ (حەج) ێکمان بۆئەنوسێ چونکە ئەوانەی جەنازەکانیان ئەبردە دەرەوەو ئەهاتنەوە ئەیانووت هەتا چاو بڕکات هەر سەحرایەو هەموی لمە. زوتریش ئەوانەی کە ئەچوون بۆحەج کردن ئەهاتنەوە ئەیانووت هەمووی سەحرایەو هەمووی لمە... ئیتر بەوەش دا ئەمانووت رەنگە ئەم شوێنەی ئێمەی لێ سجن کراوین نزیک مەرقەدەکەی (پێغەمبەر) بێتو خوا بەعیبادەت بۆمان حساب ئەکات... نزیکەی شەش مانگ بەو حاڵەوەماینەوە گەرچی رۆژانە لێی ئەمرد کەمی ئەکردەوە بەلاَم نازانم لەکوێوە خەڵکی تریان ئەهاورد هەر حەفتەی جارێك کۆمەڵێ تریان ئەهاورد دیار بوو نەیان ئەویست جێگای مردوەکانمان چۆڵ بێت.

نزیکەی شەش مانگ بەو شێوەیە ژیان بەرەسەر... بەخوا رۆژی واهەبوو هەر وەك تەعزیب ئەمانیان برد بەر ئەو خۆرەو بەچەند سەعات رامانیان ئەگرد یان پێمانیان پەتی ئەکردو بەپێی پەتی لەسەر ئەو چیمەنتۆ گەرمە ئەمانیان وەستان گەرمی ئەکێشتە ناو جەرگمان بەلاَم چی ئەکەیت... کوڕە بەهەزار جۆر ئەمانیان چەرساندەوە بەخوا تەنها شتێ ئێمەی هێشتۆتەوە نەیئەهێشت بمرینو بەرگەی ئەو هەموو عەزابەمان گرد تەنها ئومێدمان بوو کە بگەڕێینەوە وەتەنی خۆمان بمرین... تەنها ئەو ئومێدە بوو هێشتمانیانینەوە بەخوا دەیان شەو تابەیانی خەونە چۆتە چاوەو چاوم بەناو ئەستێرەکان داگێڕاوە.. بەڵکو ئەمە خوایە ئەستێرەیەك ببینمەوە لەولاَتی خۆیشمان بینبێتم بەلاَم ئاسمانەکەشی جیاواز بوو ئەستێرەکانیش

وەك ئەستێرەی وڵاتی خۆمان نەبوون ئەو لم و گەردەلولەی ناو عارەبسان ئاسمانیشیان ناشرین کردبوو بەرۆژیش ئاسمان وەك لای خۆمان شین و جوان نەبوو لێڵ و تاریك بوو ئیتر ژیانمان لەژێر ئەو ئاسمانە لێڵەدا ئەبردە سەر وەك ئەوە وابوو لەژێر خێوەتێك دابین.

گیانمان بەوەبوو هۆشمان بەخۆمان مابوو نازانم ئینسانیش بۆ وایە لەو کاتانەیا شتە کۆنەکانی ژیانی خۆتت زوو زوو بیر ئەکەوێتەوە بەم رۆژگارە دائەنیشتین بەسەر هاتی ژیانی خۆمان بۆیەکتری ئەگێڕایەوە لەوێ ئەمووت خۆزگا سەد خۆزگە یەك رۆژ (فتاح بەگ و حەمەی عیسا) کەهەردووکیان مستە شار بوون و ئەوان وایان لەئێمە کرد... تەنها یەك رۆژ بیانیان هاوردایەتە ئەم شوێنەی ئێمە سجن بونایا تابیانزانیایە ئەوەی ئەوان کردیان چی خیانەتێکی گەورە بوو هاوزمانی خۆمان و خەڵکی ناوچەکەی خۆمان بوون و ئەوان نەبوونایە حکومەت بەو ئەسانی یە نەیئەتوانی کون و کەلەبەری ئەو کوردستانە بگەڕێ و ئەو هەموو گەنجە جوان و جاهێڵە لەکونە تەیارەو لە ئەشکەوتەکان دا بدۆزێتەوە.

هەزار داڵغەی وامان لێ ئەداو خۆزگەی وامان ئەخوارد بەلأم هاوارو خۆزگەی ئێمە بەکێ ئەگەیشت، لەوماوەیەدا یەك دوجار هاتن ناومانیان ئەنوسی و ئیتر نەمان ئەزانی بۆچی یە..

رۆژێك هاتن کەوتنە ناونوس کردنی ئەوەی کە زۆر بەتەمەن بوو یان زۆرپەکی کەوتبوو هەر چەندە گشتی وەك قالۆرەی لێ هاتبوو بەلأم ئەوان لەناو ئەوەشدا ئەوانەی تەواو کەوتبوونە هیلاکەت ئەوانەیان نوسی... هەروا سێ و چوار رۆژێکی پێ چوو جارێکی تر هاتنەوە ئەو ناوانەی نوسیبوویان کەوتنە ناو خوێندنەوەی... هەبوو کە ناوەکەیان نوسی زندو بوو تاگەڕانەوە ناویان خوێندەوە چەند رۆژێك بوو سەگە رەش خواردبووی.

ئەوەی کەناوی دەرچوو بوو لەغورفەکان هاوردمانیانە دەرەوەو هەر لەناو حەوشەی قەلأکە رامانیان گردو چەند سەیارەیەکیان هێنا وەك ئەو سەیارانە وابوو کەهێنامانی بۆئێرە... لەوە ئەچوو هەر ئەو سەیارانەیش بووبێ...

نازانم بەڵام ئەمیش کەلە دەرگاکە ئەچویتە ژوورەوە کۆمەڵێ کورسی بەدوای یەکەوە بوون و کەپڕیان کرد دەرگاکەیان لێمان داخست خوا ئاگادارە بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە ناو ئەو سەیارەیە بووە نیوە شەو تاریک تاریک تەنیا کورسی‌یەکەی تەنیشت خۆتەوەت ئەبینی ئیتر هەمووی ڕەش بوو.

خستمانیانە ڕێ من لەسەعات و مەعات نازانم و نازانم چەنێکیش بەڕێوە بووین بەڵام لەناو ئەو سەیارەیە بەقەدەر ئەو شەش مانگە ڕەزا لەتمان بینی... هەر چەندە کەبردمانیشیان هەر بە سەیارەی وابوو بەڵام ئەوجا ئێمە ئینسانێ تر بووین ... گوڕوتینێکمان هەبوو بەڵام هەموو بەو شەش مانگە وەك مردوومان لێ هاتبوو تەنها بە ڕوح زندو بووین... بۆیە لەناو ئەو سەیارەیە دەقە بەدەقە زیاتر تەنگە نەفەس ئەبووین... ئەتووت دەستیان ناوەتە قوڕگمان، خەریك بوو بخنکێین... تاگەیاندمانیانە ئەوجێیە کەدامانیان گرد ڕەنگە بەقەدەر ئەو شەش مانگە تینومان بووبێ بەقەدەر ئەو شەش مانگە هەناومان وشکەوە بوو، ناو سەیارەکە زۆر زۆر گەرم و زۆر تەنگە نەفەس بوو..

نیوە شەو بوو گەیاندمانیانە شوێنێك دامانیان گردە خوارەوە کزەبایەکی فنێك و خۆش ئەهات یەکسەر زانیم وڵات خۆمانە... ئەوەندە دەمێکە بای خۆش و هەناسەی واسازگارمان نەدیبوو، درۆنی‌یە بڵێم لەگەڵ خۆی‌دا نیوەی خەم و خەفەتەکەمانی برد... ئەو شەوە لەوێ هێشتمانیانەوە مەعەسکەرێکی نزیك (عەربەت) بوو.

بۆبەیانی خستمانیانە ناو سەیارەی کۆستەرەوە بەرەو کەلار هاوردمانیانەوە ڕەنگ و ڕوومان واشێوا بوو لەڕێگە کەبەرەو کەلار ئەهاتینەوە هەر سەیارەیەك ئەیدا بەلا تەکمانا دا وەك ئەوەی عاجباتی بین نەفەرەکانی هەتا لێمان دور دەکەوتنەوە هەر سەیرمانیان ئەکردو لێمان ورد ئەبونەوە... ئێمە لەبەر ئەوەی کەشەش مانگ بوو هەر دەم و چاوی یەکتریمان لێوە دیار بوو هەستمان بەوە نەکرد بوو کەرەنگی مرۆڤمان لێ بڕاوەو شێوەی ترسناکمان گرتووە ئێ ئەو عەسکەرە مل قەوی و لچ

ڕەشانەش کەلە قەڵاکە بوون ڕەنگیان لە بەشەر نەئەچوو... هەر ئێمە لەوان باشتر بووین.

کاتێ گەڕاینەوە هاتینەوە ناو ئەو قلە کەس و کارەی کە ڕزگاری بووبوو ئەوکاتە هەستمان ئەکرد کەچۆن ڕەنگ و ڕوومان شێواوە منداڵ نەیئەوێرا بێتە نزیکمانەوە لێمان ئەترسان.

ئیتر لەوکاتە شەوە لێرە بەدەردەسەری و هەزار هیلاکەت ئەژیم... بەردەوام نەخۆشم.. گوێم گران بووەو چاوەکانم کزبوون و ئەژنۆکانم هێزیان لەبەر براوە.

پیاوەکەیشم کەئەو بەر ئەنفالەکە نەکەوتبوو لەخەفەت و مەراق دا نەخۆش کەوتبوو کەمن گەڕامەوە ئیتر ئەو مردو منیش هەر ڕۆژەم مردنێکەو بەردەوام چاوم هابە دەرگاوە بەڵکو ئەمە خوایە خەبەرێ ئەو گەنجانە بێت ڕۆژێك بێت بێنەوە..

**بەقۆناغە تفەنگ كەوتنە سەرو گوێلاكی ئەو خەڵكەو هەروا ژن بوو بەدەم لێدانەوە وەك مریشك مردارەوە بوو لەبەردەم پێیان دا ئەكەوت... كەوتنە تێهەڵدانی منالەكانیش..**

# نەزیرە حسین محەمەد

لەدایك بووی ١٩٦٦ گوندی حەفتا چەشمە- ناوچەی قەرە حەسەن..

ئەو كاتەی ئەنفالەكە بوو من پێنج شەش ساڵ بوو شومكردبوو بە (سەروەر محەمەد طە) لەگوندی سۆران‌و دوو منالم هەبوو پشتیوان كە نۆبەرەمان بوو لەساڵی ١٩٨٥ لەدایك بوو ئامانج لەساڵی ١٩٨٧.. حامیلەش بووم.. دونیا تەواو تێك چوو بوو. بیستبومان كە حكومەت جەیشی بردووە بۆ ئەو سەرەو هەرچی پێشمەرگەی ناوچەكەی ئێمەش هەبوو هەموویان چوو بوون بۆ بەرگری لەو ژورە.. لەسەر كردایەتی یەكێتی.. ئێمە خەڵكی لادێكان پێشمەرگەمان



زۆر خۆشدەویست‌و هەمویانمان بەكوڕو براو كەس‌و كاری خۆمان ئەزانی.. ئەوان ئێمەیان ئەپاراست لەتاڵانی‌و لەزوڵم‌و زۆرداری جێش‌و جاش‌و عەلی كۆیتەر.. چەندێ خەمی خۆمان بوو ئەوەندەش خەمی ئەوانمان بوو

بەردەوام بۆیان ئەپاڕاینەوە خوا ئاگای لێیان بێت و بەسەرکەوتووی و سەلامەتی بێنەوە..

ئەوەی هات و چۆی شاری ئەکردو ئەهاتەوە ئەیووت قووەتەکەی حکومەت لەکێشدا نی‌یە.. ڕۆژانە دنیایە جێش و جاشی تر ئەنێرێ.. هەروا قوات بوو بەرەو لای سلێمانی‌یەوە بەڕێ ئەخرا.. زۆر ئەترساین کەئەگەر پێشمەرگە بشکێ، ئیتر حکومەت دەستمان لێ ناپارێزێ و ترسی پێشمەرگەی نەبێ (ئیبادە)مان ئەکات.. بەخوا بەو دەردەمان ئەبات کەئەڵێن لەساڵێ (بەعسی‌یەکە) هەرچی دێهات هەبوو تالانیان کردوەو عارەب هاتووە ئەڵێن (گوارەیان لەگوێی ژن داکەندووە)..

ئیتر ماوەیەکی پێ چوو دەنگ و باس لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە کەحکومەت هەموو ناوچەکانی گرتووەو پێشمەرگە شکاوەو دێیەکانی هەموو سوتاندووەو خەڵکەکەی گشت گرتوەو ئەڵێن خەڵکەکەی بردوە بۆ شار.. یەکێ ئەیووت ئەڵێن لەشار خانوویان بۆ ئەکەن.. یەکێ ئەیووت ئەڵێن هەموویان لەدایرەکان تاعین ئەکەن.. یەکێ ئەیووت ئەڵێن هەمووی ئەبات بۆ ناو عارەبسان.. هەریەکی قسەیەکی ئەکرد.. خەڵك ئەترسا و ئەیانووت تازە حکومەت مادام بەسەر پێشمەرگەدا زاڵ بوو بەخوا هەموو کوردستان کاول ئەکات و ئەمانبات بۆ حدودەکان ناو عارەب..

ئێ باشە ئەم حکومەتە بۆ وامان پێ ئەکات ئەم میللەتە فەقیرە چی کردووە.. ئێ وائێمە خراپیش بووین ئەی ئەبێ ئەم حکومەتە دڵی نەبێ..؟.. ئەی کێ فەلاحەتی بۆ بکات، ئەی گەنم نەبێ خۆ ئەو خەڵکە لەبرسا ئەمرێ..؟ پێشمەرگەکانی ناوچەکەی خۆمان ئەوەی مابوو گەڕایەوە بە وەزعێ خراپەوە هەموو سەرو ریش هاتوو پەشۆکاو.. پەرتەوازە.. تێك شکاو.. ئیتر خەڵکەکە ئەوانی بینی ئەوەندەی تر تۆقین و هیچ ئومێدێکمان نەما.. ئێمە هەموو پشت و پەنایەکمان خواو پێشمەرگە بوو.. ئێ واپێشمەرگەمان بەو حاڵەوە بینی بێ ئوومێد بووین.. ناشوکری خوا نەبێ ئیتر پەنامان قاپی خوا بوو..

کاتێ بەسەر هاتی ئەو زۆرەو دێهاتەکانیان گێرایەوە ئەم حکومەتە زاڵمە چی بەو خەڵکە فەقیرو هەژارە کردووە.. ئیتر بەجارێ تۆقین..

هەروا چەند رۆژێکی پێ چوو هەواڵ لەشارەوە هات کەحکومەت لەهەموو لایەکەوە جەیشی خڕ کردۆتەوە سەر ناوچەکەی ئێمەش و پەلامارمان ئەدات و ئەیانووت (تەوقی مەنتیقەکەی کردوە) رێگای دەرباز بوونی لەهەموو لایەک بڕیووە.. کۆپتەر بێ ترس و وەک رەوە کۆتر بەئاسمانەوە ئەهاتن و ئەچوون.. ئەیانووت قوات ئەبەن لەسەر شاخەکان و لەسەر رێگا سەرەکی یەکان دایان ئەمەزرێنن، تا نەیەڵن کەس دەربازی بێت و هەمووی بگرن..

سەرەتای بەهارەو هەموو مەڕو ماڵاتمان تازە بەری لێ کەوتۆتەوەو خۆمان ئامادە کردبوو بۆ درەوو دەشت و دەر.. کێ بەتەمای ئەو رۆژە بوو.. کێ ئەیزانی بەو دەردە ئەچێت.. ئێمەش ئەمانووت لەترسی پێشمەرگە نەبێ جێش و جاش دێن و تالانمان ئەکەن.. چوزانین ئەمجارە هەر ماڵ تالان ناکەن و خۆیشمان بەتالانی ئەبەن..

تەق و تۆق دەستی پێ کردبوو.. بەشەو لەترسا ئەچووینە ناو ئەو کەلۆزو چەم و دارانە خۆمان ئەشاردەوەو ئەمانووت ئەدەنە سەر ئاوای‌دا.. زەلامەکانیشمان ئەچوون لەو ئەشکەوت و کونە تەیارانەدا کەزووتر لەترسا و بۆخۆپاراستن دروستمان کردبوو، خۆیان ئەشاردەوە.. بەڵکو ئەمە خوایە ئەگەر جێشەکەیش هات کەهەر ژن و منداڵ لەئاوای بین، بەزەییان پێماندا بێتەوەو وازمان لێ بێنن.. ئەمانزانی جەیشەکە تەواو لەئاوای ئێمەیش نزیک بووەتەوەو دێیەکانی تریان گرتووە.. لەترسا زەلام ئاوای چوونە هەردەو هەڵەتەکان و ئێمەیش لەئاوای ماینەوە..

جەیش و جاش دابارینە سەر ئاوایی وەک ئەوەی کورەیان لەدارا دۆزیبێتەوە..

لەپێش هەموو شتێکدا کەوتنە ناو کەل و پەل ناوماڵ و کەوتنە تالانی.. لەماڵەکاندا هەرچی وەکەڵک ئەهات بردیان و ئەیانخستە ناو سەیارەی

خۆیانەوە.. خۆشمانیان گشت لەناو ئاوای خڕ کردەوە بەڵام هەموو هەر ژن و منداڵ بووین و یەك زەلام لەئاوایدا نەمابوو هەمووی لەهەردەکە خۆیان شاردبۆوە قسەیان بۆمان کرد ووتیان بچن زەلامەکانتان بهێننەوە.. عافواتمان بۆیان وەرگرتووە.. ئێمە سیقەمان بەحکومەت نەبوو، ئەمانزانی ئەگەر پیاوەکانمان بدەین بەدەست جەیشەکەوە وەك ئەوە وایە بەرخ بدەیتە دەم گەلە گورگەوە..

بەڵام (حەسیب حەمە ئینجە) لەو قەومێلەی خۆمان بوی موستەشار بوی.. ئەو وتی بچن هەر کەس زەلامی خۆی بێنێتەوەو تەسلیمی دەستی منی بکەن. من خۆم کەفالەتیان ئەکەمو عافواتم بۆیان وەرگرتووەو ئەیانبەمو ئەیانهێنمەوە.. بەو شێوەیە هەڵمانیان خەڵەتان و چووین هەرکەس زەلام خۆی لەکونە تەیارەو بن کەلوەزەکاندا هێنایەوەو دامانە دەست (حەسیب)ەوە برا رۆژە رەشێ بوو لەترسا هۆشمان بەخۆمان نەمابوو هیچ چارەیەکی تریش نەبوو هەر ئەبوو وابکەی!.. قەناعەتیشمان بەو قسانەی (حەسیب)کرد ووتمان بەراستێتی و تۆ بڵێی درۆ لەگەڵ ئەم هەموو خەڵکەی ئاوای بکات.. ئێوا درۆشی کرد ئەی تۆ بڵێی غیرەتی قبوڵ بکات ئەو هەموو گەنجە جوان و جاهێڵە کەگشتی هاوزمانی خۆی بوون، عەسکەری تەعدایان لێ بکات..!

ئێمە چوزانین ئەمە فێڵەو حکومەت ئەم جاشێلەی بۆ ئەوە هاوردوە تا وەفێڵ هەموو خەڵکەکە لەسەر سیقەی ئەوان خۆی بات بەدەستەوە..

هەر دوای ئەوەی زەلامەکانمان هاوردەوە.. ئیتر چوار دەوری خۆمان و زەلامیان گردو وەك رەشە ولاخ دامانیانە پێش و بەبەر چاوی خۆمانەوە شۆفلیان خستە ئاوای و ماڵەکانمانیان تەخت کرد.. وەرە خۆت رەزیلبە بەدەست زاڵمەوەو وەبەر چاوتەوە ماڵە کەیشت تالان بکەن و خانووە کەیشت بڕوخێنن..

بەپێ هەموو مانیان دایە پێش، منداڵەکان پرسیاریان ئەکرد دایە بۆ کوێمان ئەبەن.. بۆ وامان لێ ئەکەن، هیچ جوابێکمان پێ نەبوو.. ئێمەش وەك

منداڵەکان لەبەر خۆمانەوە ئەو پرسیارەمان ئەکرد.. بەڵام کێ هەیە جوابت بداتەوە.. جوابی چیان پێیە.. بیانوویان چی بوو وامان لێ بکەن.. مەگەر تەنها زاڵمی خۆیان بێت.. ئەگینا کێ دەستی تێ ئەچێ مەملەکەتێك سەرگەردان بکات.. ماڵو ملکی خەڵکی بەتاڵان بەرێت، ئاوای یەکەی بڕوخێنێ.. بەخوا کەبە شۆفڵ خانووەکانیان ئەڕوخان.. چەند ماڵ هەبوو مەڕو ماڵاتەکانیان لەژوورەوە بوو.. ئەوەی جاش بردی بەتاڵانی بردی، ئەوەی جێ مابوو بەشۆفڵ پشتیرەکەیان ئەروخاند بەسەریاندا.. کارو بەرخ کۆڕپە.. قەلو مریشك.. جوجك.. کورە نازانم چی تر بڵێم هەموویان کردە ژێر خۆڵەوە.. ئاخر ئەگەر ئێمە خۆیشمان تاوان بارین ئەو بێ زمانانە تاوانیان چی بوو.. قاژەی جەرگمان ئەهات.. بەڵام دەسەڵاتیش نەوی چی ئەکەی.. ناشووکری خوا نەبێ، کێ هەبوو قسە بکات.. هەموو دیلو رەزیل بووین.. بەو شێوەیە گەیاندمانیانە سەر جادەی مەحمود پەریزا.. هەموو خەڵکی ئاوای پێکەوە بووین.. لەسەر جادەکە وەستانمانیانو دەورمانیان گرتبوو. بان هەموو قوتەو گردە بەرزەکان عەسکەریو جاش گرتبووی.. زیل عەسکەری ئەهاتو ئەچوو.. کۆپتەر بەئاسمانەوە حیمایەی ئەکرد..

ئەوەندەی پێ نەچوو بینیمان وا خەڵك ئاواییەکانی تریشیان بڕبڕ هاورد.. لەهەموو شیوو دۆڵێکەوە دوکەڵ هەڵئەسا.. ئاگریان نابووە پاشماوەی خانووە روخاوەکانیشەوە..

ئەو عالەمەیان لەو سەر جادەیەیەی (مەحمود پەریزا) خڕکردەوە.. خوایە گیان ئەبێ چیمان لێ بکەن.. تازە وادێ یەکانیان روخانو مەڕو ماڵاتیشیان دایە پێشو بردیان.. یەعنی نامانگەڕێننەوە بۆ ئاوایی.. ئەی ئەم هەموو خەڵکە چی لێ ئەکەن بۆ کوێمان ئەبەن.. لەکوێ جێی ئەم هەموو خەڵکە ئەبێتەوە.. وەڵا مەگەر بمانخەنە ناو (بەحرەوە) یان بمانخەنە ژێر خۆڵەوە.. ئەو عالەمە لەشاردا لەکوێ جێی ئەبێتەوە.. جاشەکان پێمانیان ئەوت ئەتانبەین بۆ شارەکان حکومەت خانووتان ئەداتێ.. ئەی ئەگەر وایە ئێمە خانووی چۆڵو هۆڵ چیلێ بکەین، ئەی بۆ نەیان هێشت کەلو پەلی ناوماڵو

هیچ نەبێ هەندێ بەتانی و دۆشەکە شڕ لەگەڵ خۆمان بهێنین.. خۆ حکومەت بـەتانی و جێوبانمـان نـاداتێ.!؟ قـەت بـاوەڕ ناکـەم، ئـەو کاتـە لـەئاوای خسـتمانیانە ڕێ سـەد نووکـە شـەقیان لـەوژن و منالآنـە هـەڵداو بێـەدار کەوتبوونە ناومان، خێرە خانوو بەتانی و جێ و بانمان بدەنێ..!!

قـەدەرێ زۆر لـەویا هێشـتمانیانەوە.. تاخـەڵکی ئـاوای یـەکانی تریـان هـەمووی هـاووردو قافڵەیـەکی زۆری سـەیارەیان هێنـا. هـەندێکیان زیلـی عەسکەری بوون و ئەوەکان سەیارەی کۆستەر بوون.. هەرچی زەلام هەبوو خستیانە ناو کۆستەرەکانەوەو خستیانە ڕێ .. ئێستا چەند بەئاسانی بۆتی ئەگێڕمەوە ئەڵێم زەلامەکانیان خستە کۆستەرەوەو بردیانیان.. ئەگەر ئەزانن بەچی حـاڵێک و بـەچی وەزعێک لەیـەکتر جیامانیـان کـردەوە.. پیاوەکانمـان ئێمـە یـان جـێ نەدەهێشـت.. بەقۆناغە تفەنگ ئەکەوتنـە سـەرو گوێلاکیـان و بەپـەل ڕاکێشـان لەیـەکترمانیان جیـاکردەوە.. منـاڵ ڕای ئـەکرد بـۆ لای پیاوەکـان. جوندی ئەیدایـە بەر شـەق و بەگوێ ڕاکێشان ئـەیان کـردەوە نـاو ژنـەکان.. منـاڵ وابـوو شـەڕواڵەکەی بـاوکی گرتبـوو بـەری نـادا. عەسکەریەکانیش پـەلی باوکیان ڕائەکێشا.. ئـەو منالـە بەسـەر زەوییەکـەدا ئەخشا ئەتووت بە حەبل بەستووتە پای باوکیەوە واخۆی پێوە نووساند بوو لێی نابووەوە..

بەچی پەت پەتی یەک لەیەکتر جیامانیان کردەوە.. قیژەو هاواری منال و ڕۆڵە ڕۆی پیرە ژنەکان گاوری موسوڵمان ئەکرد.. بەلآم ئەم زاڵمانە گاوریش نەبوون گەلێ بێ ڕەحم بوون..!!

بەبەرچاوی خۆمانەوە ئەوانیان خستە نـاو سـەیارەی کۆسـتەرەکانەوە.. گشـتیان ملیـان لەجامەکانـەوە دەر کـرد بـوو خواحافیزیـان ئـەکردو ئـەتووت ئەزانن کەئیتر قەت یەکتری نابینینەوە..!!

تاکۆسـتەرەکان لـەچاو وون بـوون ئـەوان هـەر ملیـان بـەدواوە لەئێمـەیان ئەڕوانی و ئێمەش هەموو چاومان بەدوای ئەوانەوە بوو.. ئەوە دوا دیدارمان بوو..

پاشان ئێمەشیان هەر بەپاڵ خستە ناو زیلە عەسکەریەکانەوە.. زیلەکان بەرز بوون نەپەیژەی هەبوو نەهیچ لەترسی ئەوەی قۆناغە تفەنگت بەر نەکەوێ زوو خۆمان پیا هەڵئە پژان و سەر ئەکەوتین.. پیرەژن و پەککەوتەی وابوی.. بەهەزار هیلاکەت و بەباڵ راکێشان سەرمان ئەخست... هەر زیلەی نازانم بێژم چەندێکیان تێ کرد.. ئەوەندەیان تێکرد بوو هەموو وەك مەڕو بەرخ بەسەر یەکدا کەوت بووین.. هەر سەیارەی دوو عەسکەر بەتفەنگەوە ئەملاو ئەو لامانیان گرتبوو.. گشت ئەو خەڵکەیان بار کردو بەقافڵە سەیارەکانیان خستە رێ. بەلآم بەو رێگەیەدا نەرۆیشتن کە پیاوەکانیان پیابرد. کەئەوانیان برد ئێمە یەخەی جاشەکانمان ئەگردو ئەمان ووت ئەی ئێوە نەتان ووت عافواتمان بۆیان وەرگرتووەو هیچیان لێ ناکەن.. ئەوان جوابیان ئەوە بوو ئەیان بەنە لەیلان و دوای (٥)رۆژ ئەیانگەرێننەوە..

کەئێمەشیان خستە رێ هەر چۆنێك بوایە گەر بەدوای زەلامەکاندا بچوایاین باشتر بوو بەڵکو ئەگەر بۆ سجنیشە پێکەوە بین..

کەچی ئێمەیان بەرەو چەمچەماڵ هاوردو کۆمەڵێ سەیارەی عەسکەری تر بوونە حیمایەمان و کۆپتەریش بەبان سەرماندا دێت و دەچێت ئەتووت رەسمان ئەگرێ ئەوەندە نزم ئەبودەوە خۆی لار ئەکردەوە بەبانماندا ئەترساین باڵەکانی بەرمان کەوێت.. نازانم بەخوا چەند سەعات بەرێوە بووین و چەند سەعات بوو لەو هەردەیا مابووینەوە بەلآم کەگەیشتینە چەمچەماڵ نزیك خۆر ئاوا بوون بوو.

لەبان مەقانەوە شۆڕمانیان کردەوە بەرەو ناو چەمچەماڵ ئەو رێ و بانە هەمووی عەسکەری گرتبووی تاناولیواکەی چەمچەماڵ.

کاتێ گەیمانە ئەوێ، سەیرمان کرد دنیایە خەڵك لەوێیە.. کەتەماشای ئەو حەشاماتەت ئەکرد، ئەتووت رەنگە یەك کوردێ تر نەمابێ هەمووی گیراوەو والە چەمچەماڵ خڕ کراوەتەوە..

ئێمەشیان خستە حەوشەی لیواکەی چەمچەماڵەوە چوار دەوری تەلبەند بوو هەمووی عەسکەری دەوری گرتبوو.. پڕ کرابوو لەژن و منداڵ و زەلام..

دیار بوو ئەو خەڵکەی تر وەك ئێمە هەر لەدێ یەکەی خۆیان زەلامەکانیان لێیان جیانە کردبۆوە.. چونکە زۆربەی ئەو خەڵکە عایلەی پێکەوە بوون.. لەوێدا ئەوەندەی تر برینمان قوڵ بووەوە. کەئەمان بینی ئەو خەڵکە ژن و منال و پیاوەکانیان پێکەوە بوون.. کورد ئەڵێ شین لەگەڵ هاوماڵدا جەژنە.. بەلاّم خەفەتمان لەوە ئەخوارد کەئێمە پیاوەکانمانیان هەر لەئاوایدا لێمان دابڕی و گەر هەرسجن و بۆ مردنیش بوایا پێکەوە بووینایە خۆشتر بوو..

ناو لیواکە ئەوەندەی خەڵك لێ بوو لەحساب نەئەهات گەر منالێکت لەدەست بەر بوایا نەت ئەدۆزییەوە..

تا شەو لەناو لیواکەی چەمچەماڵ هێشتمانیانەوە.. بەلاّم پەیتا پەیتا خەڵکی تریان ئەهێناو هەڵیان ئەڕشت.. شەو کۆستەریان هاوردو ئەو خەڵکەیان بەریز بار کرد.. بەلاّم بارکردنی چی لەدەلاوە باریان ئەکردو سەیارەکانیان ئەخستە رێ و هەر تەواو نابوو.. نیوە شەو بەرمان کەوت و ئێمەیشیان بارکردو خستمانیانە رێ بەرەو کەرکوك..قافڵەیەکی گەڵێ زۆر بووین سەرێکی سەیارەکان گەیشتبووە بان مەقان هێشتا دوای یەکەی هەرلەناو لیواکە بوو..

هەر شەو گەیشتینە کەرکوك و بردمانیانە شوێنێ وتیان ئەمنی کەرامەی کەرکوکە.. دوو سەعات نەیان هێشت لەناو سەیارەکان دابەزین و هەر وەستانبوومانیان.. نازانم بەتەمای چی بوون.. دوای ئەو دوو سەعاتە خسیمانیانەوە رێ.. دەمەو بەیان گەیشتینە مەعەسکەرێکی گەورە.. درۆنییە ئەگەر بڵێم لەسەعاتێکدا سەد سەیارە خۆی پیا ئەکردو سەد سەیارە ئەڕۆی.. دامانیان گرد.. هەرچەندە تاریك بوو بەلاّم لەبەر لایتی سەیارە مەعەسکەرەکە روناك بوو بووەوە.. لەبەر خەڵك هەر رەشی ئەکردەوە قاعەیەکی زۆری لێ بوو.. کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکیش دانرا بوون و عەسکەر بەدەوریانەوە بەتفەنگەوە وەستا بوون. کە دونیا روناك بووەوە تەماشامان کرد چی حەشاماتێکە، (دار هەڵدەی بەزەوی ناکەوێ).. ریز ریز زەلام دانرابوون گشتیان سەریان شۆڕکرد بۆوە باوەشیان.. لەشوێنێکی‌تر

ئەتبینی وا بەکۆمەڵ خەڵك ئەبەنە ناو قاعەوە لەلایەکی ترەوە خەڵکیان لەسەیارە دائەگرد.. لەلایەکی ترەوە باریان ئەکرد.. ئەتووت قیامەت هەستاوە.. وڕوکاس بوو بووم هەر حەپەسا بووم.. خوایە ئەمە چییە.. لەناو ئەو خەڵکەدا چاوم ئەگێڕا بۆ باوك منالەکان ئەمووت بەڵکو ئەمە خوایە ئەویش لێرە بێتو خۆئەگەر نەشیەڵن تێکەڵ مان بێتو بەیەك بگەینەوە.. لەدووریشەوە بێت هەر چاوم پێی بکەوێت... بەناو ئەو خەڵکەدا هەر چاوم ئەگێڕاو منالەکانیشم لەخۆم زیاتر تامەزرۆی باوکیان بوون لەترساو لەدڵە راوکێی خۆشماندا ئەمزانی ئەوانیش خەمی باوکیانەو کە ئەو زەلامانەیان ئەبینی لێیان ئەپرسی دایە کوا باوە.. ئەم رۆڵە دایە کوێرای دایە.. خوا ئەزانێ کواباوکتان.. خوا ئەزانێ خۆیشمان چیمان بەسەر دێ... لەکۆمەڵێ شوێن خەڵکیان ریز ئەکردو بەسرە ئەتیان بردە لای دەفتەر بەدەستێ لەسەر مێزێكو کورسی یەك دانیشت بوو.. تەحقیقی ئەکردو کوردێکیش (تەرجومانی بوو).. پرسیارەکانی ئەکرد بەکوردیو قسەکانی ئێمەیشی ئەکردەوە بەعەرەبی.. زۆر پرسیاریان ئەکرد. ناوت چییە.. خەڵکی کوێی.. مێردەکەت ئیشی چی بووە.. چەند کەست لەگەڵ خۆت گیراوە.. ئەی خێزانەکەتان چەندی نەگیراوە.. ئەوان لەکوێ بوون وانەگیراون.. کورە نازانم بڵێم پرسیاری چیان ناکرد.. پاش ناو نوسینەکە ئەتیان بردە قاعەکانەوە.. نازانم چۆن فریای ناونوس کردنی ئەو هەموو خەڵکە ئەکەوتن.. خۆزگە ئێستا ئەو دەفتەرانەتان پەیا ئەکرد کەناوی ئەو عالەمەی تیا نوسرا بوو (ئەوسا ئەتانزانی چەند کەس قوڕ کریاوە سەریا)..

ئێمەیان کردە ناو قاعەیەکەوە.. ئەوەندەیان تێ ترنجان هەموو وەك لاشەی مردوو کەوتبووینە سەر یەکدا.. ئیتر هەر خەریك بوو بتاسێین.. هەر چەندە بارانیش ئەباری بەڵام لەتینوا خەریك بوو کوێر ئەبووین نازانم هی ترسەکەمان بوو چی.. قوڕگمان بەردەوام ووشك بوو..

ئیتر رۆژی هەندێ سەموونو ئاویان ئەدایێمان.. نیوەی ئەو خەڵکە بەری نەدەکەوت.. رەزالەتێك بوو یاخوا گاوریش وای بەسەر نەیات.. ئەیانووت ئەمە مەعەسکەری (تۆبزاوایە)..

لەپەنجەرەی قاعەکەوە سەیری دەرەوەمان ئەکرد تاچاو بڕی ئەکرد هەمووی هەر خەڵكو سەیارەو قاعە بوو.. ئەمانبینی چۆن زەلامیان جیا ئەکردەوەو باریانیان ئەکرد.. وەجبەی وا هەبوو دەستو چاویان بەپیشتوێنو جامانەکەی خۆیان ئەبەستەوەو ئەوجا باریانیان ئەکرد.. ئیتر مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ بۆ کوێیانیان ئەبرد.. رۆژی دووسێ وەجبەیان ئەهاووردو جیایانیان ئەکردەوەو زەلامەکانیان ئەبرد..

رۆژێ هاتنە قاعەکەی ئێمەیشو ریز بەریز وایان لەهەموو قاعەکانیش کرد.. کەوتنە ناو ئەو خەڵکەو هەرچی زەلامێ کەگەنج بوو گشتیان جیاکردەوەو بەپەل راکێشان لەناو قاعەکاندا بردیانیانە دەرەوەو هەر لەبەردەم قاعەکەدا چاومان لێ بوو ئەیانیان خستە ناو سەیارەی موقەپەتەوەو ئەیانیان برد..

رۆژێ دوای ئەوان هاتن کەوتنەوە ناو ئەو خەڵکە ئەمجارە هەرچی پیرێژنو ئەو پیرە مێردانەش کەمابوونەوە هەموویانیان برد وتەنیا ژنو منداڵو کچە عازەبەکان مانەوە..

دوای ئەوەی چوار شەو بوو لەوێ بووین.. شەوی پێنجەم لەنیوە شەودا هاتن کەوتنەوە ناو قاعەکەمانو منداڵیان جیاکردەوە لەسوچێکی قاعەکەوە.. بووە زیرو هاوارێ هەر مەپرسە...

قاپی قاعەکەیان کردەوەو ویستیان منداڵەکان بەرنە دەرەوە، ئێمەیشو منداڵکانیش کردمانە هەرایەك مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ.. گشتمان هەڵمان کوتا بەرەو لای منداڵەکان لەتاو جەرگمان ئاگامان لەزوڵمو زۆری ئەوان نەما بوو، ترس لەچاومانا نەما پەلامار عەسکەرەکانمان ئەدا.. بەقۆناغە تفەنگ کەوتنە سەرو گوێلاکی ئەو خەڵکەو هەروا ژن بوو بەدەم لێدانەوە وەك مریشك مردارەوە بوو لەبەردەم پێیان دا ئەکەوت... کەوتنە

تێهەڵدانی منالەکانیش.. ئەوەی کەمێ هەراش بوو بەپاڵو تێهەڵدان بردیانیانە دەرەوەو کۆرپەکانیش ئەیانکرد بەپەلیان داو ئەیانبرد.. کەوتنە ناو منالْ، شیرە خۆرەی بەرمەمکەشیان برد.. من خۆم دوو منالم پێ بوو پیشتیوانو ئامانج. گەورەکەیان ٣ ساڵان بوو ئامانجیش تەواو پای نەگرتبوو بردیانیان.. هەر هارو شێت بووین لەتاوا.. بەخوا بەهەرچی عەزابی هەموو تەمەنە ئەوەنەی ئەو شەوە ئازارمی نەداوە.. گشت ئەو ژنێلە وەك شێتمان لێ هاتبوو.. شینو واوەیلامان دینای هەراسان ئەکرد، ئاهو نزو لەمان گەیشتە کە شکەلانی فەلەك..

دیار بوو منالەکانیشیان زۆر لەخۆمان دور نەخستبووەوە یان قیژەو هاواری منالی قاعەکان تر بوو چونکە گوێمان لەگریانو هاواری منالە کانیش بوو.. تابەیانی هەر دوو لامان هاوارمان بوو.. ژن واهەبوو تابەیانی ١٠کەرەت بوراوەتەوە لەتاو جەرگەکەی..

ئیتر نازانم خوای ئێمە بوو هاتە جوابو نای لەدلی سەدام.. نازانم قەرارەکە گۆڕا.. نازانم یان هەر بۆ عەزاب ئێمە بوو ئەو شەوە منالەکانیان برد.. دەمەو بەیان بەقیژو قاو منالەکانیان هاوردەوە.. منالْ چی منالْ کەسی هێز لەبەدەنیا نەمابوو.. هەر عەسکەرێ دوو سێ منالْ بەپەلێوە بوونو کەدەرگای قاعەکەی ئێمەیان کردەوە فڕێیانیان دایە ژورەوە..

گشت ئەو ژنێلە هەڵمان کوتایە سەر منالکاندا، هەر کەس لەتاو جەرگەکەی خۆی هەر تەکانمان ئەدا خەریك بوو هەر نیوەیان بکوژین لەژێر پێی خۆماندا..

منالْ وەك چۆلەکەی ناو ئاو هەڵئەلەرزین، بەو خوایە هەیانە لەو شەوەوە تا ئێستا (ماتە)و رەنگە بلێم نەهاتۆتەوە هۆش خۆی..

بەیانی دوای عەسرەکەی هاتنەوە.. هەر کەهاتنو زرەیان لەقاپی قاعەکە هەڵئەسان هەموومان وەك ئەوەی گوللەمان پێوە بنێی ئەوەنە ئازار ئەکەوتە جەرگمانەوە.. ئەوەنە ئەترساین چونکە زالم بوونو هەر کەهاتن ئەبوو خۆمان حازر کەین بۆ شتێ خراپتر.. کەوتنەوە ناو نوسین کردمانو شەو

کەتاریك داهات بەپێی ئەو ناونوسینە ریزمانیان کردو کۆمەڵێ لۆریان هاورد بوو بارمانیان کرد لەلۆری و خستمانیانە رێ..

سەعات و مەعات نازانم بەلأم هەر شەو بوو بەخوا ئەوەنەیشی پێ نەچوو گەیشتینە مەعەسکەرێکی تر ئەویش گەلێ گەورە بوو هەمووی تەلبەند بوو قاعە بەدوای یەك دا دروست کرا بوون.. بردمانیانە ئەو مەعەسکەرە (دوبز) بوو...

هەر قاعەی رەنگە بلێم (٣٠٠) کەسیان تێ کردبێ بەس ژن جگە لەمناڵ.. جێ و رێمان گەلێ تەنگ بوو.. رێگەمان نەبوو پێ درێژبکەین.. بڕوا بکە ئەبوو بونۆرە رابکشێن و بخەوین..

لێرە لەچاو (تۆبزاواوە) باشتر بوو.. رۆژی ٢جار خواردنمان هەبوو بەلأم خواردنێکی خراپ کەئەگەر خەڵك ناعیلاج نەبوایا نەیئەخوارد.. سەموونی رەق و ئاوی گەرم.. چەند رۆژ جارێك هەندێ شۆربایان ئەدا پێمان و رۆژی جارێکیش رێگایان ئەدا بچینە سەر ئاو..

بەلأم (ئەسپێ) زۆر سەغڵەتمانی کردبوو بەسەر لەشماندا رێی ئەکرد.. بڕوا بکە هەر خەریك بوو چاومان دەرکات.. قوتوە ئاوەکەت دائەنا بیخۆیتەوە، پڕی ئەبوو لە ئەسپێ (مۆرانە)... نەخۆشیەکی زۆریش بلأو بووەوە.. نازانم لەچییەوە توش بووین لەچەند رۆژێکدا هەموری گرتی.. بەتایبەت منال، زۆربەی منال تووشی ئەو نەخۆشی یە بوون و زۆریانی کوشت.. لەچەند رۆژێکدا ئەوەندە ئەرشانەوەو تووشی سك چوون دەبوون تا وەك قالورەیان لێ دەهات و دەمردن.. ئەو هەموو رشانەوەو پیسیەش هەر لەناو قاعەکەدا بوو بۆن و بەرامەی ئینسانی ورو کاس ئەکرد.. من خۆم لەو قاعەیەی (دوبزەوە تووشی نەخۆشی رەبۆ بووم) تائێستا هەرچاك نەبوومەوە... زۆر کەس بەو حاڵەوە مرد.. کەیەکێکیش دەمرد دەبوو لەپەنجەرەکەوە بانگ لەحەرەسەکان بکەین و پێیان بلێین خەڵکمان لێ مردووە.. ئیتر ئەهاتن و لەقاعەکە دەریان دەکردو ئەیانخستە سەر عارەبانەیەکی دەستی و دەیان برد.. بەخوا جاری وابوو بینیوومە چوار پێنج

جەنازەیان خستۆتە سەر عارەبانەیەك و بردوویانە. ئیتر مەگەر هەر خواو خۆیان بزانن چیان لێیان ئەکرد.. نازانم ئەیانیان کردە ژێر خۆڵەوە یان نا.!؟

ئیتر ئەوەی کەنەشمردایا وەك مردووی لێ هاتبوو.. گشتمان رەنگی مردوێتیمان لێ نیشتبوو.. بەتایبەت مناڵەکان.. بەخوا ئەگەر جەرگ خۆمان نەبوایا بڕوا بکە نەمان ئەوێرا سەیریان بکەین.. (هەر پێستەیەکی رەش و چوارقل ئێسقان بوون) چاویان چوو بووە قولاّو ئەتووت خوێنی تیا زاوە.. سەرباری ئەو حاڵەیش من (دوو گیان بووم)و هەروا دوو مانگ ئەبوو نابوو گەیشتبووینە ئەوێ هەر لەناو قاعەکە وابزانم لە ٦/١٠ بوو ژانی مناڵ بوون گرتمی.. دەوەرە بەو حاڵەوە مناڵت بێت بەو برسێتی و نەخۆشی و خەم و خەفەتەوە.. نەپەڕۆیەك هەبوو نەهیچ هیچ... کورە هەر ناموسمان چوو.. کەجوندیە عارەبەکانیش گوێیان لەقیژو قاومان ئەبوو لەکاتی مناڵ بووندا ئەهاتنە پەنجەرەکان و سەیرمانیان ئەکرد.. من کەمناڵەکەم بوو بڕوا بکە هیچ نەبوو بەبەرد ناوکیمان بڕی.. وەرە ئەو هەموو خوێنەت لێ بڕواو ئاوێ نەبێ نانێ نەبێ بیخۆیتەوە وەلاّ نازانم هەر لەخواوە نەمردم...

مناڵەکەم ناونا (غەمبار) چونکە ژیانمان هەمووی غەم و خەفەت بوو ووتم ئەگەر خوای کرد ئەم مناڵە نەمردو مایەوەو گەر خۆیشمان مردین بائەم هەڵگری خەمەکانمان بێت..

پێنج مانگ لەوێ هێشتمانیانەوە.. بەلاّم هەر چوار پێنج رۆژ جارێك ئەهاتن وەجبەیەکیان ئەبردو کەس نەی ئەزانی بۆ کوێیان ئەبەن.. هەموو جارەکانیش بەشەو ئەیانیان برد.. ئەمانزانی ئەوان ئەبەن نەجاتیان ئەبێ.. چونکە ژیانمان ئەوەندە ناخۆش بوو مردنمان بەنەجات بوون ئەزانی و خۆزگەمان بۆ مەرگ ئەخواست.. ئیتر جاروایە مرۆڤ حەز ئەکات بمرێ مردن نایات و کاتێ حەزیشی لەژیانە رێت پێ دەگرێت..

کەوەجبەیەکیان گواستەوە ژنێك تازە مناڵی بوو بوو ژنەکە ناوی (کەژاڵ ئەحمەد تایر)بوو مناڵەکەی کچ بوو ناوی نابوو (نیان) کەسەیارەیان هاوردو باریانیان کرد ئەو ژنە مناڵەکەی لەقاعەکەدا بەجێ هێشت.. کورە نازانم پەت

پەتی چی بگێڕمەوە.. بەخوا لەئێستاوە تاسـاڵێکی تـر قسـەتان بـۆ بکـەم بەسەر هاتی تۆبزاواو دوبز تەواو نابێ..

دوای ئەو پێنج مانگەو کەهەر جارەی قاعەیەکیان ئەگواستەوە سـرەی قاعەکەی ئێمە هاتبوو لەگەڵ بێزاریو خۆزگە بەمەرگ خواستنیشدا لەدەمو چاوی هەموو خەڵکەکەوە پێوەی دیار بوو کەئەو چەند رۆژەی زانیبوومان نۆرەی قاعەکەی ئێمەیە هەموومان ئەترساین.. مردن سـامی گرانـە چـەند خۆزگەشی بۆ بخوازی کەهەست بکەی واڵێ نزیك دەبیتەوە لێی ئەترسی..

خواکردی رۆژێك پێش ئەوەی نۆرەی گواستنەوەمان بێت. کاتی نیوەڕۆ بوو عەسکەرەکان هاتن پێمانیان ووت ئێوە شانستان هەیە.. عەفووتان بۆ دەرچووە.. بەرتان ئەدەن.. باوەڕمان بەقسەکانیان ناکرد.. ئەمان ووت رەنگە دڵمان بدەنەوە کەبۆ مردنمان ئەبەنو دوور نییە لەقاعەکانی تریشدا پێش ئەوەی بیان گوازنەوە بەدرۆ پێیان نەوتبێ کە عافواتتان بۆ دراوە..

پاش سەعاتێ بەسەر ئەو قسەیەدا کۆمـەڵێ سەیارەیان هـاوردو هاتنـە بـەردەم قاعەکـەی ئێمـە.. لەبەر ئـەوەی هـەموو جـار بەشـەو ئـەوەکانیان دەگواستەوە.. بەڵام ئێستا رۆژ بوو بۆیە دڵمان خۆش بوو ووتمان انشاء الله راستەو بەرمان ئەدەن..

خستمانیانە نـاو سـەیارەکانەوەو خستمانیانە رێو هاوردمانیـان بـەناو کەرکوك داو گەیشتینە چەمچەماڵ لایـان نـەداو بـەرەو سـلێمانی چـوون.. تاچەمچەماڵ دڵمـان خـۆش بـوو بـەڵام کـەتێ پـەڕی ئیـتر دڵمـان کەوتـە مشکیلەوە ئەی ئەگەر بەرمان ئەدەن بۆچی لێرە بەرمان نادەن.. بـەوە دڵ خۆمـان ئەدایـەوە خۆ هـەموومان خـەڵکی ئـەم ناوچەیـە نـین تـالێرە بـەرمان دەن.. بزانە بۆ کوێمان ئەبەنو لەکوێ بەرمان ئەدەن..

لەسلێمانی رەت بوو هەر نەوەستان. ئیتر تەواو ترساینو ووتمـان بـەخوا رەنگە بمان کەن بەئێران داو یان بەدیل عێراقی بمان گۆڕنەوە.. خـەریك بـوو بتۆقین.. لەو کاتانەیە کەتۆ چاوەڕێی شتێکی خۆش ئەکەیتو وادەرناچێ زیاتر ئەترسیێو ئەمانووت خۆزگە هەر لە (دوبز) بماینایەتەوە.. بەدەم ئەم

خـەیاڵو قسـەکردنانەوە ڕۆیشـتین تالەجێگەیـەك لایـان داو وتیـان ئەمـە (عەربەتـە) شـەو بـوو گەیشـتین.. دامانیـان گـرد ناومانیـان نووسـیو هـەر خێزانی وەرەقەیەکیان داپێمانو هـەر ئەو شەوە گەیاندمانیانەوە باینجـان لەنێوان سلێمانیو چەمچەماڵو لەوێ بەرەڵامانیان کرد..

شەو لەو ماڵانەی باینجان ماینەوە.. بۆ بەیانی گەڕاینەوە چەمچەماڵ.. کەهاتمەوە ناوخزمەکانم بڕوا بکە تاهەفتەیەکیش منداڵەکانم لەژوورێکی تر دانابوو کەس نەیئەوێرا بچێتە دیاریان.. خوا ئاگادارە هەرسێکیانم کێشا بەهەرسێکیان سێ کیلۆو ڕوبعێك بوون هـەر نامابوون نـە.. لـەبنیادەم ناچوون..

ئیتر لەوکاتەوە لێرە لەشۆڕش ماوینەتەوەو نەمان توانیوە بچینەوە هەواری باوو باپیرانمـان.. ئێسـتا خـۆمو هەرسێ منداڵەکـەم پێکـەوە ئـەژینو سـەروەر باوکیانو کریم محمەدو نجات محمدو عبداللە محمد سێ شوبرام بوون لەگەڵ سەروەر باوك منداڵەکاندا گیرانو تائێستا هیچ سۆراغێکیان نییەو هەر چاوەڕێین بێنەوە..

ئەویش منداڵەکەمە کەلەناو دوبز بەبەرچاوی عەسکەرەکانەوە لەدایك بوو پەڕۆو پاتاڵێك نەبوو هەر بۆی بکەم بەقنۆرکەو وادەدوانزە ساڵیشە لێرەم بەخوا کەسێ نەهات بڵێ ئەوە دەستێ جل بۆ ئەو منداڵەت وا لەئەنفالو لەناو سجن لەدایك بووە.. لەم هەموو حیزبو حکومەتو منەزەمەیە کەسێ ئەوەی نەکرد.

شەوی (لەیلەتو لقەدر) تابەیانی کەس نەخەوت هاوارمان بۆخوا ئەکرد.. ئەوان فیشقیاتیان بەخواو بەپاڕانەوە دەهات.. (ئەیانووت وائێمە سەموون و ئاوەکەتان نادەینێ باخوا لەئاسمانەوە کەبایتان بۆبنێرێتە خوارەوە)..

# سەبریە عومەر ئیسماعیل

لەدایك بووی ساڵی ١٩٣٠ کەرکوك گەڕەکی شۆڕیجە..

لەساڵی ١٩٥٣ شوم کردوە بەناصح شوکر ئیسماعیل کە ئامۆزای خۆم بوو.. لەکەرکوك ژیانێکی بەختەوەرو خۆش ئەژیاین ناسیح سەرەتا رۆژانە کرێکاری دەکردو بەو رۆژانەی کارەی سەرەتای ژیانێکمان بۆخۆمان دارشت وردە وردە بووینە خاوەن ماڵو خانووی خۆمان.. دواتر لەفەرمانگە میریەکان دامەزراو باخەوان بوو لەیەکێ لەباخچەکانی کەرکوك..



لەساڵی ١٩٧٤ لەفەرمانگە دەریان کردو عەرەبێکیان لەجێی دامەزراند.. ئیتر لەوکاتەوە ئیشی سەربەخۆی دەکرد..

مناڵەکانم چوونە بەرخوێندنو گەورەبوونو ژیانمان گەلێ خۆش بوو.. گەرچی لەساڵی ١٩٦٣ خەریك بوو (نەفیمان) بکەن بۆجنوب.. دوایی قەرارەکە گۆڕا.. نازانم حکومەتەکە گۆڕا وابزانم.. ئیتر بۆخۆمان بێ کێشەو بێ گیروگرفت دەژیاین..

چوار کوڕو سێ کچم بوو (محمەدو ئەحمەدو نەزیرەو سەمیرەو سەیرانو عبداللهو چاوەڕێ) مناڵ یەکە یەکە گەورە بوونو هیچ ناخۆشییەکمان نەبینی.. تائەم دوا دوایە..! لەگەڕەکەکانی تر عەرەبیان زۆر هێنا بوو هەندێ ژیانی کوردەکان ناخۆشی بوو بوو حکومەت پشتگیری عەرەبەکانی دەکردو ئەوانیش غەدریان زۆر ئەکرد.. مناڵەکانیان هار ئەکردە گیان مناڵی کوردەکانو قسەیشت بکردایا ببوایەتە شەڕتان حکومەت لایەنگری ئەوی ئەکردو تۆی سجن ئەکرد.. بەلاّم گەڕەك ئێمە (شۆڕیجە) هەمووی هەر کورد بوو هەمووی پشتی بەیەکەوە براببووەو کەسو کاری یەکتری بوون.. ئەو خەمەمان نەبوو..

بەلاّم ناڵێم بەم دوا دوایە ژیانمانیان قورس کردبوو ئاویان بڕی بوو.. زوو زوو ئەهاتنو سەیری گەڕەکەکەیان ئەکرد خەتیان ئەکێشاو ئەبرد.. ئەیانووت هەمووی ئەڕوخێنین.. جارێك ئەیانووت ئەیکەنە (مەلعەب) جارێك ئەیانووت ئەیکەنە باخچە.. ئاخرییەکەی زۆریان لێڕوخانو جادەی دووسایدیان بەناو گەڕەکەکەدا بردو ماڵی کۆمەڵێ خەڵکیان بەو شێوەیە کاول کرد..

تاشەڕی عێراقو ئێران هەڵنەگیرسابوو باشتر بووین کەئەو شەڕە بوو ئیتر ئەکەوتنە خەڵك گرتنو ماڵاّن ئەگەڕان بەبیانووی گەڕان بەدوای سەربازی فیراردا خەڵکی تریشیان ئەگرد.. گەنج ژیانی لێشێوا بوو شەوو ڕۆژ (حەملە)یان ئەکرد.. یەك دووجاریش مناڵەکانم بەر دەکەوتن لەخوتو خۆڕای ماوەیەك سجنیان ئەکرد.. بەو شێوەیە ترسو دڵەراوکێیان ئەخستە دڵمانەوە.. گەر لەهێرشێکدا دژبە ئێران تێك بشکایانو جەنازە زۆر بهاتایەتەوە.. داخی دڵی خۆیان بەخەڵکی شارەکان دەرئەبڕی.. یان ئەگەر بچونایەتە سەر دێیەك لەدێهاتەکانی کوردستانو پەلاماری خەڵکەکەیان بدایا، کەپێشمەرگە بەفریای

خەڵکەکە دەکەوتن و کۆمەڵێ سەربازو جاشیان ئەکوشت.. ئەگەڕانەوە ئەکەوتنە ناو گەڕەکەکان و گەنجی قوڕبەسەریان ئەگردو لێیان ئەدا..

(محمد) کوڕم بەرگەی ئەو هەموو سوکایەتی و ئازاردانەی نەگردو ڕۆیشت بۆ گوندە ئازادەکان، ئەوانەی کەحکومەت دەستی پێی نەدەگەیشت.. زۆر گەنجی تریش لەشارەکانەوە لەناچاریدا هەڵدەهاتن و ئەچوونە گوندەکان.. (محمد) لەدێیەکاندا بووە مامۆستای شۆڕش و وانەی بەمناڵانی لادێ ئەوتەوە.. زۆرم پێخۆش بووکەئەوکارەی دەکرد بەخوا بەقەدەر هەموو دنیا دڵم پێخۆش بوو.. مناڵی لادێکان زۆر غەدر لێکراو بوون گوناحیان چی‌بوو حکومەت قوتابخانەی بۆنەدەکردنەوە.. بەڵام شۆڕش ئەوئیشەی کردو سودی لەو گەنجانە وەرگرد کەلەشارەکانەوە لەترسی گرتن و کوشتن هەڵهاتبوون بۆ گوندەکان.. لەوێ ئەوەی شارەزای لەتەندروستیدا هەبوایا ئەیکرد بەدکتۆری شۆڕش لەدێهاتەکان و ئەوەی خوێنەوارێکی باش بوایا ئەیکرد بەمامۆستای شۆڕش.. (محمد کوڕم) بوو بەمامۆستای شۆڕش..

زوو زوو ئەچووم سەرم لێ‌ی ئەداو پارەو پێداویستیم بۆی ئەبردو بۆخۆیشم چەند ڕۆژێك لەلای دەمامەوە.. ئێستاش ئەو ڕۆژە خۆشانەم لەیادە کەلەکەرکوکەوە ئەچووم بۆمەملەحەو محمدوخەڵکی ئاوای ئەهاتنە پیرمەوە ئەیانووت دایکی مامۆستا هاتووە.. هەستم ئەکردکە کوڕەکەمیان زۆر خۆش ئەوێ چونکە بەهۆی خۆشەویستی ئەوەوە ڕێزی منیشیان زۆر ئەگردو حەزیان ئەکرد هەر لەگەڵیانداو لەدێیەکانیان بژیم..

ئەها ئەو ساڵەی مفەوەزاتەکە بوو، ترس و دڵەراوکێ کەم بوو بووەوە.. خەڵك بەئازادی هاتوو چۆی ئەکرد.. ئەو ساڵە ژنمان بۆمحمد کوڕم هێناو ئیتر من خەمم نەما.. چونکە خۆی و خێزانەکەی پێکەوە بوون..

ئێمەیش لەکەرکوك ماینەوە.. بەڵام وردە وردە هەست ئەکەی خەریکە وەزعەکە تێك ئەچێت.. نێوان کوردوحکومەت بەرەو خراپی ئەڕۆی.. دوای ئەوە بوو مامە ریشە کوژرا ئیتر دنیاکە تێك چوو.. شەڕ دروست بووەوە.. حکومەت پەلاماری دێهاتەکانی ئەدا، بەکۆپتەر رەمی لێیان ئەکرد.. رۆژانە لەمەعەسکرەکانەوە تۆپی ئەگردە دێیەکان.. لەناو شار خەڵکی ئەگردو گەنجی رەمی ئەکرد.. ژیانمان تەواو تێك چوو.. بەردەوام لەترس و دڵەراوکێدا ئەژیاین.. هەر رۆژەی خەبەرێکی ناخۆشت ئەبیست.. رۆژێ ئەیانووت فلانە دێی سوتاندو.. ئەوەندە کەسی کوشتووە.. رێگای هاتوچۆی لەدێهاتەکان بڕیوە.. ئیتر کارەساتێکی خراپ بوو..

وەك جاران نەمان ئەتوانی هات و چۆی لادێ بکەین.. رێگا باش نەبوو.. وەزع باش نەبوو.. ماوەیەکی پێچوو خەڵکەکە ئەیانووت حکومەت حەساری خستۆتە سەر دێیەکان.. ناهێڵێ لەشارەوە هیچ شتێکیان بۆ بچێت.. ئەڵێن ژیانی لادێ گران بروە.. گرانییە. (شەکرو رۆن و چا) بەزەحمەت ئەگات پێیان.. ئیتر سەرباری وەزعی خۆمان لەناو شار ئەبوو خەفەت لەوانیش بخۆی.. هەر چەند مانگ جارێك بەترسەوەو بەشەو ئەڕۆیشتم بۆلای محمد کوڕم لە(مەملەحە).. دوای ئەو چووە (دێڕەشە).. ئەبوو بەهەر وەزعێك بێت ئازووقەیان لەشارەوە بۆبگەیەنین.. چونکە ئەوەی هەیش بوو لەدێیەکاندا زۆر بەنرخێکی گران دەست ئەکەوت.. ئێ خۆ کوڕەکەم نەمەڕداری ئەکردو نەجوتیاری.. بەچی بیکڕێت.. ئەم مامۆستای خۆبەخشی شۆڕش بوو.. ناچار ئەبوو ئەو ئەرکە دایکی رایپەڕێنێ.. لەو بەینەدا هەرهات و چۆم بوو لەنێوان (کەرکوك و دێڕەشە)دا.. کوڕەکەم ئەیووت دایە بەخوا رۆژێ ئەگیرێی ئەوەندە هات و چۆمەکە..! رۆژێ لە(دێڕەشە)وە گەڕامەوە کەرکوك سەیرم کرد حکومەت باوك منداڵەکانیان گرتووەو هاتن منیشیان گرد.. لەئەمن ئەو خەڵکەیان ئەگرد کەکوڕو کەسوکاریان

لەدێهاتەکان بوو.. ماوەیەك سجن بووین خەڵکی زۆریان بەو شێوەیە گرتبوو.. بەخوا لەناو سجنیشەوە هەر خەمی ئەوەم بوو کێ خواردن بەرێ بۆدێهاتەکان وائەوانەی جەرگەکانیان لەوێ بوو بەناو هەزار مەترسیدا ئەچووین‌و ئازوقەمان ئەبرد.. هەمووومان گیراوین ئەبێ ئازوقە لەکوێ‌و بەچی پەیدا بکەن.. گشتمانیان خستە سەیارەوەو بردمانیان لە(سورداش) بەرەڵامانیان کرد وتیان بۆ خۆتان بچن بۆناو شۆڕش‌و نابێ ئێوە لەشاردا بژین چونکە کوڕو کەس‌و کارتان لەلادێکانە.. خانووەکانیشمانیان (حیجز) کردوماڵە عەرەبیان خستە شوێنمان..

ئەو کاتەبوو (عەلی حسن مەجید) خۆی هاتبووە کەرکوك‌و کەوتبووە گیان ئەو خەڵکە..

لەسورداش گەڕاینەوە بۆچەمچەماڵ.. بەڵام باوك منالەکان هەر سجن بوو.. لەچەمچەماڵ لەماڵە خزمێکدا شوێنم بۆمناڵەکان کردەوە.. ماوەیەکی پێچوو مێردەکەیشم بەربوو.. بەڵام خانووەکەمان داگیرکراو نەمانتوانی بچینەوە بۆکەرکوك.. هەر ئێمە نەبووین خەڵکێکی زۆری تریش وەك ئێمە دەربەدەر کران..

هەروا چەند مانگێکی پێچوو ئیتر حکومەت بەهەموو شێوەیەك کەوتە وێزەی ئەو خەڵکە رەش‌و رووتەی لادێکان قواتێکی زۆری هێنابوو بۆکوردستان‌و پەلاماری ناوچەکانیدا.. ئێمە لەشار بووین مەگەر ئێمە بزانین چەنێ جەیش‌و جاشی کۆکردبۆوە.. چەنێ تۆپ‌و تەیارەی نارد..

رۆژە رەش بوو کەس بەفریای کەس نەدەکەوت.. کەس نەیئەوێرا داڵدەی کەس بدات، حکومەت ئیعدامی ئەکرد..رۆژانە لەشارەکانیش خەڵکیان ئەگرد، لەسەر رێگاوبانی دێیەکان، لەدەشت‌ودەر بەخوا رۆژوا بوو ئەو کۆپتەرە ئەڕۆیی‌و ئەهاتەوە نازانم بڵێم چەند هەر شوانی ئەکوشت...

ماڵ کورەکەم لە(دێرەشە)بوو... جەیشێکی زۆر چووبوونە ناوچەکەو لەهەموو لایەکەوە پەلاماریاندا، (بەخوا بەخوا دنیام لێبوو بووە چەرمی چۆلەکە) هاروشێت بوو بووم لەتاو جەرگەکەم.. لەتاو بوکەکەم.. لەتاو مناڵە چوارمانگەکەیان.. کورە لەتاو ئەو هەموو خەڵکەی گوندەکان.. ئەمانزانی چیان بەسەر دێنێ.. ئاگادار بووین چیبەسەر دێیەکانی قەراخو ئەوژورەدا هێنابوو بەکیمیایی لێیانیدا بوو.. ئەترسام ئەم خەڵکەی ئێمەش بەدەردی ئەوان بچن...

مانگی نیسان بوو هەروا چەند رۆژێك بوو چووبووینە نیسانەوە.. جەیشو جاشی دونیای هێنابووە چەمچەماڵ.. بەخوا هەرکیو سورچیو بادینانیشی هێنابوو.. قواتەکەی لەکێشدا نەبوو..

هەروا لەچەمچەماڵەوە بەلێشاو بەرەو سەنگاو بەرێ ئەکەوت.. خوایە گیان چیئەکەی، لەدنیایا لەبێ دەسەلاتی ناخۆشتر نییە.. تۆوەرە واسوربزانە ئەم هەموو جەیشە هاتوونو بەبەرچاوتەوە ماڵو مناڵت رەگو ریشەت دەرئەکەنو دەسەلات هیچیشت نەبێو خواخوات بێ کەخۆت نەگرن.. بەخوا ئاگر جەرگ هەڵی گرتم، ئۆقرەم لێبڕا.. کاتێ بینیم ئەو هەموو تۆپو تەیارەو دەبابەو مدەرەعەو جەیشە زۆرە بۆناوچەکە ئەچوونو منیش جەرگەکەم لەوێ بوو.. خۆم پێرانەگیراو لەگەڵ ژنێکی تردا کەئەویش هەرخەڵکی کەرکوك بوو(پوورە هەیبەت) زووتر ئەمناسیو ئەویش کورێکی لەوێ بوو، هەردووکمان چووینو خۆمان گەیاندە (دێرەشە) بۆلای مناڵەکان..

ئەوان لەبەر ئەوەی وەك ئێمە بەچاوی خۆیان هێزەکەیان نەبینی بوو ئەترسان بەڵام وەك ئێمە نەبوون کەمتر ئەترسانو ئەیانووت کورە خواگەورەیە.. تۆبڵێی حکومەت چیلەم ژنو مناڵانە بکات.. وازەلام ئاوای ئەچنە ئەو هەردەو هەڵەتانەو خۆیان ئەشارنەوە.. قابیلە جەیش بێت چی لەژنو مناڵ ئەکات (سەگ بەژن ناوەرێ)..

ئەهـ دەردی گرانم.. ئاگایان لەوە نەبوو بەکیمیایی لەژن و منالی دابوو.. ئاگایان لەوە نەبوو هەرچی ژن و منالْ دێهاتەکانی ترهەیە هەمووی گیراون و کەس نازانێ بۆکوێ براون..

دڵیان بەوە خۆش بوو (سەگ بەژن ناوەڕێ).. ئێ‌ئەم زاڵمە کەی وەك سەگ وابوو.. ئەمە زاڵم بوو زاڵم..ئاگایان لەوە نەبوو لەچەمچەماڵەوە وەك قافڵەی مێرولە سەیارە ریزکراوە بۆ گواستنەوەیان. ئاگایان لەو هەموو شۆفڵە عەسکەریە نەبوو کەحازر کرابوو خانووەکان برووخێنن بەسەریاندا..

وەزعەکەمان بۆیان باس کرد.. بەشێك لەزەلامەکان هەر قەناعەتیان وابوو کەبچنە ئەو هەردەو هەڵەتانەو نەخۆیان تەسلیم بکەن و نەبێنەوە بۆشارەکان.. من بەمل شکاوم، بەدەستی خۆم بوکەکەم و کوڕە چوار مانگەکەم بۆناو ئاگر هێنایەوە.. (محمد) کوڕم لەئاوای ئێمەی خستە ناو تەرەکتەرێکەوە تابەرەو چەمچەماڵ بکەوینەڕێ و خۆمان رزگار بکەین.. ئەویش لەودێیەدا مایەوەو وتی خوا ئەکا ئێوە رزگارتان ئەبێ من خۆم نادەم بەدەستەوە.. لەناو دێیەکە لەیەکتر دابڕاین و خواحافیزیمان لەیەکتری کرد.. تەرەکتەرەکە پڕی خەڵك بوو.. هێواش هێواش لەئاوای دەرچووین ئەو هەر لەشوێنی خۆی وەستا بوو لەدواوە تەماشای ئێمەی ئەکرد.. تائەو کاتەی تەواو ئاوای و تەرەکتەرەکە لەیەك دابڕاین و لەچاو ونبووین، ئەو هەر لەشوێن خۆی راوەستا بوو، چاوی بڕیبوە شوێنی تایەی تەرەکتەرەکە دیاربوو بۆمان ئەپاڕایەوە کەنەکەوینە بەردەستی زاڵم.. چونکە کەچووم بوکەکەم بهێنمەوەو رزگاری‌کەم.. زۆری پێ‌خۆش بوو ئەیوت دایە شەرەف گرانە.. ئەمەش زاڵمە.. هەر ناموسەکەمان تیانەچێ خۆمان هەر چۆنێبێ ئاسایی‌یە.. بۆیە زوو زوو ئەو بەیانی‌یە کەخستمانیە ڕێ ناوچەوانی کوڕەکەی ماچ ئەکردو بەمنی ئەووت دایە ئیتر ئامانەتی تۆو ئەم منالانە.. هەر

بیانگەیەنە چەمچەماڵ.. ئیتر خوا گەورەیە لەماڵە خزمێکدا داڵدەیان بدەن تابزانین دونیا چی بەسەر دێت..

کەبەرێگاوە بەرەو چەمچەماڵ ئەهاتین خەڵکی ئەو دێیانەمان ئەبینی تووشی چی سەرگەردانی‌یەك بوو بوون.. تەرەکتەرمان توش ئەبوو بەپڕخێزانەوە بەرەو قولاّی گەرمیان ئەڕۆی و.. توشمان ئەبوو بەرەو چەمچەماڵ و خێزانمان ئەبینی بەپێ کۆڵ بەکۆڵەوە یەکێ بەرەو خوارو یەکێ بەرەو ژور وەزعێك بوو هەر مەپرسە.. سەیارەی جەیش و جاشمان ئەبینی و ئەیاندا بەتەنیشتماندا و تێ‌ئەپەڕین.. کەس بەکەس نەبوو.. بەوە دڵمان خۆش بوو ئەوەتا واعەسکەری بینیمانی و دەنگیان نەکرد انشاالله هەقیان نی‌یە بەسەرمانەوە.. کەچی ئەوان بازنەیەکیان بەدەوری هەموو گەرمیاندا کێشابوو بۆکوێ ئەچووی نەت ئەتوانی لەو بازنەیە دەرباز بێت، بەهەر لایەکدا بچوایایی هەر ئەکەویتەوە ناو هەمان بازنەی سەربازی کەوەك رچەی مێرولە بەدوای یەکدا ریزیان بەستبوو کورد واتەنی (باڵندە بەنێوانیاندا تێ‌نەپەڕی)..

ئێمە هاتین و لەرێگەیش چەندین تەرەکتەرو سەیارەی پڕ لەخێزانمان تووش بوون و ئەوانیش وەك ئێمە بەرەو چەمچەماڵ ئەهاتن.. هیچ گرفتێکمان تووش نەبوو تاگەیشتینە گوندی (قەرەتا مۆر) کەئەڵقەی بازنەکە لێرە بوو.. تەماشامان کرد هەرچی خەڵك رێگای چەمچەماڵی گرتبووە بەر، هاتبووە ناو ئەمانەوەو بەریان گرتبوو.. قافڵەیەکی درێژی خەڵك و تەرەکتەرو سەیارە هەمووی بەدوای یەکەوە ریزیان بەستبوو.. خەڵکێکی زۆر پێشیان لێ‌گیرا بوو هەمویان بەقەراغ جادەکەدا لایان دابوو چواردەوریشیان عەسکەری گرتبووی..

ئێمەش وەك ئەو خەڵکەمان بەسەرهات.. هاتین و رێگە نەبوو بێین بەرەو چەمچەماڵ.. رێگەی گەڕانەوەشت نەبوو ئەهاتیتە ناو سەربازەکانەوەو دەبوو سەری خۆت کزبکەیت و لادەیتەلاوە..

عەسکەری بەناو خەڵکەکەدا ئەگەڕان.. گاڵتەیان بەخەڵکەکە ئەکرد.. (هابۆ کویَ..؟ ئەتان ویست خۆتان رزگارکەن.. حکومەت کەرویَشك بەعەرەبانە ئەگریَت.!؟) پیَمان پیَئەکەنین و خۆیان لەمناڵ توڕە ئەکردو هیوا هەبوو بەردی تیَئەگرتین.. بەکەیف خۆیان فیشقیاتیان بەخەڵکەکە ئەکرد..

سیَرۆژ بەریان بەو خەڵکە گرتبوو.. هەتا ئەبوو زیادی ئەکردو ئەوەی لەدیَهاتەکانەوە خۆی دزیبووەوە.. یان پیَش ئەوەی جەیش بچیَتە سەر دیَیەکان خۆی بەرەو شار کەوتبووە ریَ، هەمووی هەرهات و هاتنە ناو خەڵکەکەوە تاوای لیَهات بەقەدەر شاریَك لەو دەشتەی قەرەتامۆردا خڕبووەوە.. وامن لەشارەوە هاتبووم بەشویَن بووك و کوڕەزاکەمداو ئەمویست بیانبەم بۆ چەمچەماڵ.. نازانم ئەو خەڵکەی تر لەخۆیەوە بۆکویَ ملیئەنا.. کەلیَم ئەپرسین ئەیانووت بۆیە بەرەو چەمچەماڵ هاتین ووتیان عافواتەو ئەوەی خۆی بڕوات و خۆی بدات بەدەستەوە هیچی لیَناکەن.. هەرکەس لەدیَهاتەکاندا بمیَنیَتەوە حساب ئیَرانییان بۆدەکەن..! ئیَمەیش لەترسا هاتووین و دیعایەکە وابووکە تەنها سیَرۆژ عافواتە، ووتمان بازوو بچین و تاعافواتەکە ماوەو تانەبووینەتە ئیَرانی.. چووزانین ئەمە پیلانەو بەپیَی خۆمان هاتینە ناو ئاگرەکەوە..

وەك لافاو خەڵکیان هاورد.. ژن و مناڵ، پیرەپەککەوتە، کورە شەل وشیَت و کویَرەکانیشیان هاورد بوو ئەو وەزعەم بینی تەواو ئەترسام خوایە.. ئەم زاڵمە ئەیەویَ چیلەم هەموو خەڵکە بکات.. ئەم خەڵکە چیکردوە وابەو دەردەی ئەبەن.. هیچ دەسەلاَتیَکمان نەبوو تەنها قاپی خوانەبیَ. ئەتووت لەماڵەکەی خواو لەدیار مەرقەدەکەی پیَغەمبەرین.. چۆن لەتەلەفیزیۆن (مەکە)ی پیشان ئەدا (حاجییەکان) لەخوا ئەپاڕانەوە ئەو دەشتەی قەرەتامۆر وەك (مەکە) وابوو.. ئەو

هەموو خەڵکە تەنها دەرگـای پاڕانـەوەیان بەسـەردا دانـەخرابوو ئیـتر هەرچی دەرگای ژیان هەیە کلۆم کرابوو لەسەریان..!

هـەرچی خـەڵکی ئەو دێهاتانـەی ناوچـەی سـەنگاو هەیـە هـەموویان هاورد.. بڕوابکە رەنگە دووسـەد بـەس تەرەکتـەریان ریزکردبێ.. مەڕو ماڵات ئەو دێیانە هەمووی درابووە پێش‌و بـەرەو چەمچـەماڵ ئەیانبرد گشتیان تالآن کرد..

سـەیارەیەکی زۆری عەسـکەری‌و سـەیارەی مەدەنیشـیان بەسـوغرە هێنابوو هاوردیانیانە ئەو هەردەی (قەرەتامۆر)و کەوتنە بارکردن ئـەو خەڵکە بەو خوایە درۆنی‌یە ئەگەر بڵێم هەزار سەیارە ئەبوون..

جگەلـە زیلـی عەسـکەری، گلآبەیـەکی زۆریـان هێنـابوو.. سـەیارەی کۆسـتەرو قەمـەرەی نەفـەراتی خەتەکانیشـیان هـاوردبوو.. هـەر لەبەیانی‌یەوە باریان کردو لێی کەوتنە گواستنەوەی تامەغریب کۆتایی نەهات.. بەدەردێکی خراپ ئەو خەڵکەیان گواستەوە.. وەك رەشـە وڵاخ بارمانیـان کـرد لـەو سـەیارانەو لـەناو ئـەو کەل‌وپـەل‌و جـل‌و جـۆرەی ئافرەتاندا کەلە ناو تەرەکتەرەکان بوو کۆمەڵێ جلی ژنانەیان دەرهێناو بەستبویانە لێواری ئیڤای عەسکەریەکانەوە.. هـەربۆ سـوکایەتی کـردن بوو پێمان‌و تابڵێن ئەوە ناموسەکەی کوردیشمان بەتالآن برد..

کەئـەو خەڵکـەیان بـەناو ئۆردووگـای شـۆڕش‌و چەمچـەماڵدا گواسـتەوە.. خـەڵکی چەمچـەماڵ بـەو دیمەنـەو بـەو لێشـاوی خەڵکـە راپێچکراوە تەواو سەغڵەت بوون‌و مەلایەکیش لەمزگەوتەوە بانگەوازی کردبـوو کەجیـهاد بکـەن‌و رێگەـەو سـەیارانە بگـرن مەیـەڵن ئـەو ژن‌و منالآنە بەرن.. خـەڵك رژابـووە سـەرجادەو رێگـاو بانـەکانیان گرتبـوو ئاگریـان لەسـەر جادەکـان کردبـۆوەو جـامی سـەیارەکانیان ئەشـکان‌و بـەزۆری خـەڵکیان لەسـەیارە دائـەگرد.. زۆر کـەس بۆخۆیـان کەوتنـە ناوئەو لێشاوی جەمارەوەو رزگاریان بوو.. بەڵام (بارق) خۆی گەیشتە نـاو چەمچـەماڵ‌و ٣ کۆپتـەر کەوتـە سـەر ئاسمـانی چەمچـەماڵ‌و کەوتـە

رەمی کـردن لەخەڵکـە راپـەڕیووەو بەسـەماعە بانگـەوازی ئـەکرد هـەر خـێزانێك داڵـدەی یـەك کەسـی هـەڵاتوو بـدات خانووەکـەی بەسـەردا ئـەڕوخێنین.. بەمـە خەڵکەکـەیان ترسـانو کەوتنـەوە گرتنـەوەی ئـەو خەڵکـەی کەلەسـەیارەکانیش رایـان کردبـوو گـەرچی بەشـێکی زۆری رزگـاری بـوو بـەڵام زۆریشیان گرتـەوە.. ئیتر قواتێکی زۆریـان هـاوردو بەمدەرەعـەو عەسـکەریەکی زۆرو لەئاسمانیشـەوە بەکۆپتـەر کەوتنـە حیمایـەی قافڵەکـەو گەیاندمانیانـە نـاو لیواکـەی چەمچەماڵ.. لەترسـی ئـەوەی نـەوەك خـەڵکی چەمچـەماڵ پـەلاماری لیواکـە بـدەن هەرئـەو ئێوارەیـە کەوتنـە گواسـتنەوەی خەڵکەکـە.. سـەیارەیەکی زۆریـان لەکەرکوکەوە هێنابوو بۆگواستنەوەمان.. هەمووی کۆستەرو منشـەئەی درێژ درێژبوو من بوکەکەم خوێندەوارێکـی بـاش بـوو کەلـەناو لیواکـەی چەمچەماڵ قافڵەی (منشـەئە)کـان هاتنـە ژورەوە رەقـەمی سـەیارەکانی خوێندەوەو کردیە هاتو هاوار لەناو خەڵکەکەداو ووتی ئەو سەیارانە عێراقی نینو بەوخوایـە ئەمانبـەن بۆئـەو وڵاتانـەی عارەبسـان.. وتـی سەیارەکان رەقەمەکانیان نوسراوە (عمان)...

ئێمە بەرئەو وەجبەی سەیارەی کۆستەرانە کەوتین بەڵام لەرێگـەیش یـەك دوو وەجبـەیتر دای بەتـەکمانداو بووکەکـەم بـەوردی تەماشـایانی ئەکرد، وتـی ئامۆژن بەوخوایە ئـەوەتا هـەموویان رەقـەمی (عومانیـان) پێوەیە.. هیچیان عێراقی نین.. سەیارەکانیش بەرەنگو شێوەیش لـەو منشەئانەیتر جیاواز بوون.. من گەرچی خوێنەوار نەبووم بەڵام چونکە هـەرماڵمان لەشـاربوو بـوو سـەیارەی جـۆراو جـۆرم بینیبـوو، بـەڵام بوکەکەم راستی دەکرد ئەم(منشەئانە) لە(منشەئەی عێراقی ناچوون).. جارنـەجارێکیش کـەلایتی سـەیارەکان بـەجوانی روناکیـان ئـەکردەوە، وەك ئـەوەی کەئێمـە هـەموومان خوێنـەوار بـینو بووکەکـەم بیـەوێ بەئێمـەیش بڵـێ ئەوەتا بیخوێننـەوە.. ئـەیکردە هەراهـەرا ئـەوەتا جـوان سەیریکەن ئەوەتا نوسراوە (عومان)..

هەرشەو گەیاندمانیانە (تۆبزاوا).. تۆبزاوا چی تۆبزاوا دارهەڵدەی بەزەوی ناکەوت (رۆژە لحەشرێك بوو مەگەر ئەو خوایە بۆخۆی بزانیّ).. لەبەر لایتی سەیارە بوو بووە چراخان.. بەجارێك دەسەیارە خۆی کرد بەژورداو دەسەیارە ئەهاتە دەشتەوە.. مەعەسکەرێکی ئەوەندە گەورە بوو جێگای دووئەوەندەی تریشی تیا ئەبووەوە.. ئەو هەموو سەیارەیە بەریز ئەهاتنە ناو گۆڕەپانی سەربازگەکە.. نەفەرەکانیان دائەگردو ئەگەڕانەوە.. من هەموو تەمەنم لەشاردا بردبووەسەر بەڵام بەهەموو تەمەنم (قەرەباڵەغی) وام نەبینی بوو.. باوەڕناکەم هیچ شارێك ئەوەندە مەخلوقی تیابیّ..!!

بەوشەوە ئەو خەڵکەیان لەدەشوێنەوە ریزکردبوو ناویان ئەنووسی و جیایانیان ئەکردەوە.. ئەوەی گەنجبوو نەیان ئەهێشت بێنە نزیك خەڵکەکەی‌ترو لەدور ئێمە ئەوانیان ریزکردبوو.. بوکەکەم لەبەر ئەوەی سیّ‌چوار ساڵ بوو لەو دێیانە بوو خەڵکی ئەناسی.. لەناو گەنجەکاندا ناسیاوی ئەبینی و بەمنی ئەووت ئامۆژن ئەها ئەوە فلاّن کەسە.. خەڵکی فلاّن گوندە..

ئەو شەوە تابەیانی هەر ناویان نووسی و گەنجیان جیاکردەوەو لەدور دایانیان نابوو، دەمەو بەیان کۆمەڵیّ سەیارەیان هێناو لای گەنجەکان راوەستان..

گەنجەکانیان ریزکردبوو تەنها کراس‌و شەرواڵ یان، بیجامەیەکیان لەپێیاندا هێشتەوە، ئیتر هەموو جلەکانیانیان لەبەر داکەن‌و بەپیشتوێن‌و جامانەکانی خۆیان دەست‌و چاویان دەبەستەوەو ئەیانیان خستە نێو ئەو سەیارانەوە بەخوا مێرد منداڵ (دەدوانزە) ساڵەشی تیابوو.. ئیتر هەرئەو دیمەنە بوو کەس نەیزانی بۆکوێ بران..

ئێمەشیان خستەناو قاعەوە کەکۆمەڵێ قاعەی زۆر درێژ درێژی لێبوو ئەتووت هەر بۆئەوە دروست کرابوو ئەم کوردەی تیا سجن بکەن..

سێ شەو و سێ‌رۆژ ئێمەیان لەوقاعانە هێشتەوە.. زۆر رەزالەتمان بینی.. رۆژی یەك جار کەمێك خواردنیان ئەدا پێمان‌و یەك جار رێگایان ئەدا بۆسەرئاو بچینە دەرەوە.. ئەوەندەشیان تێ‌ئەپاند بوو هەرخەریك بوو لەناو قاعەکەدا بتاسێین رێگە نەبوو پێت درێژبکەی، خێرا خێرا خەڵکی تریان ئەهێناو ئەیانکردە ناو قاعەکانەوە وەك جەنازە هەموو بەسەر یەکدا کەوتبووین..

لەشەوی سێیەمدا هاتن کۆمەڵێ عەسکەری رەش رەشی‌لچ قەوی سوێندتان لەسەرم نی‌یە لەئۆمەت زەمانە ناچوون، کەوتنە ناومان هەرچی منداڵ هەیە بردیان لەباوەش ژنەکاندا ئەیانرفان.. وای کارەساتێ ئەوشەوە رووی‌دا قەت لەبیرم ناچێتەوە..

منـاڵ هـەر زراوی چـوو ئێمـەیش هـەر هاروشـێت بووین لەتاوا.. قـەت بـووە کۆرپەلـە باوەشـی دایکـیداو لـەناو زینـدانـدا لەدایکـەی جیابکرێتـەوە.. ئێمـە چونکـە بـەچاو خۆمـان گەنجـەکانمان بینـی روتیانیان کردەوەو دەستو چاویان بەستەوەو بردیانیان، وتمان بەخوا ئەم منالأنـەیش کەگشتی ئـەتووت پەپولـەی خـوان بەدەسـت جوندیـە عەرەبەکانـەوە هەڵدەلـەرزین تـازە بـەدەردی گەنجـەکان ئەیانبەنو دورنییە بیان خەنە ناو ئاوەوەو ببن بەخۆراکی ماسی.. کـورە هەرگێڕانەوەشـی زەحمەتـە تـۆ وەرە جەرگەکـەت لەباوەشـتدا بڕفێننو شێت مەبە..!!

ئەو شەوە ئاهوو نزولەی ژنو منالْ گەیشتە کەشکەلانی فەلەك.. پاڕانـەوەو کڕوزانـەوەمان گەیشـتە قـاپی خـواو نـایی لـەدڵی ئـەو زاڵمانـەو دوای چەند سـەعاتێك منالْـەکانیان هێنایـەوە.. ئـەتووت بەرخی ژێر دەستی قەسابن واهەڵدەلەرزین.. سەراپای لەشیان بوو بووە ترس، ئەوەندەیان زیڕاندبوو قسەیان بۆنەئەکرا.. چاویان بوو بـووە گۆمـی خوێـن.. زۆر منـاڵ لەوشـەوەوە توشـی (فـیْ)بـوو، زۆریشـیان تووشـی نەخۆشـی درێژخایـەن بـوونو کۆمەڵێکیشـیان هەر دوای ئەو کاتەو لەناو زیندانەکـــــانی (دوبز)دا مـــــردن...

سەعات پێنجی بەیانی جارێکیتر دەرکی قاعەکەیان کردەوەو خۆیان کردەوە بەژوردا.. هەرچی منداڵ هەبوو بەیەکجار کردیانەوە زیڕەو هاوار وایان ئەزانی دێنو ئەمجارەش ئەیانبەن.. منداڵ وەك جۆلەکە هەڵدەلەرزینو خۆیان ئەنووسان پێمانەوە.. بەمناڵەکان بوایا زگمان هەڵدڕنو بچنە ناو زگمانەوە خۆیان بشارنەوە.. ئێمە هەموو وەك یەك رەزیل بووینو کەسمان دەسەڵاتمان نەبوو.. ئێمەیش لەمناڵەکان زیاتر ئەترساین، بەڵام چیئەکەی لەبەرامبەر زاڵمێکی وادا چیت پێئەکرێت..!

هاتنو بەناوماندا کەوتنە گەڕان.. قاعەکەیش ئەوەندەی خەڵك تیابوو جاروابوو پێ یان ئەخستە سەر لەشمانو بەسەر دەستو پێماندا ئەرۆیشتن، نوکە شەقیان تێمان هەڵئەدا.. ئەمجارە لەجیاتی منداڵ گەورەکانیان جیاکردەوە ئەوەی کەتەماشایان دەکردو بەپیر ئەهاتەبەر چاویان ناویان ئەنووسی.. تەنها پیرەژنو پیرەمێرد.. دوای ناونوس کر،نەکەمان کەوتنە ناو خوێندنەوەی ئەوانەی کەناویان نووسی بوو.. لەقاعەکانی تریشدا ئەمەیان کردبوو چونکە کەهاوردمانیانە دەرەوە لەبەردەم هەرقاعەیەك کۆمەڵێ پیرو پەککەوتەی لێبوو.. من لەوێ لەبووکەکەمو کوڕەزاکەم دابڕام.. لەوێ هەستم بەقسەکەی کوڕەکەم دەکرد کەسواری تەرەکتەرە بووین ئەیووت دایە گیان ئامانەتی تۆو مناڵەکانم.. دایە کوێربێ رۆڵە والەبێ دەسەڵاترین کاتدا ئامانەتی یەکەتیان لێم سەند.. هیچم لەدەست نەهات تەنها پاڕانەوە نەبێ رەنگە هەزارجار ئەو قسەیەی کوڕەکەمو دیمەنەکەم هاتبێتەوە بەرچاوو منیش هەزارجار وتومە (ئامانەتی بەخوابن).. قاژەی جەرگم ئەهات وای چیمان بەسەرهات وایهەموو ئەو پیرەژنو پیرەمێردانەی تریش وەك من لەئازیزەکانیان جیاکرانەوە.. چەند رەحمەتە تۆلە شێنەیی خۆشەویستێکت لێت دابڕێ خەریکە ئاگرت تێبەربێ بۆی.. دەوەرە خۆت رەزیلو بێدەسەلاتو لەناو زیندانیش

والەیەکتریت جیابکەنەوە، نازانم چۆن بەرگەی ئەو هەموو ئازارو سزایەمان ئەگرد.. کۆمەڵێ سەیارەیان هێنا وەك (ئیسعاف) بچوك بوون (سەرداپۆشراو) بون (موقەپەت) جامەکانیان تاریك بوو رەنگی سەیارەکان هەندێکی سەوز بوو هەندێکی سپی.. یەك دەرگایەکی هەبوو کەسوار بووین پێش ئەوەی دەرگاکەمان لەسەر پێوەدەن تەماشای ناوسەیارەکەم کرد رووناك بوو وابزانم (٢٤) بیستو چوار کورسی هەبوو.. یەك عەسکەرێکیش لەناو دەرگاکەی بەتفەنگەوە دانیشتبوو..

پێش ئەوەی سوار بین تەماشای سەیارەکانم زۆرکرد رەنگە (٥٠)پەنجا سەیارە ببوایا.. بەریز خستمانیانە رێو بەو بەری بەیانی‌یە، بەرِێ کەوتن.. هەر رۆیی‌و هەررێگا نەبڕایەوە، هەر رۆیی‌و هەرتەواو نەبوو، هەر تینومان بوو نەگەیشتین.. ئیٚوا ئێمە بێ دەسەڵات بووین‌و سجن بووین نازانم ئەو عەسکەرە ملقەوی‌یە چۆن رازی بوو وەك ئێمە گەرمای بێت‌و ئەویش خەریك بوو بتاسێت، وەك ئەوە وابوو ئەویش هەر سجن بێت..

ناوسەیارەکە زۆر گەرم بوو زۆر تەنگە نەفەس بووین‌و زۆر تینومان بوو.. ئەو عەسکەرە زاڵمەیش زەمزەمیەك ئاوی پێبوو بەقەد نیوتاقەکەیەوە بوو جار نەجارێ دەری ئەکردو وەك ئەوەی بیەوێت (کامی کامیمان) پێبکات قومێکی لێئەداو ئەیخستەوە ناو کەوڵەکەی.. خەریك بوو کوێر بین لەتینوا.. بەزەی پێماندا ناهاتەوە.. زۆرلێی پاڕاینەوە هەریەکی سەرقەباغێ مەتارەکەی خۆی ئاومان بداتێ.. دیار بوو رەحم خوا لەدڵی‌دا نەبوو.. هەر گوێشی لێمان ناگرد.. نەهەقیشی نەبوو ئێمە بیستو چوار کەسی هیلاك‌و ماندو بەچی ئاومان بداتێ..

بەهەر هیلاکەتێك بوو ئیدارەمان کردو گەیشتینە شوێنی سەیارەکان راوەستان، دامانیان بەزاند تۆزێکی مابوو خۆرئاوا بێ.. دەشتێك بوو هەمووی (لم) تاچاو بڕیکات بیابان بوو.. لەبەردەم قەڵایەکدا وەستا

بووین قەڵایەکی زۆر گەورە بوو دیوارەکانی بەرز بیناکە خڕبوو دیوارەکەی تۆزی (زەردباو بوو).. یەك دەرگایەکی گەورەی هەبوو وەك مەڕومالآت دامانیانە پێش بۆناو قەڵاکە.. ئەو عەسکەریانەی لەدەوری قەڵاکە بوون و ئێمەیان داگردو بەرەو ناوقەڵاکە بردمانیان گشتیان کلاوەکانیان (سور)بوو.. لەدەرگاکە بردمانیانە ژورەوە.. بینایەکی گەلێ گەورە بوو.. من لەشاریش ژیا بووم و بەخوا زۆریش گەڕابووم بەلام بینای واگەورەم نەبینی بوو.. هەمووی غورفەی درێژ درێژو سێ‌قات لەسەریەك دروستکرابوو.. حەوشەیەکی گەورەی هەبوو لەم بەرو ئەوبەرو لەهەر چوارلاوە رویان کردبووە یەك وەك ئەوە وابوو لەناو (مەنجەڵێك) دابیت و تەنها دیوارەکان و ئاسمانت لێوە دیاربوو.. ئاسمانەکەیشی لێڵ و ناشرین بوو لەئاسمانی خۆمان ناچوو..

لەوێش کەوتنە ناونوس کردنمان و هەرغورفەی رەنگە بڵێم دووسەد کەسیان تێ‌کردبوو جێگامان زۆر سەغڵەت بوو هەموو لەش لەبان لەش کەوتبووینە سەریەکدا.. هیلاکی ئاو بووین و لەبەیانی‌یەوە ئاومان نەخواردبوو.. ئاوێکیان داپێمان (تاڵ تاڵ ئەتووت ژەهرە، قەت بڕواناکەم ئاوی خواوا تاڵ بووبێت لەوە ئەچوو دەرمانیان تێ‌کردبێ) ئەو ئاوە هەرکوشتمانی ناوزگمانی هێنایە خوارەوە..

هەندێ سەموون رەقیان داپێمان ئەتووت بەردە نازانم بەچی وارەقیان کردبۆوە.. برسی و هیلاك بووین لەئاوەکەدا کەمێك خوسانمان ئەتووت (حەلوا) ئەخۆین..

تەماشامان کرد لەغورفەکانی تردا خەڵکی تریشی لێیە.. لەغورفەکانی ئەو بەریشەوە دیاربوو..

ئیتر لەبەیانی‌یەوە هەر وەجبەیان هێناو تێیان کرد.. تاوای لێهات غورفەکان هەرسێ قاتەکەی پڕبوو بوون و پڕحەوشەکەشیان کردبوو.. بیناکە هەمووی ژێر زەویشی هەبوو بەلام دەرگای لەئێمەوە دیار نەبوو تابزانین چی‌تیایە..

من عەرەبی‌یەکی باشم ئەزانی لەگەڵ عەسکەری‌یەکان قسەم ئەکرد.. یەکەم جار پرسیاری ئەوەم کرد ئێرە کوێیە؟ وتیان ئەمە یەولە ناحیەی (سەلمان)یش قەلایەکی وەك ئەمەی لێیە ئەویش پڕیەتی لەهاوزمانەکانتان‌و (چەنە قەلایەکی تریش هەمووی پڕکراون) دوای ئەوەندە قسەم لەگەڵیاندا کردبوو وەك ئاشنای یەکترمان لێهاتبوو هەموو پرسیارێکم لێیان ئەکرد.. پرسیار ئەوەیشم کرد ئەم قەلایە کەی‌دروست کراوەو بۆچی کراوە..

ئەوانیش باش نەیان ئەزانی.. قەلاکە زۆر کۆن بوو (ئەیانووت هی سەردەمی مەلیکە)و لەکاتی مەلیکدا بۆئەوە دروست کراوە هەرکەسێك (نەفی) بکرایا، ناردویانە بۆئەم قەلایەو ئەوکاتەیش هەر زیندان بووە..

هەتا ئەهات زیاتر خەڵکی تریان ئەهێناو رۆژ لەدوای رۆژ وەزعمان خراپتر ئەبوو.. سەرەتا خەڵکی کەمتر لێبوو ئاوەکە بەشمانی ئەکردو بەوسەمونە رەقەی رۆژانە ئەیان داپێمان ئیدارەمان ئەکرد.. بەلام دوای خەڵکەکە ئەوەندە زۆر بوو بوو ئەو دووتەنکەرە ئاوەی رۆژانە ئەیان هێنا بەشمانی نەئەکردو تەواو کەوتبوینە هیلاکەتەوە بۆئاو.. تادەهات دونیایش بەرەو گەرماتر ئەڕۆی.. گەرمای ئەو (نوگرە)یە مەگەر جەهەنەم وابێ، قەت گەرمای وام نەبینی‌وە من بەهۆی ئەوەوە کەعەرەبیم ئەزانی جاری وابوو ئەگەڕام بەناو قاعەکانداو یان ئەچووم بۆلای حەرەسەکان.. هەرچەندە زۆر جاریش خۆیان لێم تورە ئەکردو جنێویشیان ئەدا بەلام هەر ئۆقرەم نەبوو لەژوورێکدا، ئەگەڕام..

لەقاعەکانی ئەوبەرەوەی قەلاکە لەدوو ژووریاندا خەڵکی (تووکن‌و عزیز قادر) بەجیا لەژورەوە بوون‌و وەزعیان لەهەموو ئەو قەلایە خراپتربوو.. ئەیانووت ئەمانە (حیجزی تایبەتن) ئیتر نازانم بۆ..!؟ بەلام ئەوەندە ئەزانم کەگوزەرانی ئەوان زۆر لەئێمە خراپتر بوو.. بەو حاڵەی خۆمانەوە بەزەیمان بەواندا ئەهاتەوە گەلێ رەزیل بوون..!!

قەڵاکە ئەوەندە گەورە بوو ئەم بەرو ئەوبەری بەچارەکە سەعاتێ ئەوجا ئەگەیشتیتە ئەوبەری..! ناو حەوشەکەیشی هەندێکی چەمەنتۆ بوو ساحەی تۆپێن و هەندێ عەموودیشی لێ چەقێندرابوو نازانم چیبوون.. بەلاّم بەریز دانرابوون..! جاریوا هەبوو (ئەو حەجاجە زاڵمە ئەختیاری ئەبردو ئەیبەستە ئەو عەموودانەوە، لەبەر ئەو گەرمایە هەرهەڵ ئەقرچان).

رەزالەتمان گەلێ بینی گەلێ..! رۆژێ بەزابتێکم ووت ئاخر خوا قبوڵ ناکات ئێوە بۆوا برسیمان ئەکەن، بۆواتینوومان ئەکەن..!؟ بەگاڵتە جاڕیو پێکەنینەوە پێمیووت (ئێوەمان بۆسەیران نەهێناوە بۆئێرە ئێوەمان هێناوە لێرە بەعەزابەوە بتان کوژین).. بەڕاستی بەعەزابەوە ئێمەیان کوشت.. زۆری لەتینوانداو لەبرسا مردن.. دوو پیاو کەهەردووکیان برابوون ناویان (مجید حەمەکە و حەمید حەمەکە)بوو خەڵکی گوندی (ترکە شکان) بوون.. هەردوکیان لەتاو ئەو وەزعە لەناو قەلاّی (نوگرە) شێت بوون و دواتر ئاویان نادا پێ یان هەردوکیان کوێر بوون و ئەوجا مردن.. بەخوا سێ منالّ هەشت نۆ سالاّنمان بەلاوە بوو تووشی نەخۆشی (سیرۆژە)بوون، لالّ بوون و دواتریش هەرسێکیان شێت بوون.. کورە پەت پەتییەك بەسەر ئێمەدا هات لەدنیادا نەبووە.. هیچ زاڵمێك بەرامبەر بەدوژمنی خۆیشی ئەوەی نەکردوە.. نازانم چی ویژدانێك بوو ئەو عەسکەرانەی حەرەسمان بوون نازانم ئێمەیان بەشەوەس نازانییان خۆیان هیچ هەستو سۆزێکیان نەمابوو وارەفتاری بەوشێوەیە دڕندانەیەیان ئەکرد.. رۆژێك جوندی یەك هات دووعەلاگە (نیسك و نۆك)ی پێبوو بەناوماندا گێڕی ئەداو ئەیویست مەراقمان پێبکات.. ئەو خەڵکە ئەوەندە دەمێك بوو لەسەمونی رەق زیاتر هیچی نەدیبوو هەر هاروشێت بوون بۆی.. ئەو خەڵکە واتەپمان دایە سەرجوندیەکەدا هەرخەریك بوو لەژێر پێماندا بخنکێ.. عەلاگە (نیسك و نۆکەکەی) هەڵدایە ئاسماندا هەمووی رژایە سەرزەوییەکە..

